مۆسادی ناو عەرەب
نووسینی: صلاح الأمام
وەرگێرانی: شێرزاد هەیری
پیتچنین: نووسەر
دیزاینی بەرگ: موعین
دیزاینی ناوەوە: خەلیل هیدایت مام شێخ
لەبڵاوکراوەکانی کتێبخانەی ئاوێر لەهەولێر ژمارە 36
نرخ 5000 دینار
شوێنی چاپ: چاپخانەی رۆژهەڵات هەولێر
لەبەرێوەبەرایەتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردن 285 ساڵی 2009 پێدراوە.

# ناوەڕۆک

# پێناسە:

ئەو کتێبە کۆششێکە بۆ ناسینی جیهانی جاسووسیەت،
ئەو جیهانە ی لەهەموو کە س دوورو شاراوە و نادیارە و لەهەموو کەسێکیش نزیکە،
سێکس و پارەو دڵسۆزی و لاوازی ئینتیماو دەسەڵاتدارەکان، فاکتەری دانانە وەو بەرنامەرێژی ئە و تۆڕانەبوون.
بوونی ئەو بابەتەم بەگرینگ و بەپێویست زانی،
تا وڵاتپارێزبین و گومانیشمان هەبێت،
دڵسۆزبین و ترسیشمان گەورەبێت،
تا وڵاتەکەمان گەشەدارو ئارام و خاوێن بێت.

شێرزاد هەینی
ستۆکهۆلم
ینایری 2009

# جاڵجالۆکە بەغدا گەمارۆ دەدات.

## یاقوب نهێنییەکانی کۆگای ژمارە 3ی سەربازی ئاشکرا دەکات!

لەرۆژی کودە تایە سەربازییەکی 14ی گەلاوێژی ساڵی 1958ەوە دەسەڵات و سەرکردایەتی عێراق تا رۆژی رووداونی ئەو چالاکییە لەدەست دەستەیەکی ئەفسەری کودەتاچی دابووە، بەردەوام سوپاکە کودەتای کردەوەو سەرکردایەتی گۆڕیوەو ئەفسەری نوێ هاتوونەتە سەرکارو سەرحوکم، ئەوانەش هەرگیز پابەندی بەرنامەو ستراتیژییەکی روون و دیارنەدەبوون، لەبەرئەوەی ئەمریکا لە ساڵی 1949ەوە بەهەبوونی سەربازی خۆی بە رژەوەندییەکانی لە کەنداوی عەرەبی پاراستووە، بۆیە ش ئە و گۆڕان و کودە تایە سەربازیانە ئەمریکای نیگەران دەکرد چونکە هێزەکانی بەشێکیش بوون لە بنکەیەکی گەورەی ئەستپلەکانی لەزەریای هیندی، لەودەمانەش بوونی سەربازی بریتانی بەرەو لاوازی دەچوو، ئەمریکا هەستی بەوەدەکرد بوونی سەربازی سۆڤیەتیش لە زەریای ئارام بە رەو زۆربوون و هێزدە چێت، دە بووایە ئەمریکا پارسەنگەکە بەهێز بکاتەوە، چونکە نیوەی ئەو پترۆڵەی لە خۆرئاوای ئەوروپا بەکاردێت سەرچاوەکەی ناوچەی کەنداوی عەرەبییە، هێزەکانی ئەمریکیش لە ناوچەکانی باشووری خۆرهەڵاتی ئاسیاو هێزەکانی پەیمانی ئەتلەسییش سوتەمەنیەکانیان لە پترۆڵی کەنداوەوە بۆ دابیندەکرا. هەردوو زلهێزەکە بۆ زۆرترین پێگەو دەسەڵات لەناوچەکە کەوتنە ململانێیەکی دژوار، بەئاراستەی سەربازی و سیاسی کەوتنەکار، سۆڤیەتییەکان وڵاتی عێراقیان تەژی چەکی پێشکەوتووکردبوو، چەندین پسپۆرو شارەزای چەکە سۆڤیەتییەکان لەشێوەی نمایشی دووردرێژ لەوڵاتەکە دەخولانەوە، غواسەکانیان لەناوچەکە بەتایبەتی لەبەنداوەکانی (آم قصر)ی خوارووی عێراقی تەنیشت کوێت بوون و جەولەیان هەبوو، دەریاوانی سۆڤیەتی بووە جێگەی گومان و مەترسی لەناوچەکە، ئیسرائیل لەوناوەدا بەوردی چاودێری رەوشەکەی دەکرد، لەکۆکردنەوەی

زۆری چە کە سۆڤیەتیەکان لە ناوچەکە ترسی لێنیشتبوو . لەودەمانەدا ئێران لە سەردەمی شاهەنشای ئێران دە رگای وڵاتە کەی و سنوورە کانی بۆ بە کرێگیراوانی ئیسرائیلی خستبووە سەرپشت، ئەوانە ئازادانە لەناو عێراق دە سووڕانەوەو چالاکانە بەرنامەکانیان جێبەجێ دە کردو پلانیان دژ بە وڵاتەکە دەچنی.

لەرۆژێکی مانگی ینایری ساڵی 1966 لەیەکێک لە خاڵە سنوورەکانی پە ڕینەوەی سنووری عێراقی ـ ئێر انی ئە فسەرێکی عێراقی وە ک پشکنەرێکی ورد لە ئاکاری مەوانێکی سەرسنوورەکەیان رادە مینێت، هە ستدەکات کابرا شپرزە یە، کە پرسی پسولەی سە فەری لێدەکات دەزانی کابرا ئاسایی نییە، بۆیە زۆرتر لەکابرا بەگومان دەبێت و باشتر دەیپشکنێت، کە زۆر لە جانتاکانی دەکۆڵێتەوە، لەناکاو گیرفانی شاراوەو لاچەپ لەناو جانتاکەی دەدۆزێتەوە، لەناو گیرفانەکانیدا چەند نەخشەی سەربازی و راپۆرتی نهێنی و زانیاری سەربازی گرینگی پەیوەست بەلایەنی سەربازی و ئابووری دە دۆزێتەوە، بەوەیان کەسە بەکرێگیراوەکە یەکسەر دادەوەشێت، زوو بە زمانی فارسی هاواری لێهەڵدەستێت و دەڵێت:

من هیچ نیم، من تە نها پە یامبەرێکم، من تە نها ئەوانەم هە ڵگرتووەو دە یانگەینمە دەستی دووەم، من نەمزانیوە ئەو جانتایە ئەو شتانەی تێدا شاردراوەتەوە، من نەمزانیوە!

لەبارەگای موخابەراتی عێراقی و لە کاتی لێکۆڵینەوەکاندا ئینکاری کردبوو کەوا کەسی دووەم بناسێت، ئەو وتبووی:

(من هەموو جارێ ئە و کە سەم لە گۆشەیەکی شە قامی (الرشید) دیوەو هە ر لە وێ پەیامەکەم پێگەیاندووە، بۆیەش من ئەو ناناسم و زانیاری تەواوی لەسەر ئەو کەسە نییەو شوێن و ناوەکەیان پێنەوتووم.!).

دیارە کەوا موخابە رات بڕوایان بە و قسە یەی ئە و نە کردووە، بۆیە سووربوون لەسەرئەوەی ئە شکەنجەی بدە ن، ئەوان دەتوانن بە شێوەی کاری تایبە تی خۆیان مامەلەی لەگەڵدا بکە ن، تا وایان لە کابرا کردبوو دان بە راستی پلانە کەی دابنێت، کە وا ئە و بۆ بەرژەوەندی موخابەراتی ئیسرائیلی (مۆساد) کاریکردووە، کاری ئە و ئەوەیە لەناو عێراقدا چاوی بە جاسووسە ئیسرائیلیەکان بکە وێت، بە ردەوام بە ناو ئێراندا ئە و کارە ی کردووە، نۆ جار بۆ گەیاندنی بەڵگەنامەو پێویستیەکان بە رێگای ئێرانەوە ئەوانەی گە یاندووتە ناو بە غدا، بەڵام تا ئەو رۆژەی لە ناو زیندانە تاکە کەسییەکەدا پێیان راگە یاند کەوا بە یانی ئیعدام دە کرێت، ناوی بەکرێگیراوەکەی نەدابووە بەرپرسانی ئەمنی عێراقی، بەڵام پاش ئە و هە ڕەشەیە، گیراوە کە کە ناوی (فجر عبدالله)ی لەخۆی نابوو وتبووی:

(من تەنها ناوی یەکەمی ئەو کەسە دەزانم کە من پەیوەندییم پێوەی هەیە، دەزانم پیاوەکە ناوی یعقوبە، جارێکیان لە گەڵ ئەو پیاوە لەچایخانەیەک لە شەقامی هارون الرشید دیمانەمان بووە، لەوێ گوێم لێبوو کابرایەک هاتەلامان و بەو ناوە بانگی ئەوی کردو زەرفێکی دایە دەست، بۆیەش دەزانم پیاوەکە ناوی یعقوبە.!).

کە ناوەکەی بە بەرپرسانی زیندانەکە وتبوو، دەرگایان لەسەرکردیتەوەو گواستراوەتەوە ژوورێکی باشترو مامەلەی باشیان لەگەڵدا کردبوو، خواردنی باشیان لەپێش دانابوو و بە رەوشتی بەرز رفتاریان لەگەڵدا کردبوو، هەمووش بۆ ئەوەبوو تا ئەو یارمەتیان بدات، کە سەکەیان بۆ دەستنیشان بکات، ئەوانیش بەهاوکاری دەزگاکانی تۆماری کەسایەتی هەرچی ناو یعقوب لەو شارە هەبوو وێنەیان پەیداکردبوو، هەزارەها وێنەی ناو یعقوبیان بۆی بردوو بۆ ناو ژوورەکەو داوایان لێکردبوو یعقوبەکەی خۆی بناسێتەوە، پاش چەند رۆژێک لە سەیرکردنی وێنەکان لە رۆژی حەوتەمدا توانی (یعقوب یوسف جاسم)ی تەمەن 34 ساڵیان بۆ دەستنیشان بکات.

****

یعقوبی جاسووسی مۆساد فەرمانبەربوو لە یەکێک لە ویستگەکانی کارەبای بەغدا، پاش ئەوەی وێنەی تری کابرایان بەشێوەی تر نیشاندابوو، ئەو دڵنیابوو کەوا ئەو کەسە خۆیەتی کە ئەو ناسیوویەتی، بۆیە کارمەندانی موخابەرات لە هێرشێکی کتوپڕدا لە ماڵەکەی خۆی دەریانهێنابوو، لەناو پسولەکانی ماڵەوە، بۆیان دەرکەوت کە و پیاوە دەیان جار سەفەری ئێرانی کردووە، ئەوانیش لەکاتی لێکۆڵینەوەکاندا پرسی سەفەرەکانیان لێکردبوو، ئەویش وتبووی:

(من ژنم ئێرانییەو بۆیە سەردانی زۆری ناو ئێرانم کردووە).

بەڵام کە پۆلیس و موخابەرات زۆرتر لەماڵەکەی و لە ناو کەلوپەلەکانی پشکنینی وردیان کردبوو چەند بەڵگەنامەیەکی سەربازییان لە ناو یەکێک لە لوولەپێیە مسەکانی چوارپایەکەی نووستنی دەدۆزنەوە، ئەو بەڵگەنامەکانی بە داوێک بۆ بنەوەی لوولەی پێی چوارپایەکەی شۆڕکردبۆوە، لوولەکە سەرێکی هەبووە، بەڵام ئەو لە بیری کردبوو سەرەکەی لەسەر دابنێتەوە، بۆیە گومانیان لەو لوولەپێیە کردبوو، کە سەرە داوەکەیان راکێشابووە دەرەوە، چەند بەڵگەنامەی شاراوەیان دەرهێنابوو، کە ئەوەیان دۆزیوەتەوە، دەستەیەکی پسپۆڕ لەدۆزینەوەو ئاشکراکردنی شتی نهێنی لە ماڵەکەی گەڕابوون، لەناو بەرگی دووەمی دیوانێکی شیعری (معروف الرصافي)دا نامەیان بە زمانی فارسی دۆزیوەتەوە، نامەکان کە لەئەفسەرێکی ئیسرائیلی لە بەندەری (عبادان)ەوە بۆی هاتبوو، تێدا داواکاربووە نەخشەو راپۆرتی لەسەر چەکە سۆڤیەتییە نوێیەکانی ناو سوپای عێراقی بۆ سازبکات، هەروەها زانیاری لە سەر ئەو

غواسانەی کە لەبن ئاوی کەنارەکانی بەندەری آم قصری عێراقی سەرسنووری کوێت مۆڵدراون بۆ پەیدابکات، کار بۆ ئەوە بکات مولگەکانی فڕۆکەی (توبولوف 22)یان بۆ دەسنیشان بکات، ژمارەیان بزاندرێت تا لەکاتی گونجاودا هێرشیان بکرێتە سەر، پێویستیان بە زانیاری زۆر لەسەر فڕۆکەکانی مێک 21 و ژمارەی فڕۆکەوانەکان و شوێنی فڕۆکە خانەکانیان هەیە، داوایان لێکردبوو راپۆرتیان لەسەر پسپۆرە سۆڤیەتییەکانی ناو سوپای عێراقی و ناو فڕۆکەخانەکان بۆ بنوسێت.

****

یعقوب جاسم وەک هەر گەنجێکی تری ناوچەکە خەونی بەگوزەرانی خۆش و شکۆیی دەبینی، ئەو لە خوێندن نەیتوانیبوو بڕوانامەیەکی باش بەدەست بخات، بۆیە بەهەزار کۆشش و ئەوملاوئەولا توانیبووی لە وێسگەیەکی کارەبای ناوشاری بەغدا کارێکی مامناوەندی بدۆزێتەوە، لەگەڵ ژانی رۆژانەی کارو ژیان هەستی بەشکان و رووخان دەکرد، چاوی هەر لەوەبوو دەستێک بەرەو زۆرترین رابواردن و خۆشگوزەرانی ببات. ئەو لەرۆژێکی مانگی سپتەمبەری ساڵی 1963 جانتاکەی دەپێچێتەوەو بەرەو ئێران سنوور دەبڕێت، دوو هەفتە لەسەر کەنارە جوانەکانی دەریای قەزوین بەسەردەبات. ئەو ناوچەیەی دەکەوێتە نێوان چیاکانی بورزو دەریا، کە هاوینەکەی زۆر خۆشە و بارانی جوانی تێدا دەبارێت، سەفەری کردبوو تا لەسەر کەنارەکانی ئەستاراو رامرو بەندەر پەهلەوی و بابلرو نوشهر ماوەیەک هەناسەی خۆشی هەڵمژێت، لەوێ لەسەر کەناری رامر زۆر کیژی ناسکی بینیبوو، لە دیار ئەو دیمەنە نازدارانە گریانی هاتبوو، جوانی دیمەنەکان سەرسامیانکردبوو، هەستی بەوە کردبوو ئەو وەک گەنجێک چەند لەخۆشییەکانی جوانی ژیان بێبەشە، چەند لەخۆشی دوورە.

لەودەمانەداو لەو هەوارە خۆشەدا، پیاوێک بەزمانی فارسی سڵاوی لێکردبوو، بەڵام ئەو وتبووی:

(من کەسێکی عێراقیم و زمانی فارسی بەڵەد نیم).

بەڵام ئەو بەزمانی عەرەبی پێیوتبوو:

(منیش لوبنانیم و ناوم (مازن)ەو لەتاران دەژیم و کاری بازرگانی دەکەم).

کە مازن ناوەکە لەو دوور دەکەوێتەوە، (ژالە)ی سکرتێرە شۆخەکەی خۆی پێدەناسێنێت، کە نازداری ئەو دەبینێت زۆر سەرسام دەبێت، لەسەر خوانەکەی ئێوارەیان ژالەو کوکوشی دەستە خوشکەکەی دانیشتنەکە زۆر ئەفسوناوی دەکەن، جوانی کوکوش زۆر مەستی دەکات، بۆیە یعقوب بەرگەی نازەکەی ناگرێت، دەیەوێ هەڵسێت و بچێتەوە هوتێلەکەی، بەڵام

مازن تە کلیفی مانە وەی لێدە کات، لە ژوورێکی سە رەوەیان لە گەڵ کوکوش دە مینێتەوە، لەخوارەوەش لەژوورەکەی مازنەوەو بەکامیرای تایبەتیەوە، مازن لەگەڵ دوو ئەفسەری مۆساد ژوانەکەی کابرا دەبینن. بەو جۆرە دانیشتنەکان دووبارە دەبێتەوەو درێژە دەکێشێت، تا مۆساد داوای لێدە کات لە کۆمپانیاکەی مازن کا ربکات، بە وەش عێراقییە گەشتیارەکەی سە ردەریای قەزوین سەرسام دەبێت، دەپرسی کارم لەو کۆمپانیایە چی دەبێت، ئەوانیش پێیدەڵێن:

ئێمە بڕیارماندواە لقێکمان لە شاری بەغدا بکەینەوە، لقە کەمان کار بۆ ئە وە بکات زانیاری لەسەر رەوشی ئابووری عێراقمان بۆ کۆبکاتە وە، دەستنووسی نادروستی چە ند لایەنێکی ئابووریشی پێ نیشاندە دەن، گە شتیارەکەش بڕوایان پێدە کات و زوو و بە دڵشادییەوە وەک بەڕێوەبەری لقی بەغدا رازی دەبێت.

****

کوکوش بە رنامەکەی تەواوبوو، ئەو گەڕاوەتەوە تاران، کوڕە کەش ماوەی گە شتەکەی تەواوبوو و گە ڕاوەتەوە بەغدا، بەڵام لەبەرگی کەسێکی خاوەنکارو پیاوی بازار، لە ناو جانتاکەشی 1200 دیناری عێراقی تێدایە، ئەوەش پێشینەی سێ مانگی مووچە کەی بوو، رۆژانە دەرکەوت ئەو پیاوە بۆ مازنی مامۆستاو خاوەن کارەکەی بەوەفابوو، لەلای کەسیش باسی کارەکەی خۆی نەکردبوو، سە ربردەی سە ردەریای قە زوینی بۆ کە س نە گێراوەتەوە، بە پەرۆشی کە وتووە ناو باس و سۆراخی بازارو کڕین و فرۆشتنی بازار.

پاش 5 مانگ دووبارە یعقوب سە فەری تارانی کرد یەوە، بە ڵام ئەمجارە راپۆرتی ئابووری و زانیاری لە سەر بازارە کانی بە غدای کردبووە راپۆرتێک و هیوای زۆربوو، ئە و ببێتە کەسێکی سەرمایەدارو خاوەنکاری ناودار لە بەغدا. لەو سەفەریدا مازن ئەوی بەکەسێکی ئێرانی بەناوی (عبد نابلون )ی ناساندبوو، بە یەکەوە چوونەتە هوتێلێکی گە ورە لەشەقامی ورزش لەباکووری پارکشهر لە تاران. لەوێ یعقوب باسی بە رنامەکەو رەوشی ئابووری بە غداو پلان و پێشنیارەکانی بۆ بازار ەکە بۆ کردبوو، بە ڵام کابرای ئێرانی بابە تەکەی بە رەو سیاسە ت و چەکداریی و کاروباری سە ربازی بردبوو، بە ڵام ئە و بابە تەکانی ئە وی بە بێبایە خ وە رگرتبوو، خۆی لە باسەکانی نابلور دوورخستبووەوە، کابراش زانی بابە تەکە زۆر دەخاتێت و پێویست بەکات بەفێرۆدان ناکات، بۆیە یەکسەر کاکلی مەبەست و داواکەی خۆیانیان تێگەیاندبوو، کەوا ئەوان مەبەستیان ئابووری و بازارنییە، ئەویان بۆ نووسینگەی ئابووری و نوێنەری بازار گەرەک نییە، ئە وان ئە ویان وە ک کە سێکی بە کرێگیراو بۆ مۆساد مە بەستە، دە یانەوێت کاریان بە و ئاراستەیە لەگەڵدا بکات، هە موو کارێکیش هە رچەندە کەم و سادە ش بێت ئەوان دەیکرن، بەروونی پێیدەڵێن، ئێمە کەپارەشی پێدەدەین دەمانەوێت.

بەبیستنی ئەو داوایە کابرا دەمی کلیلدرابوو، هەموو جەستەی هەژابوو، تێگەیشتبوو تازە ئەو کەوتووەتە ناو تۆڕی مۆسادەوە، لە ناو تەونی جاڵجاڵۆکە کە دەربازبوونی زەحمەتە، لەولاشەوە نابلۆن دەیزانی کابرا تا رادەی تاعەت و تەسلیمبوون رۆیشتووە، باش ڕوومبووە، وێنە رووتەکانی کە بۆیان گرتبوو، راپۆرتەکان بەدەستخەتی خۆی، لە وانە چۆن دەربازی دەبێت، ئەوانە دەمی دادەخەن، ئەگەر گوێڕایەڵ نەبێت، ئەگەر ئەوانە لە بەغدا ئاشکرابکرێت، لەوێش ئیعدامکردنەکەی مسۆگەرە، لەو رەوشەدا کیژێک بە ناوی (فروزندە وثوقی) گەیشتووەتە سەر سەری، ئەو رەنگە بتوانێ ترس و رووخانەکانی ئاسایی بکاتەوە، تارماییەکە لەسەرسینگی سووک بکات، زۆر بەیەکەوە قسەیانکردبوو، کیژەکە پێیووتبوو:

(من رازییم شووت پێبکەم).

ئەو کیژەش بەیارمەتی مۆساد هاتووتە تەنیشتی و خەونێکی جوانی بۆ سازاندبوو، کیژەکە وتبووی:

(من ئامادەم لەگەڵتا بگەڕێمەوە ناو عێراق).

****

لەو رۆژەوە کابرا ئازادانەو زۆریش سەردانی وڵاتی ئێرانی کردووە، بەو پرۆسەیە مۆساد توانی زۆرترین زانیاری لە و پیاوە دەستەبەر بکات، فرزوندە ژنیەتی و مامۆستایەتی و مەشقی پێدەکات، ئەو باشی دەزانی چۆن بۆ بە رژەوەندی مۆساد رایبەڕێنێت. کە گەڕاوەتەوە بەغدا جاسووسی ناو تەونەکە کەوتووەتە کارکردن، کاری بۆ دۆزینەوەی نهێنیەکانی چەکەکانی سوپای عێراقی دەکرد، لەجۆرو شێوەو ژمارەی چەکەکانی دەکۆڵیەوە، ئەو چەکانە چۆن دەگەنە ناو عەمانی ئوردن، سەرەتا کارەکانی باش و سەرکەوتوو نەبوو، بەئاسانی زانیاری بە سوودی دەست نەدەکەوت، تا پیاوێکی عەریفی بەناوی (نوری سوار) ناسی، بەپارە هەڵرشتن و دیارییە زۆرەکانی، توانی عەریفەکە قایل بکات، زانیاری سەبارەت بە ژمارەی ئەو چەکانەی رەوانەی ئوردن کراوە، بۆیان پەیدا بکات.

یعقوب و ژنەکەی لەدۆزینەوەی عەمباری چەکی کۆگای ژمارە 3ی سەربازی کاریان دەکرد، دەیانویست نهێنییەکانی ئەو کۆگایە لەبەغدا باش تێبگەن. مۆساد زۆر جاریتر کاری بۆ نهێنیەکانی ئەو کۆگایە کردبوو، بەڵام هیچی دەسنەکەوتبوو، تا رۆژێکیان ژنەکە بەرێکەوت لەناو شەقامەکانی بەغدا رووبەرووی ئەفسەرێک دەبێتەوە، لە ئەفسەرەکە دەچێتە پێشەوە، بەعەرەبیەکی شڕ، پرسیاری شوێنێکی لێدەکات، بۆیە ش ئەفسەرەکە ناچار دەبێت وەڵامی بداتەوەو رێگای نیشانبدات، لەوماوەیەدا قسەی لەگەڵ دەکات، هەربەرێوە ئەفسەرەکە کە پلەی

نەقیبی هە بوو، دە کەونە دەمەتەقێ، زۆریش بە رێزەوە مامەڵەی لە گەڵ دە کات، بە رنامەکەیان وادەبێت هەتا پێش دەرگاکەیان لەگەڵیدا دەڕوات، لەپێش دەرگا مێردەکە ژنەکەی خۆی لەگەڵ ئەودا دەبینێت، پیاوەکەش بەرێزەوە سوپاسی نەقیبەکە دەکات، کەوا ئەرکی کێشاوەو ماندووبووە، بۆیە ژن و مێردە کە داوای لێدە کەن، لە ماڵەکەیان لابدات و ئیسراحە تێ بکات، ئە ویش بەڵێندەدات ئە گەر م ە جالی هە بوو سە ردانیان دەکات، پاش چە ند رۆژێک کابرای ئە فسەر لەدەرگایان دە داتەوە، ژنە کەش بە تەنها لە ماڵەوە دەبێت، دە ڵێ مێردە کەم سە فەری موسڵی کردووەو چەند رۆژێک دەمینێتەوە، بۆیە ئەفسەرەکە کە دەزانی پیاوەکەی لەماڵ نییە دەیەوێت بڕوات، بەڵام ژنە کە میوانەکە ئیزن نادات، هە ر لە و سەردانەدا بۆی رووتدە بێتەوە، کە تامی خۆشی جە ستەی ژنە کە دەکات، دوو سە ردانی تریشی بۆ دە کات، بەو شێوە یە ئەفسەرەکە دەکەوێتە داوی تۆڕەکە، بەو جۆرە تەواوی نهێنییەکانی کۆگای 3ی سەربازی تەسلیم بە ژنەکە دەکات، لەبەرامبەر ئەو کارەش یعقوب 2500 دینارو ژنەکەی خەڵاتی ئەفسەرەکە دەکات.

لەو رۆژە وە (آحمد رافع ) دووچاری خە مۆکی و پە شیمانی دە بێتەوە، هە ستدەکات خیانەت و ناپاکییە کی گەورەی دەرحەق بە وڵاتەکەی کردووە، سەردانی فرزندە ناکاتەوەو لە و دووردەکەوێتەوە، بۆیەش مۆساد هەست بە گومان و ترس دە کات. کەدەزانن کابرای ئە فسەر رەوشی دە روونی بە رەو خراپی و لاوازی دە ڕوات ژن و مێردە کە لەترسی پە تی سێدارە و ئاشکرابوونیان بیر لە لەناوبردنی ئە و دە کەنەوە، یعقوب بۆ جێبە جێکردنی پلانێک سە ردانی دەکات، رافعی ئە فسەر بە لالووتەوە پێشوازی دە کات، پاش مانە وەی و خە ریککردنی نێچیرە کەی ژە هری سیانید ی بۆ لە گلاسێکی شە ربەت دە کات، کە هەستیکردووە، ژە هرە کە کاریکردووە، کابرا ی ژەهرکراو لە گەڵ ژانی مردنە کەی جێدە هێڵێت و دە ڕوات بۆ بە یانی بۆ ناشتنی تە رمە کەی لە گۆڕستان بە شداردەبێت. لەدەستچوونی ئە و ئە فسەرە بۆ ئە وان زیانێکی گەورەبوو، بۆیە ناچارن لەدوای یەکێکیتر بگەڕێن، بەڵام ئەمجارە لەئەفسەرێکی پلەدار دەگەڕێن تا زۆرترین نهێنییان بۆ ئاشکرا بکات.

****

رۆژێکیان عە قیدێک بە ناوی (جاسر عبدالراضی ) لەناو ئوتومبێلە پەککەوتووەکەی دانیشتبوو، چاوەروانی شوفێرەکەی دەکرد، ئوتومبێلێکی بۆ بدۆزێتەوە تا رایانکێشێت، لەودەمانەدا ژنێکی شۆخی نازدار بە رەو رووی دە چێت، بەڵام ژنە کە چاو بە گریان و خە مگین دیاربوو، بە عەرەبیە کی شڕ لەئەفسەرە عەقیدەکە دەپاڕێتەوە، بەدڵسوتاوییەوە بەئەفسەرەکە دەڵێت:

(مێردە عێراقییەکەم دەمکوژێت، من ژنێکی ئێرانی بێکەسم لێرە!).

ژنەکە لەکابرا دەپاڕێتەوە یارمەتی بدات تا بگەڕێتەوە ماڵی باوکی لە ئێران و لە دەست مێردەکەی رزگاری بێت، ئەفسەرەکە دڵی دەداتەوەو پێیدەڵێت:

(من لەگەڵتا دێمەوە ماڵەوەو مێردەکەت رازی دەکەم، مامەڵەی باشت لەگەڵدا بکات و رفتارە چەوتەکانی راست بکاتەوە).

ژنەکە بەسۆزەوە بە ئەفسەرەکە وەدەنووسێت، لەودەمانەشدا هەمووی گیانی دەلەرزێت، بەو شێوەیە ژنەکە ئەفسەرەکە دەهێنێتەوە ماڵەکەی خۆیان ، لەوێش یعقوبی مێردی زۆر رێز لە مێوانەکە دەگرێت و بە گەرمی بەخێرهاتنی دەکات، بەسەرهاتی خۆی و ژنەکەی بەشێوەیەکیتر بۆ دەگێڕێتەوە، بۆ ئەو مەسەلەیە چاک خۆی سازکردبوو، بەڵام ئەفسەرەکە دەڵێت:

(ئەگەر تۆ بەردەوام بیت لەسەر ئەو رفتارە نامرۆیانە، من یارمەتی ئەو ژنە بێگانەیە دەدەم بگەڕێتەوە ماڵەوەیان لە ئێران، ئەوانە مێوانی ئێمەن، بێگانەن، دەبێ رێزیان بگرین).

پاش چەند رۆژێک ئەفسەرەکە بۆ سەردانیان و بۆ تێگەیشتن لە وەزعی ژن و مێردەکە لەدەرگایان دەداتەوە، لێرەو لەودەمانە ژنە بەرنامەی خۆی جێبەجێ دەکات، مێردەکەی ناردووتە دەرەوە، خۆی تەنهایەو ئامادەیە هەنگاوێکیتر لە بەرنامەکەی بەرجەستەبکات، لەوێ زۆر سوپاسی کابرا دەکات کە لەدەست جەوری مێردە عێراقییەکەی رزگاریکردووە، باسی جوامێری و پیاوەتی ئەویش دەکات، بەو قسانە ژنە زۆرزانەکە تێدەگات ئەو باش رۆیشتووە، پاش چەند سەردانێک دڵی سوتاوو عەشقی بێسنووری خۆی بۆ پیاوەکە دەکاتەوە، بەئاشکرا پێیدەڵێت:

(من ئەڤینت بووم، من بۆت سوتاوم، دەبێ بەیەک بگەین).

ئەفسەرەکە بەراستی عاشقی ژنەکە ببوو، وای بۆ سووتا هەموو نهێنییەکان بەو دەفرۆشت، کەرامەتی پیشەکەی، پیرۆزی وڵاتەکەی بەو بەخشی، ئەو نهێنییەکانی فڕۆکەی سۆڤیەتی توبولیف 22 دابوو بە ئیسرائیلییەکان، ئەو فڕۆکەیەی لە فڕۆکە ب ـ 52 ی ئەمریکی نوێتربوو، چەند بەڵگەنامەی بەبایەخی لەسەر ئەو فڕۆکەیە رادەستی دوژمنەکانی کرد بوو، زانیاری زۆری لەسەر گەنجینەکانی لەدەست مۆساد دەکرد، زانیاری لەسەر دەبابەکانی ت ـ 62 ی بۆ کۆکردنەوەو هەموویان لەدەستی دانان، سەرژمێری تفەنگە برنۆیە شیکییەکان دانێ، بوونی رەشاشە دۆشکەکانی بۆ ئاشکراکردن، بەنەیارەکانی سوپای عێراقی راگەیاند کەوا چەند تفەنگی کلاشینکۆفیان هەیە، چەند رەشاشی (سینا)ی چینییان هەیە.

عقید (جاسر عبدالراضی ) لەبنەماڵەیەکی دێرینی سە ربازی بوو، زۆر لە ئەندامانی بنەماڵەکەیان پلە و پۆستی دیاری سە ربازییان هە بووە، شانازی زۆری بە وە دەکرد کە وا ئە و زانیاری زۆری لە سەر سوپاکەیان هە یە، نهێنی زۆری ئە و سوپایە دەزانێت، خزمە کانی، برادەرەکانی ئەفسەرەکانی کە هاتوچۆیان دە کرد، زۆریان بۆ هە ڵدەڕشت، بەڵگەنامەی باشیان لەبەردەستی دادەنا، زۆری لەبەر خاتری چاوی ئەو ژنە دانا، پێکهاتەکانی سوپاکەیان، یەکەکانی چەندن، سستەمی کاریان چۆنە، بنکە ئاسمانییە ستراتیژییەکانی هەموو بۆی سازدە کرد، ژنەکە دەیزانی ئەو پیاوە زۆر شانازی بە روتبەکەی دەکات، شۆخی بە پلە سەربازییەکەی لە یەکەی ئاسمانی دەکات، چاکیشی دەزانی ئەو زۆر شەیدا مێبازییە، هەموو مووچەو دەستکەوتەکانی لەو کارانە سەرفدەکات، بەردەوام پارەی بۆ قە رزدەکات، لەدەست قەرزارەکانی رادە کات، خۆی لەوان دەشارێتەوە، باشی دەزانی ئەو ئەفسەرە زۆر لە ژیانی خۆی بێزاربوو، زۆریش لە عێراق بێزاربوو، هیچ ئینتیمای بۆ وڵاتە کەی نە بوو، بەردەوام رەخنەی هە بوو، زۆریش سە رکۆنەی سەرکردەکان و بەرپرسەکانی دەکرد.

****

یعقوب بۆ سەردان و سەفەرەکانی ناو ئێرانی ترسی نەبوو، چونکە ژنەکەی ئێرانی بوو، لەو سە فەرەنەدا چەند بە ڵگەنامەو سە رچاوەی سە ربازی گرینگی دە گەیاندە ناو ئێران، بەڵگەنامەکانی تریشی کابرایەکی بەکرێگیراوی تر بەناوی (عزاوی الجبوری) بۆی پەیدا دەکرد. بەو شێوەیەو بە هاوکاری ژنەکەی کاری دە کرد، سوودی زۆری بە مۆساد دەگەیاندو ترسی نەبوو، بیری لە دوارۆژە رەشەکان نەدەکردەوە، تا لە ینایری ساڵی 1966 لەگەڵ ئەندامانی تۆڕێکی نۆ کەسی گیرا، تا لە بەیانی رۆژی 2ی فبرایری ساڵی 1966 بەناکامی لەگەڵ ژنەکەی چاوەروانی چارەنووسە نادیارەکەی دەکرد، لەژووری نووستنەکەی خۆیان بوون، فروزندەو یعقوب لەناو باوەشی یەکدابوون، گوێیان لە ترپەی پێی دە یان کە س بوو، هە ستیانکرد ماڵە کەیان گەمارۆدراوە، ژنەکە ویستی بەرەو قاندرمەیەک رابکات، دەیان چەکدار پیاوی لێیان بەژووردا کەوتن، لەودەمانەدا ژنەکە زوو دەمی پڕکرد لەو ژەهرەی لەناو لوولەیەک کە لێی نزیک بوو، بەڵام یعقوب دەستەکانی لەناو زەنجیری ئاسنی گران دۆزیەوە، دەست بەزنجیرەوە پەلاواژبوونی ژنەکەی بینی، چۆن چاوە کان کزبوون، جەستەی بەرەو زەوی لاردەبێتەوە، ئەو خۆی بە دەستی خۆی لەسێدارەدا، بەڵام یعقوب لە دیسەمبەری ساڵی 1966 پاش دادگاکردنێک کە ماوەی دە مانگی خایاند لە بەندیخانەی مەرکزی بەغدا لەسێدارەدرا، عزاوی الجبوریش لەئوردن گیرا، ئەو لەسێدارەدانی مامۆستاکەی بەچاوانی خۆی بینی، بەڵام مەرگی فروزندەی نەبینی، عەقیدەکەش بە دەمانچەیەکی میری لە ماڵەکەی خۆی خۆی دەکوژێت، بەڵام فجر عبدالله بەزیندانی هەتامردن و کاری قورسەوە دادگاییکرابوو.

---

لەرۆژنامەی (الجریدة)ی کوێتی لە12 09 2008 وەرگیراوە.

## لەناو بەندەرەکەدا.

## لەناو بەندەرەکەدا.

هەموومان رووداوو ناوە ڕۆکی فیلمی (بئر الخيانة)ی هونەرمەند (نور الشريف)یمان لەبیرە کەباسی کوڕێکی میسری دە کرد، کە چۆن خۆی دابووە دەست موخابەراتی ئیسرائیلی، چۆن نووسینگەیەکی دەریاوانی لەبەنداوی ئەسکەندریە دانابوو، بەئارەزووی خۆی لە شۆستەکان و کۆگاکان ئازادانە دەسووڕایەوە، دە یتوانی بچێتە ناو شۆستە سەربازییەکانیش، بە لام پاشان موخابەراتی میسری هە ستی پێکردو گیرا، لە و فیلمەدا هونە رمەند (عزت العلايلي) رۆلەکەی بینیبوو، کە تێدا ئەو لەوێ بەخائینی ژیاو بەکافریش مرد.

رووداوی فیلمەکە لەچیرۆکێکی راستەقینەی دۆسیەکانی موخابەراتی گشتی میسرییەوە وەرگیرابوو، پاڵە وانە راستیەکەش کوڕێکی ئە سکەندەرانی بوو، ناوی راستی خۆی (رجب عبدالمعطي)بوو، ئە و لە 1ی ئوکتۆبە ری ساڵی 1937 لەگەڕەکی (القباري) لەئەسکەندریە لەدایکبووە، رووداوە کە لەگەڵ پاراستنی لایە نی ئاسایشی نەتەوەییەوە وەک خۆی نمایشکراوە. لەبەر خۆشی ژیان و بەردەوام خەریکبوونی ئەو بەرابواردن، ئەو نەیتوانیبوو خوێندنی دواناوەندی تەواوبکات، بۆیە لەنووسینگەکەی باوکی لە دەریاوانی وە ک فە رمانبەرێکی ژمێریاری لە ئەسکەندریە کاریکردووە، پا ش سێ ساڵ کارکردن ئارە زووی یاخیبوون و دوورکە وتنەوەی کەوتووتە خەیاڵ، ئارەزووی سەفەری کەنارەکانی یونانی لەکەللەی داوە، ئەو زۆری لەلا ئاسایی

بوو بەمەلەوانیش بێت بپەڕێتەوەو بچێتە یونان، بەڵام باوکی هانی نەداوە ئەو سەفەرەبکات، بەڵام کوڕەکەی لەدژی بۆچوونەکانی باوکی سووربوو لەسەر سەفەرکردن و یاخیبوونەکانی.

رجب لە هوتێلێکی سادەو هەرزان لە شاری (بیریە)ی یۆنانی دادەبەزێت، پێش ئەوەی پارەکەی تەواوبێت، لەگەڵ کۆنە ناسیاوێکیان یەکتریان ناسیوەتەوە، بۆیە بەدزی و بەفێل بڕێک پارەی لێ وەردەگرێت و رادەکات و دەچێتە ئەسینا، یەک مانگ لەو شارە بێ کاروکاسبی وەک سەدان گەنجی بێکارو بێ بەرنامەی میسری وەک خۆی نائومێد دەسووڕایەوە، زۆر بیری لەوە کردیتەوە کارێک بدۆزێتەوە لەکەسایەتی و زانینی ئەو بەوەشێتەوە، چاوەڕوان بوو ئەو فرسەتەی بۆ هەڵکەوێت. تارۆژێکیان لەشەقامەکانی ئەسینا دەسووڕایەوە رووبەرووی گەنجێکی (صعیدی) میسری دەبێتەوە، داوای لێدەکات لەگەڵ ئەو لەکارگەیەکی شەربەت کاربکات، بەڵام ئەو دەڵێ من ئەو کارانانە ناکەم، ئەوەیان لە من ناوەشێتەوە، بۆیە گەنجە صعیدیەکە ئامۆژگاری دەکات بگەڕێتەوە میسر، ئەگەر بەو شێوەیە بێ بەرنامەو بێکار بسووڕێتەوە رۆژێ دادێ دەکەوێتە داوی تۆڕێکی جاسووسی مۆسادی ئیسرائیلی، ئەوانە لە راوکردنی گەنجانی میسری زیرەکن و بەپارەو سێکس و مێبازی هەڵیاندەخەڵەتێنن، دژ بەوڵات و بەنەتەوەکەیان بەکاریاندەهێنن، بۆیە واباشە هەرچەندی زووە بگەڕێوە وڵات!.

ئەو رۆژە رجب بەنائومیدی گەڕاوەتەوە هوتێلە هەرزانەکەی و بەبیری هاتووەتەوە کەوا جۆن باوکی و ماڵەوەیان گاڵتەیان بەو هاتووەو پێیانووتوە تۆ خۆت پێناژیت و دەبی بەنائومێدی و شەرمەزاری بگەڕێیتەوە، لەوەدەمانە خاوەن هوتێلەکە لەدەرگای دابوو، داوای پارە ی نووستن و مەسرەفەکانی لێکردبوو. لەبەرئەوەی گیرفانی بەتاڵ بوو، بڕیاریشیدابوو نەگەڕێتەوە ماڵەوەو بۆیە لەودەمانەدا قسەی کابرا صعیدییەکەی بەبیردێتەوە کە پێیوتبوو، زۆرن ئەو گەنجانە لەئەنجامی نەژیان و بیکاری خۆیان دە فرۆشنە مۆساد، لەودەمانەدا قوڕگی دەگیرایێت، چونکە خاوەن هوتێلەکەش تەنگی پێهەڵچنیبوو، بەکابرا دەڵێ تا بەیانی لەسەرم راوەستا، بۆیە ئەویش یەکسەر بڕیارێکی شێتانە دەدات و نامەیەک بۆ سەفارەتی ئیسرائیلی لە ئەسینا دەنووسێت، کە ئەوەش دەقەکەیەتی:

بەرێز گەورەم سەفیری دەوڵەتی ئیسرائیل لە ئەسینا..

من فەرمانبەرێکی میسرییم و لە هوتێلی (زفیروس)دا دابەزیوم، دونیام لێرە و لە شارەکەی خۆم ئەسکەندریە لێ گیراوەو هیوام بەهیچ شتێک نەماوە، من زانیوومە ئێوە یارمەتی هەر کەسێک دەدەن ئەگەر هانای بۆتان هێنابێت، ئێوەش دوا نوای منن، تکایە دەکەم دڵتان بە من بسوتێت و چاوەروانی سۆزو دلۆڤانیتان دمبم).

رجب عبدالمعطي
ئەسینا 27 / 12 / 1967.

****

هەر ئەو رۆژە رجب دەچێتە سەفارەتەکەو نامەکەی دەداتە فەرمانبەرە ئەمنەکەی پێشوازی و پاش سێ رۆژ نوێنەری سەفارەتی ئیسرائیلی لە ئەسینا دەگاتە هوتێلەکە، کابرای داماو دەباتە سەفارەت، لەوێ پاسپۆرتەکەی لێوەردەگرن و بلانکێتێکی دەدەنێ و داوای لێدەکەن بۆیان پڕبکاتەوە، ناوی تەواوی ئەندامانی خێزانەکەیو هاوڕێیەکانی و کارو پیشەکانیان تێدا بنووسێت، داوادەکەن ژیاننامەی خۆی بەوردی بۆیان بنووسێتەوە، زانیاری زۆر لەسەر بەنداوی ئەسکەندرییەی میسریان بۆ بنووسێت، باسی لێهاتوویی خۆی لە و کارەیان بۆ بکلت، چە جۆرە پیشەو کارێک دە زانێت. ئەویش هە موولایەنێکی ژیانی خۆی بە وردی و بە جوانی بۆیان تۆماردەکات، پیاوانی سەفارەت بەدیتنی ئەو زانیاریانە خەنی دەبن، وادەزانن گەنجینەیەکیان دەستکەوتووە، بۆیە قەرزەکانی ناو هوتێلەکەی بۆ دەدەن، لەوێ دەریدەهێنن، ئەو دەچێتە هوتێلێکی پلەداری بەرزو پارەی زۆری بۆ ژیان و رابواردنەکانی دەدەنێ، پیاوانی مۆساد بەردەوام دۆلاری لەپێش رووەکەن، بەبێ ئەوەی باسی کارو بەرنامەی پێشینەی لێبکەن، ئەو ماوەیەش لەژێر چاودێری تاقیکردنەوە دەبێت. پاش چەند رۆژێک پیاوێک بەناوی (آبو آبراهیم) لەهوتێل دەچێتە سەردانی، ئەو ئەفسەرێکی مۆسادبوو، ناوەکەشی ناوی کارکردنی بووە لەو دەزگایەدا، ئەو پیاوە دەبێتە بەرپرسی ئەوو پێیدەڵێت:

(تۆ لەو رۆژانەدا سەفەری تەلئەبیب دەکەیت. بۆیەش داوات لێدەکەم، لەسەفارەت بەیانی زوو سەردانمان بکە، وا باشە خۆشت باش سازبکە).

پێش ئەوەی کابرا بڕوات و ئەو جێبهێڵێت 400 دۆلاریشی لە گیرفانی بۆ دادەنێت.!

****

رائید لە سوپای ئیسرائیل

هەر کە رجب لەفڕۆکە ئیسرائیلییەکە دادەبەزێت، سێ پیاو بە ئوتومبێلێکی رەش چاوەروانیان دەکردو مۆبایلەکەیان وەردەگرن و بە دەرگایەکی تایبەتی دەکەینە دەرەوە، رجب دەبەنە یەکێک لەو شوقانەی کە مۆساد جاسووسە نوێیەکانی تێدا مەشق دەکات، لەوێ کیژێکی عەرەبی زمان چاوەروانی دەکات، کیژەکەی پێدەناسێنن و پێیدەڵێن:

(ئەوە كیژە ناوی (زهرة)یە تا تۆ لە تەلئەبیب دەمێنییتەوە، ئەو لە خزمتت دەبێت).

پاش ئەو پێشوازی و بەرێكردن و ناسینە، بۆ پشوودان تەنها جێیدەهێلن، پاش چەند سەعاتێك دێنەوە شوێنی و دەیبەنە دەزگای مۆسادو لەوێ بەرەو مەشقی دۆزینەوەی درۆی دەكەنەوە، دووبارە هەموو زانیارەكانی كە لەسەر ئەسكەندریە تۆماری كردبوو، لێیدە پرسنەوە، ئەو زیرەكانە لەو ئەزموونە دەردەچێت، بەو بۆنەیەوە لە هۆلێكی دەزگاكە ئاهەنگی دەرچوونی بۆ سازدەكەن، لەوێ پلەی رائیدی لە سوپای بەرگری ئیسرائیلی پێدە بەخشن، بۆیە ش مەشقی زۆرو بەرنامەی هەمەجۆری بۆ قۆناخی نوێ و دەستبەكاربوونی بۆ دەكەن. رجب لەوێ كۆرسەكانی راهێنانەكانی بەباشی بڕیبوو، بۆیە ئەوان بڕیاردەدەن رەوانەی شاری ئەسكەندریە بكرێتەوە، تا لەوێ یارمەتی باوكی بدات بۆ بوژانەوەی كۆمپانیا ئیفلاسبووەكەی باوكی، بۆ ئەو مەبەستەش ئیسرائیل پارەی پێویستی بۆ رەوانەبكات، بەڵام پێش سەفەرەكەی بۆ شارەكەی خۆی، تا كەس گومانی لێنەكات، دەچێتەوە ئەسیناو ماوەیەك لەوێ دەمینێتەوەو تا خۆی وا نیشانبدات كەوا ئەو لە ئەسینا كاریكردووەو لەوێ دەوڵەمەندبووە، رجب لەگەڵ زهرة دەچێتەوە ئەسیناو بەرنامەشی ئەوەیە ئیسرائیل لە دوژمنەكانی بپارێزێت و دژایەتی عەرەبە تاوانبارەكان بكات.

مۆساد لەگەرەكێكی هێمن لە ئەسینا شوقەیەكی گچكەیان بۆ بەكرێ گرتبوو، هەموو پێویستیەكانی ژیانێكی خۆشیان بۆ دابینكردبوو، چاكیان راهێنابوو كە چۆن مامەلە لەگەڵ میسرییەكانی ناو ئەسینا بكات، چۆن یارمەتیان بدات، چۆن زانیاری ترسناك و گرینگیان لێدەربهێنێت، لەبەررۆشنایی ئەو بەرنامەیەوە دۆستایەتی زۆری لەگەڵ میسرییەكانی ناو ئەسینا پەیدادەكات، ناوو كارە باشەكانی لەناو میسرییەكان بڵاودەبێتەوەو ناوی گەیشتووتە ئەسكەندریە، لە ماڵەوەیان و هاوسێیەكانی هەواڵی سەركەوتنی كورەكەیان پێگەیشت، زانیان كورەكەیان بوویتە براگەورەی هەموو میسرییەكانی ئەوێندەرێ و یارمەتی زۆریان دەدات چاكەو دەستی بەخێری دەگاتە زۆریان. بەو جۆرە یەك ساڵ لە ئەسینا ماوەتەوە، تا آبو آبراهیم بڕیاریدا رجب بگەرێتەوە ئەسكەندریەو كۆمپانیای باوكی بژێنێتەوەو لەبواری دەریاوانی بكەوێتەوە كاركردن.

***

رجب گەراوەتەوە شارەكەی وەك كەسێكی سەركەوتوو دەوری خۆی دەبینی، كە ماوەیەك لەدەرەوە چاكەی زۆری لەگەڵ هاووڵاتیانی كردووە، وا لە شارەكەی خۆشی لەسەر هەمان بەرنامەو چاكە دەستبەكاردەبێتەوە، یەكەم كاری ئەوەبوو كۆمپانیاكەی باوكی نۆژەنكردیتەوەو كەرەستەو كەلوپەلی نوێ و گرانبەهای لە نووسینگەكە ریزكردووە.

لەسەرەتای سالّی 1971 رجب بارەگای کۆمپانیاکەو کارەکانی سازبوون بۆ ئیشکردن، بەو بۆنەیەوە ئاهەنگێکی گەورەی سازکردبوو، لەگەڵ هاورێیەکان و ئەندامانی خێزانەکەی چەند بەرپرسێکیشی داوە تکردبوو، ئە و هە والّەشی لە دەزگاکانی راگە یاندن بلاّوکردیتە وە، بە یارمەتی دەزگای مۆسادە وە کراوە بە نمایندەی چە ند کۆمپانیای ناوداری جیهانی . کۆمپانیاکەی گەشەیکردو فە رمانبەرو کارمە ندەکانی ژمارە یان زۆر دەبێت، لە هەموولایەک و بە هۆی ناسیارەکانی کارو راسپاردە ی زۆر دە بوو، ناوبانگی دە رکردبوو، لە بەناوی ئە سکەندریە وەک کەسێکی رە سمی و بە ئارەزووی خۆی دە سووڕایەوە، پە یوەندیشی لە گەڵ چە ندین بە رپرسی گەورەو ناسراو بە ستا، کە سیش گومانی لە و نە دەکرد، بۆیە بەئارەزووی خۆشی لە بەشە سەربازییەکەی شۆستە کەش هاتوچۆی دە کرد، لەماوەی سێ مانگدا کارە کانی زۆر گە شەیکرد، بۆ مۆسادیش کاری زۆر دە کرد، بۆیە ئامێرێکی لاسلکیی باشی بە شوفرەیان بۆ ناردبوو، لە و دەمانەشدا عەرەب سە رقاڵی ئاهە نگی سە رکەوتنەکانی شە ڕی ئوکتۆبە ربوون، لەولاشەوە رجب بۆ دۆستە جوولە کەکانی شێوە ن و پرسە داربوو، بۆیە ش مۆساد زۆرتر فشاریان خستبووە سەر رجب تا چالاکی و هەڵسوکەوتی پاپۆرە سۆڤیەتییەکان باش سۆراخ بکات، دەقە دەقە چاودێریان بکات، بزانی رۆژانە باری چی دە هێنن، بۆیە ش لە ودەمانە گومان لە جولەو چالاکی و پەیوەندییەکانی رجب لە بەنداوو لە شۆستەکەکرا، کە سۆراخی پۆستی ئە وروپایان کرد، موخابەراتی میسری شوفرەیەکەیان لە نامەکانی دە رەوەیان دۆزیە وە، هە موو جولە و هەڵسوکەوتەکانیان سۆراخکردو بۆیان روون بۆوە کەوا ئەو بۆ بەرژەوەندی ئیسرائیل کاردەکات.

بەیانی رۆژی 13 ی ینایری سالّی 1975 ئەو گیرا، باشترین بەڵگەش ئەوەبوو کەوا موخابەراتی میسری لە نووسینگەکەی رجب خە ریکی پشکنین بوون لە ئەوروپاوە پۆستێکی بۆ هات، کە پۆستەکەیان کردیتەوە، بە شوفرەکان نامەکەیان خوێندیتەوەو بۆیان دەرکەوت کەوا مۆساد داواکارە لە 1ی مارس ئەو سەفەری ئە سینا بکات، کە لە باڵەخانەی موخابە راتی گشتییەوە لێکۆڵینەوەیان لە گەڵدا دە کرد، لە وێ دانی بە زۆر بابە تی گرینگ دانابوو، بۆیە ش رەوانەی دادگایە کی سەربازییانکردبوو، دەرکەوت کەوا ئەو زانیاری زۆری سە ربازی و ئابووری بە دوژمن داوەو زیانی لە بەرژەوەندی دەوڵەتداوە، رازی بووە ناوێکی جوولەکە لە خۆی بنێت و پاسپۆرتێکی جوولە کەش وە رگرێت و پلە یە کی سە ربازی جوولە کەش لە سەرشان بکات، بۆیە دادگا بڕیاری لە سێدارەدانی بۆی دە رکردووە، لە و ماوەیەی چاوەروانی رۆژی سزاکە ی دە کرد، زۆر هە ستی بە شەرمەزاری کردووەو زیندانیە کانیش زۆر سە رکۆنەیان کردووە، بۆیە بەرگەی چاوەروانی نە کردووە، تا رۆژێکیان بە جامی چاویلکە کەی دە مارەکانی دە ستی بڕیبوو بە خوین پڕژان لە کونجی زیندانەوە گیانی دەرچووبوو.

لەرۆژنامەی (الجريدة)ی کوێتی رۆژی 27ی سپتەمبەری سالّی 2008 بلاّوکراوەتەوە.

## فڕاندنی فڕۆکەیەکی مێک 21 لە موسڵەوە.

## فڕاندنی فڕۆکەیەکی مێک 21 لە موسڵەوە.

لەسەرەتای شێستەکانی سەدەی رابردوو کە شەڕی ساردی نێوان هەردوو زلهێزەکەی دونیا گەرم و دژواربوو، لەودەمانەدا یەکێتی سۆڤیەت فڕۆکەیەکی شەڕکەری نوێی جۆری مێک 21ی داهێنابوو، ئە و فڕۆکە یە لە پێکهاتەکانیدا لایە نی شاراوە ی زۆری لە خۆگرتبوو، وڵاتانی ئەندام لە پەیمانی ئەتڵەسی، زۆر نهێنییە کانی ئە و فڕۆکە یان نە دەزانی، بۆیان ئاشکرا نە دەبوو، بەڵام زانرابوو کە ئەو فڕۆکەیە خێراییەکەی زۆرەو ئەو فڕۆکەیە لەیەک سەعاتداو لەبازنەیەکی داخراوی درێژی 500 کم، دە توانێت 2062 کم ببڕێت، هە ر ئە و فڕۆکە یە لەبازنەیەکی کراوەیی درێژی 100کم دە توانێت خێراییە کەی بگاتە 2375 کم لە یە ک سە عاتدا، ئە و خێراییەش دە گاتە دوو ئە وەندەی خێرایی فڕۆکە ی سکای هۆک، فڕۆکە ی ڤانتۆمیش خێراییەکەی تە نها 1400کم بوو لە سەعاتێکدا، فڕۆکە ی میراجیش خێراییە کەی تە نها 1500کم بوو لە سەعاتێکدا، ئەو فڕۆکە نوێیە سۆڤیەتیەش دەزگا سە ربازییە فڕۆکەوانیەکانی وڵاتانی ئە تلەسی سە رسام کردبوو، ئە و فڕۆکە یە پانی باڵە کانی تە نها 760 سم دە بوو، جەستەکەشی 16.75 مەتر درێژبوو، ئە وەشیان لە فڕۆکەکانی وڵاتانی ئە مریکاو فە رەنساو ئینگلترا نەبوون. بۆیە فڕۆکەکە بۆ ئەو وڵاتانە ببووە کابوسێکی ترسێنەرو دیزاین و نە خشەکەی

گرێیەک بوو هە مووبانی هە راسان و پە رۆش کردبوو، ئامادە بوون هە موو شتێ بکە ن تا لەنهێنیەکەی ئەو فڕۆکە تازەیە سۆڤیەتیە تێبگەن، لە هەمووشیان ترسناکتر ئە وەبوو فڕۆکە کە لەولاتانی عەرەبی وەک میسرو سوریاو عێراق کە وبتووە بەردەستی فڕۆکەوانی عەرەب، ئەوەش بۆ ئیسرائیل ببووە جێگەی گومان و ترس، بۆیە ش هە موولایەک پە رۆشی نهێنییەکانی ئە و فڕۆکەیەبوون، دەزگا پە یوەندیدارەکانی ئەمریکی و ئیسرائیل ئامادەبوون هەموو شتێ بکە ن و بیدەن تا دانەیەکی ئەو فڕۆکەیان دەستکەوێت و لەنهێنی دیزاینەکەی تێبگەن.

****

بۆ کۆششی هێنانی فڕۆکەکە، ئیسرائیل کۆششیکردو لەکۆتایی ساڵی 1961 حکومەتی میسری جاسووسێکی میسری بە نەژاد ئەرمەنیان بەناوی (جان لیون تۆماس ) گرتبوو، ئەویش لەرۆژانی لێکۆڵینەوەکانیدا دانی بە کارە جاسووسییەکەی خۆی نابوو، کە لەبەرامبەر پارەیەکی زۆری خەیاڵی، فڕۆکەوانێکی میسری رازی کردووە بەیەک ملیۆن دۆلار فڕۆکەیەکی مێکی 21 ی میسری بفرێنێتە ناو خاکی ئیسرائیل، بە ڵام کارەکەی سە ری نە گرتووەو جاسووسەکەش لەسێدارەدرا، بۆیە کارەکەو گەیاندن و هێنانی فڕۆکە کە زەحمەتتربوو، جێبەجێکردنەکەی کارو بەرنامەی وردو باشتری دەویست.

دەزگاکانی ئیستخباراتی ئیسرائیلی بۆ هێنان و پە یداکردنی ئە و فڕۆکە یە بیریان لەوەش کردە وە، فڕۆکە یەکی میسری یان سوری ناچاربکە ن لە ئیسرائیل بنیشێتە وە، بە ڵام بیرۆکەکە پەسندنەکرا، چونکە ئیسرائیل فڕۆکەی خێراتر لەو فڕۆکە مێکانە نەبوو، بۆیە نەدەکرا ئەو چالاکییە ئەنجام بدەن، بۆیە بەناچاری بیریان لەوە کردەوە کەسێکی بەکرێگیراو بدۆزنەوە، ئەو لەناو فڕۆکەخانەکان کاریان بۆ بکات و زانیارییان لە سەر فڕۆکەکە بۆ پەیدا بکات، بەڵام وتیان چاندنی کەسێکی بەکرێگیراوو چاوەروانکردنی ئەوو کۆکردنەوەو ناردنی زانیارییەکان کاتی زۆری دە وێت، بۆیە بڕیاریاندا فڕ ۆکەوانێکی عە رەب لە ناو وڵاتانی عە رەبی بدۆزنە وە تا فڕۆکەیەکی میک 21 یان بۆ بفرێنێتە ناو ئیسرائیل، ئە وەیان رێژەی سە رکەوتنی دەگەیشتە 25% ئەو رێژەیەش باش و مقبوول بوو، بۆیەش هەموولایەکیان کەوتنەخۆ بۆ دۆزینەوەی پلان و بە رنامەیەک بەهۆی جاسووسە کانی ناو وڵاتانی عە رەبیان، دە ستکرا بە دانانی پلانە شەیتانییەکەیان.

****

شەوە وەنەوشەیییەکەی پاریس

لەشەوێکی بە جۆشی هاوینە یی کۆتایی ساڵی 1964، گە شتیارێکی عێراقی لە دیسکۆیەکی ناو پاریس دابەزیبوو، مەستی نیگاو سەماو شەوەکەببوو، لەوڵاتی رافیدین بۆ خۆشی و پشوودان گەیشتبووە پاریس، لەوشەوەدا ئەو پیاوە عێراقییە کە چاوی بەکیژێکی نازداری زۆر ئازاد دە کەوێت، لە نجەو نیگاو مە ستییەکەی سە رنجی رادە کێشێت، کە سەیری بە ژن و جەستەی دەکات، مەست و شێتی دەبێت، ئەودەمانەش هەر کەسێکی ئیسرائیلی ئەگەر تووشی عەرەبێکی بهوایە نەیدەووت من ئیسرائیلیم، واتە رەگەزنامە ئیسرائیلییەکەیان لای عە رەبەکان نەدەدرکاند، کیژەکە خۆی وەک هاووڵاتیەکی فەرەنسی بە پیاوە عێراقییەکە ناساندبوو، پێیووتبوو من بۆ کات بەسەربردن و ژووانێ هاتوومە تە ئێرە، پاش دە مەتەقێ و قسە کردنی زۆرتر بەگەرمی باسی پۆلیتیکیان کردبوو، کابرای عێراقی دڵی خۆی کردبووە وتبووی:

(ئێمەی عێراقی زۆر لە رژێمەکەو حکومە تەکەمان بێزاین، هە موومان دڵمان پڕە، زۆر لەحزبی بەعسی دەسەڵاتدار پڕین، بەڵام چارەمان نییە.!).

کیژە ئیسرائیلییەکە بەنازەوە وتبووی:

(تۆش زۆر تۆختکرد، بڕواناکەم وا بێزاربن، واش نییە..!).

بۆیە گەشتیارە عێراقییەکە وەک قونبەلەیەک بتەقێنێتەوە، وتبووی:

(چۆن بێزارنین، کە سی وامان لە و بە غدایە هەیە برادەری خۆمە، ئامادە یە فڕۆکەی میکی 21 رادەستی ئیسرائیلییەکان بکات، ئامادەیە ئەو فڕۆکە سۆڤیەتیە بگەێنێتە ناو ئیسرائیل، ئەو خۆی لای من وتوویەتی، ئەو فڕۆکەوانە ئامادەیە ئەوە بکات).

کیژەکە بەسەرسامی و بەجۆشەوە بە عێراقییەکە دەبێژێت:

(ئەوە معقولە، تۆ چۆن قسەی وادەکەیت، ئەوە چۆن روودەدات.!).

بەڵام گە شتیارەکە بەدڵنیاییەوە بەنازدارەکە دەڵێت خۆی چە ندجار وتوویە تی و جنێوشی داوە، لەلای من وتوویەتی:

(هەردەمێک بۆم بگونجێت بەشانازییەوە ئەو کارە دەکەم).

کە کیژەکە ئەو قسەیە لەکابرا دەبیسرێت، بەنەرمییەوە دەڵێت:

(دەزانی من زۆر حە زم لە سەفەری عێراقە، من لە گەڵ کیژێکی هاوڕێم زۆرجار بیرمان لەوە کردیتەوە سەردانی ئەو وڵاتە بکەین، من هە وای خۆرهەڵاتم لا خۆشە، ئای کە خۆش دەبوو من و ئەو کیژە میوانی تۆو برادەرەکەت دەبووین، هەر چوارمان خۆشمان رادەبوارد،

چەند خۆش دە بوو دوو سێ هه فته له بەغدای زێدو وڵاتی عه لادین و چرا سیحراوییه کەی دەبووین، ئای که خەونێکی خۆش دەبوو...!).

ئەویش بەخۆشییەوە بە کیژەکە دەڵێت:

(بچاوان هه ر که هاتیت بۆ به غدا زووتر له پاریس ئاگادارم بکه رەوە، من له خزمەتیان دەبم، من له دەرەوەی شاری به غدا دەژیم، بەڵام ژمارەی تەلەفۆنی برادەرەکەمت دەدەمێ، ئەو هەموو پێویستیەکانت بۆ ئاسان دەکات، بەخێربێن).

میوانه عێراقیەکه هەو ئەو شەوە ژمارەی تەلەفۆنی برادەرەکەی بەناوی (جوزیف)ی دابووە کیژەکە، بۆیە کە کیژەکە ژمارەی تەلەفۆنەکەی وەرگرتبوو، تا کابرا هەست بەهیچ نەکات کیژەکە زوو بابە تەکەی گۆڕیبوو، بۆ بە یانی کیژە ئیسرائیلییەکە بەو هە واڵە نوێیە خۆشەو یەکسەر دە چێتەوە شوێنی کارە کەی لە باڵوێزخانەی ئیسرائیل لە پاریس، لە وێ دیمانە ی نوێنەری مۆسادده کات، وردو درشتی قسە کانی بۆ دە گێڕێتەوە، ئە ویش داوای لێدە کات پەیوەندەکە پتەوبکات، بەڵام کە پەیوەندی بە هوتێلەکە دەکاتەوە، دەڵێن میوانەکەمان سەفەری کردووە، بەیانی زوو دەرچووە، بەوەیان کیژەکە پەست و خەمگین دەبێت، بۆیە دەپرسێ دەبێ لە پاریس مابێت یان گە ڕاوەتەوە بەغدا، لەودەمانەدا نوێنە رەکەی مۆساد زوو هە واڵەکە دەکاتە راپۆرتێک و دەیگەیێنێتە سەرکردایەتی خۆی لە تەلئەبیب.

****

گیانبازییەکە

لە تەلئەبیب سەرۆکی مۆساد مائیر ئامیت (عامیت)، راپۆرتێکی ئاسایی دە چێتە پێش کە وشەی میک 21 ی دەوکەوێتە بەرچاوان سەرسام دەبێت، ئەو فڕۆکەیەی ئەوان خەونیان پێوە دەبینی، بەردەوام کاریان بۆی دە کرد، راپۆرتێک باس لە و فڕۆکە سۆڤیەتیە بکات، زۆر دڵشاددەبێت، ئە و کە لە 25ی مارسی ساڵی 1963 ئەو پۆستە ی لە و دە زگایە وەرگرتووە نێچیری وای نە هاتووتە پێش. ئەو لە وماوەیەی لە و پۆستە بووە زۆرجار لە گەڵ وە زیرە پەیوەندەیدارەکان کۆبوویتەوە، زۆرجار باس لە دەسکەوتی ئەو فڕۆکەیان کردووە، نهێنی ئە و فڕۆکەیان مە بەست بووە ، کە لەگەڵ سە رۆکی فڕۆکە وانی سە ربازییان کۆبوویتەوە، ئە و زۆر جەختی لە سەر ئە و فڕۆکە یە کردیتەوە، مە بەستیان بووە نهێنی ئە و فڕۆکە نوێیەی دە ست عەرەبەکان بدۆزنەوە.

سۆڤیەتییەکان بەدڵنیاییەوە فرۆکە نوێیەکەیان فرۆشتووتە هاوپەیمانەکانیان لە وڵاتانی پەیمانی وارشو، بەڵام گیانبازی دەویست ئەگەر ئەو فرۆکە نوێیان بدەنە دەست عەرەبەکان، کە بریاریشیان داوە فرۆکەکان بفرۆشنە عەرەبەکان، داوای زەمانەتی زۆریان لەپاراستنی نهێنیەکانی فرۆکەکە کردووە، پاش ئەوەی بەڵێنیان لە عەرەبەکان وەرگرتن کەوا ئەو فرۆکانە نادرێتە فرۆکەوانی نەفسنزم و گەندەڵ و لەرزۆک، فرۆکەکان نادەنە کەسانی هەڵەپاس و زۆربڵێ و زۆر کراوە، فرۆکە بدەنە ئەو کەسانەی لەپێش ژن و سکێس لاواز نە بن!. کە ناوی مێکەکە لە راپۆرتەکەی مۆساد لە پاریس هاتبوو، سەرۆکی مۆساد هەستی بەلێدانی زەنگێکی ترسناک و بقەکردبوو، ئەگەرچی گومانی ئەوەش دەکرا رەنگە قسەکانی گەشتیارە عێراقییەکە تەنها گفت و قسەیەک بووبێت، یان تەنها سەرەداوێک بێت بۆ دۆزینەوەی تۆرێکی مۆساد، یان فێڵێک بیت، بەڵام مۆساد ئە و نێچیرە ی بە چەورو گرینگ ناساند، ئە وان ئامادە بوون پارە یەکی زۆرو بەرنامەی زۆریش بۆ ئەو دەستکەوتە تەرخان بکەن، وا بەئاسانی فرۆکەکە دێتە بەر دەستیان، بۆیە لە خۆشییاندا بڕوای نەدەکرد. بەڵام بە موستحیلیان دەزانی.

****

سەرۆکی مۆساد لە ماوەی 24 سەعات داوای راپۆرتێکی کردبوو، ویستی بزانی ئە و (جوزیف)ە بناسێت، ویستی بەهۆی کەسە نهێنییەکانی ناو عێراقیان ئەو پیاوە بدۆزنەوە، ژمارەی تەلەفۆنەکەی بزانن، ئە گەر یە کێک لە پیاوەکانی بچێتە دەزگاکانی تە لەفۆنی بە غدا لە ناوو ژمارەی تە لەفۆنەکەی پرسیار بکات، ئە وەیە چەند مە ترسی هە یە، ئەو کارە چەند مە ترسی دەخاتە سەر کەسەکانی خۆیان لەناو بەغدا، دەبێ ئەوەیان داو نەبێت، بۆ ئاشکرابوونی کەسەکانی ناو بە غدایان. هەموولایەک کۆک بوون لە سەرئەوەی بە رنامەیەک دابرێژن مۆساد بەکرێگیراوێک رەوانەی ناو بەغدا بکەن، ئەو کەسە شیاوو لێوەشاوەی ئەو کارە بێت، بتوانی بە چوستی لەناو بەغدا بسوورێتە وە، ئە و کەسەش زانیاری لە سەر شانەکانی مۆساد لە ناو بەغدا نەبێت، ئە گەر گیرا هیچی نە بێت لە لای حکومە تی عێراق بیدرکێنێت، سە رۆکی بە شی چالاکییەکان لە مۆساد وتبووی:

(ئەگەری ئە وە زۆرە ئەوەی دە چێتە بەغدا ئەو کارە ی پێرادەسپێردرێت بکوژرێت، ئەگەری ئاشکرابوون و گیرانی زۆرترە لە سەرکەوتنی لەو چالاکییەدا).

بۆیەش ئامیت وەڵامی داوەتەوەو وتوویەتی:

(دۆزینەوەی نهێنییەکانی فرۆکە ی مێک 21 لە گیانی یە ک یان سە د کە سیش گرینگترە، با ئەو کەسە بکوژرێت).

پاش لێکۆڵینەوەو دەراسەتی زۆر، بڕیاردرابوو کەسێک بەنهێنی رەوانەی بەغدا بکەن، ئەویش ناوی یوسف منصور (منشو)بوو، ئەو پیاوە جوولەکەیەکی ئیسرائیلی بەنەژاد عەرەب بوو، لەسەر پەرەشووتی فڕۆکەوانی مەشقی کردبوو، لە زانکۆی قدس بڕوانامەی لە دەراساتی عەرەبی وەرگرتبوو، لەبەر زمانەکەی و نەژادەکەی ئەو بۆ ئەو چالاکییە شیاوو گونجاوبوو، ئەوەشی باش بوو ئەو هیچ زانیاریشی لە سەر دەزگاکانی مۆساد نەبوو، واتە ئەگەر ئەو گیراش هیچ زانیاری گرینگی پێنەبوو، بۆیە مەترسی لەسەرنەبوو.

لە شوێنێکی دوور لە دەزگای مۆساد لەگەڵ یوسف دانیشتن، ئەو لەگەڵ ئامیت کۆبووە، لەو دانیشتنەدا سەرۆکی مۆساد وردەکاری چالاکییەکی بۆ باسکردبوو، پێیوتبوو ئەو کەسەی تۆ دەیبینیت، عێراقییەکی زۆر دژە حکومەتە، بۆیەش ئێمە لەو چالاکییە ترسمان هەیە، بۆیە مامەلە لەگەڵ کەسێکی لەو شێوەیە مەترسییەکەشی دژوارو ترسناکە ، رەنگە بەیەک تەلەفۆنکردن هەموو شتەکان و بەرنامەکە ئاشکرابێت، چونکە ئەگەری ئەوە هەیە ئەو جۆرە کەسانە خۆیان تەلەفۆن بۆ دەزگاکانی ئەمن بکەن و شکایەتت لێبکەن و بەگرتنت بدات. زۆریش ترسی ناوێت ئێمە هەموو ئاسانکاریتان بۆ دەکەین، خەمی هیچت نەبێت. سەرۆکی مۆساد هەموو ئەگەری ترسناک و پێشهاتەکانی لەپێش کابرا دانابوو، بەلام پێیان وتبوو، ئێمە هەموو بوارو دەروازەکانی ئاشکرابوون و فەشەلبوون وەرناگرین و ناخەینە پێشمان، چونکە ئەگەر ئەو بگیرێت تۆڕیک ئەندامی مۆسادی ناو عێراقمان ئاشکرادەبێت، بەوەش زیانێکی کوشندەمان لێدەکەوێت. بۆیەش لەودەمانەش بیری لە ئەگەرو بواری تریش دەکەینەوە.

****

چەند ساڵێک بوو دەزگای مۆساد لە ئەوروپا کۆمپانیایەکی بۆ دروستکردن و فرۆشتنی کەرەستەی کارەبایی و تەندروستی دروستکردبوو، مەبەست لەو کۆمپانیایەش پەیداکردنی چەندین گرێبەست و بازارو کڕین و فرۆشتن بوو لەگەڵ چەند وڵاتێکی عەرەبی، ساڵانەش سەرمایەو قازانجی باشیشی هەبوو، ئەو پارەیەش بەشی مەسرەفی جاسووسەکانی موخابەراتی ئیسرائیلی دەکرد، کە ئیسرائیل بەناوی کەسایەتی بریتانی و ئەڵمانی و فەرەنسی رەوانەی ناو وڵاتانی عەرەبی دەکردن، هەمووشیان رەگەزنامەی ئەو وڵاتانەشیان هەبوو. لەوێ دەبوونە نوێنەری ئەو کۆمپانیایانە. لەژێر پەردەی ئەو کارانە و لەگەڵ کاری کۆمپانیاکە کاری جاسووسیان بۆ بەرژەوەندی ئیسرائیل دەکرد.

ئامیت ئەوەی چاک دەزانی ئەگەر کە سایەتی راستەقینەی یوسف منصور ئاشکرابووایە زیانی زۆر بەتۆڕەکەی ئەوان لەو وڵاتە دەگەیشت، بەلام سەرکەوتنی ئەویش ماناو سوودی زۆری بۆ ئیسرائیل هەبوو، بەو پلانە دەگەیشتنە نهێنیەکانی فڕۆکەی مێک 21،

ئەوەش بۆ سوپاو دەوڵەتی ئیسرائیل ماناو لێکدانەوەی زۆری دەبوو، بۆیەش ئاسایی بوو ئەگەر ئیسرائیل مغامرەو گیانبازییەک بۆ ئەو دەسکەوتەش بکات. یوسف منصور بۆ ماوەی چوار هەفتە مەشقی زۆری لەسەر کەرەستەی تیشکی ئێکس کرد، چونکە ئەو بەناوی کارمەندی شارەزای ئینگلیزی لەو کەرەستانە سەردانی ئەو وڵاتە دەکات، پاش ئەوەی باش تێگەیشتن کەوا ئەو باش رۆلەکەی دەبینی وەک کارمەندێکی ئەو بوارە سەردانی عێراقی کرد.

یوسف منصور گەیشتە بەغداو لە هوتێلی (بغداد)ی ناودار لە شەقامی (السعدون) دابەزیبوو، لەماوەی یەک هەفتە لە نەخۆشخانەکانی بەغدا سەردانی ئامێرەکانی تیشکی ئێکسی کردبوو، لەگەڵ کارمەندانی وەزارەتی تەندروستی عێراقی دیمانەی کردبوو، ئەویان وەک شارەزایەکی کەرەستەی تەندروستی ناسیبوو، لەو ماوەیەشدا چاوەروانی کردنی تەلەفۆنە گرینگەکەبوو، کە بڕیاربوو بۆ کەسێکی نەناسراو بەناوی جۆزیف بیکات. یوسف رۆژێکیان دوو بەرپرسی وەزارەتی تەندروستی عێراقی بۆ نانخواردنی نیوەرۆ لە رێستورانتی هوتێلێکی گەورەی بەغدا داوەتکردبوو، ئەوەش بۆ ئەوەبوو کەس گومانی هیچی لێنەکات و لەپەنا ئەوەشەوە خۆی چاک بشارێتەوە، لەو دانیشتنەدا داوای یارمەتی لە میوانە عێراقییەکانی کردبوو کەوا بۆ کارێکی تایبەت بە بەرنامەی کارەکەی تەلەفۆنێک بۆ ناو بەغدا دەکات، لەناو رێستورانتەکە یوسف ژمارەی تەلەفۆنە مەترسیدارەکەی لێدابوو، بەلام لەکاتی تەلەفۆنکردنەکە دەستی دەلەرزی، تەلەفۆنەکە وەلام درایەوەو ئەویش پرسیبووی، تۆ (جورزیف)یت، کابرای سەر تەلەفۆنەکە وتبووی:

(نەخێر ... من جوزیف نیم... کێ دەیەوێت...؟).

لە وەڵامدا یوسف وتبووی:

(من برادەرێکی ئەوم لە دەرەوەی وڵاتا هاتووم).

کابرا وتبووی:

(کەواتە من جوزیفم... ئەدی تۆ کێیت...؟).

لە وەڵامدا یوسف وتبووی:

(من ئەو کەسەم کارێکی گەورەمان بەیەکەوە دەبێت، ئەگەر لەگەڵ هاوڕێیەکەت بەیەکەوە دیمانەمان هەبێت، ئەگەر هەرسێکمان بەیەکەوەبووین، ئەوا باس لە بابەتەکە دەکەین).

جوزیف وەڵامی داوەتەوەو وتبووی: (کەواتە تۆ ئەو جنتلمانەی کە هاوڕێیەکەمت

دیبوو).

بەو قسەیە یوسف زۆرتر شلەژابوو، ئەویش وتبووی:

(بەڵێ من ئەو کەسەم).

لە قسەکانی ناو تەلەفۆنەکە بەزووترین کات جوزیف پێشنیارەکەی قبوول کردبوو، کە بەیەکەوە نیوەرۆی بەیانی لە چایخانەیەکی بەغدا دانیشن.

****

لەناو چایخانەکەدا

بۆ بە یانی یوسف لە چایخانەکە دانیشتبوو، لە وێ لە سەر ئاوو ئاگربوو چاوە روانی جوزیفی دەکرد، ئەو داوایکردبوو لەو چایخانە یەکتری ببینن، ئەویش داوای لێکردبوو چە جۆرە جلوبەرگێک لەبەربکات، تا لەناو خەڵکەکەی ناو چایخانەکە ئەو میوانە بێگانەیە بناسێتەوە، کابرا تەمەنی 60 ساڵێک دەبوو، بە قژە سپییەکەو دەموچاوە داکەوتووەکەی دیاربوو، یوسف ئەوەی لەسەربوو هەموو فەرمانەکانی ئەو وەک خۆی جێبەجێ بکات، ئەویش پێش ئەو و زوتر بچێتە ناو چایخانەکە، ئای ئەوەیان کە لەکاری جاسووسیدا کارێکی چەند ترسناک و هە لەیە، لەو دەمانەدا پاڵەوانەکە جوزیفەو خۆی کردیتە پشیلەو یوسفیش تە نها مشکێکە لەناو فاقی چایخانەیەک گیربووە. جاسووسە ئیسرائیلیەکە لەناو چایخانەیەکی بەغدا بەترسەوە دانیشتووەو وادەزانی هە موو چاوە کانی ناو چایخانە کە سەیری ئە و دە کەن، بیری لە وە دەکردەوە ئەو چرکەیەش نە گیرێت، چرکە یەکی تر قۆڵبە ستی دە کەن، کە هەستیکرد وا دە ستێک لە سەر شانیەتی هەستیکرد دەبووریتەوە، پیاوەکە کورسییەکی راکێشایە تەنیشتی و دانیشت، خۆی بەو ناساندو وتبووی، منم جۆزیف!

کابرا کە لەتەنیشتی دانیشتبوو وتبووی:

(شتێکی جوان بوو تۆ هاتوتە ئەو شوێنە).

ئەو قسە یە بە دڵی یوسف خۆش بوو، هە ستی بە وەکرد ئە و پیاوە پیاوی ئە من و مەترسیدار نییە، بۆیە بە میوانەکەی وتبوو:

(ئێمە زۆر بەبایەخ بە کالاکەی لای تۆ دەدین).

جۆزیفیش لە وەڵامدا وتبووی:

(دیارە مەبەستت فرۆکە مێکەکەیە...!).

لەو قسە یە یوسف هە ستی کردبوو دە ترسێت، بە ڵام جوزیف زۆر سە ربەستانە کەوتبووە قسەکردن و وتبووی:

(دەزانن ئەو کالایە زۆر گران لە سەرتان دەوەستێت، پارەیەکی زۆری دە وێت، کاتی زۆری دەوێت! من دڵنیام لەکۆتاییدا سەردەکەوین).

لەودەمانەدا جوزیف ئازایەتی داوەتە بەرخۆی و وەڵامی داوەتەوەو وتوویەتی:

(هاوڕێیەکانم ئەوە نازانن تۆ چۆن بە و چالاکییە هەڵدەستیت، ئەو کارەی پێشتر بە زۆر کەسی تر نە کراوە، تۆ چۆن ئە نجامی دەدەیت، خۆت دەزانی ... داواکارم بەراشکاوییەکەم دڵتەنگ و بێزار نەبیت).

جوزیف بەپێکەنینەوە داوای دیدارێکی تری لە و کردووە، لەوێ بوار باش دە سازێت زۆرتر قسەبکەین، بۆ رۆژی پاشتر لە ناو باخچەیەکی گشتی ناو بە غدا دیمانەیان بوو، دوور لە قەرەباڵغی خەڵکەکە دانیشتن، لەوێ جوزیف سە ربردەی خۆی بۆ یوسفی ئیسرائیلی جاسووس گێراوەتەوە.

جوزیف وتبووی:

(سەرەتا باش بزانە من کە سێکی جوولە کەم، لە ماڵباتێکی دە ستکورتی جوولە کە لەدایکبووم، ئە وە راستیەش ناسیا رەکانیشم نایزانن، لە ناو خێزانێکی کریستیانی دە وڵەمەندو لەتەمەنی دە ساڵییەوە وەک خزمە تکار ژیاوم ، لە و ماوە یەدا وە ک خزمە تکارێک لە گەڵ نهێنیەکەی ناخی خۆی ژیاوم، لە و رۆژەی دەوڵەتی ئیسرائیل دامەزراوە من ئاگادارو چاودێری بووم، من رقی زۆرم لە عەرەبە، بۆیە هیوادارم کارێک بکەم گورزێکی کوشندە لەوان بەوەشێنم، چاوەروانی هە لێکی وابووم، تۆڵە ی خۆم لە وانە بکەمەوە، بە ردەوام چاوە روان بووم ئیسرائیل بەسەریاندا سە رکەوێت، بە ڵام من بە ردەوام خۆم وە ک عێراقییە کی دڵسۆز بۆ وڵاتە کەم نیشانداوە، هەرگیز ئە وان هە ستیان نە کردووە من نە یاری ئە وانم. لەبەر رە وشە کۆمەڵایەتیەکەی خۆم نە متوانیوە خوێندن تەواوبکەم، بۆیە ش خوێندەوارییەکەم باش نە بوو، بەردەوام بەدزی لەگەڵ خێزانە جوولەکەکان دیمانەمان بووە، لەناو بەغدا باسی دەوڵەتەکەمان کردووەو شانازیمان بە گەشەو نماکردنە کەی هاتووە ، بە یەکەوە پەیمانمانداوە هاوکاری

بەردەوامی بین).

(منیر رضا) کوڕی گەورەی ماڵێکی کریستیانی مارونی بوو، لە قوتابخانەکانی عێراق خوێندنی تەواوکردبوو، کەس هەستی نەکردووە ئەو کوڕە کریستیانە، ئەو کوڕە لەگەڵ هاوڕێیە موسلمانەکانی هیچ جیاوازییەکی نەبووە، خۆی لەوان جیانەکردیتەوە، بۆیەش توانیویەتی پلەی ئەفسەری فڕۆکەوانیش وەرگرێت، لە کارەکەشی سەرکەوتوو و یەکەمیش بێت، تا کراوە بە جێگری یەکێک لە دەستەی میکی 21، کە لەو نزیکانەدا دەوڵەتی عێراق لە یەکێتی سۆڤیەتی پەیدایکردبوون، کە باشترین و خێراترین فڕۆکەی شەڕکەربوون لە جیهاندا. ئەو بەردەوام لە ماڵەوەش باسی نوێکاری و سیستەمی فڕۆکەکەی دەکرد، بۆیە هەموولایەکیان هەتا کوڕە خزمەتکارەکەشیان ئەوەی باش دەزانی کە ئەو شارەزای هەموو لایەنێکی ئەو فڕۆکەیەو ئامادەشە بە پارەیەکی باش و بە دابینکردنی ژیانی ماڵەوەو دایکوباوکە پیرەکەی فڕۆکەیەک بفرێنێتە ناو ئیسرائیل و هەموو نهێنیەکانی رادەستی ئیسرائیلییەکان بکات، بەوەش خەونە گەورەکەی ئیسرائیلییەکان بهێنێتە دی، چونکە ئەو چاک دەیزانی ماڵەوەیان بە سامانە زۆرەکەیان زۆر خۆش دەژین.

ئەگەرچی جۆزیف کەسێکی نەخوێندەواربوو، بەڵام زیرەک بوو لە دۆزینەوەی چارەسەری بۆ هەر گرفتێک کە بێتە پێشی، گرێیە توندەکانی باش دەکردەوە، پێش ئەوەی سەفەری پاریس بکات، لەلای برادەرێکی جوولەکە کە بەنهێنی دیمانەیان دەبوو، وتبووی، هەر بگەمە پاریس یەکسەر دەچمە باڵوێزخانەی ئیسرائیل لە پاریس، بۆیە ئەوەشی کردو هەواڵەکەی گەیاندە ئیسرائیلییەکان و چاوەروانی وەڵام و بەرنامە لەسەرخۆییەکەی ئەوان بوو، بەڵام دڵنیابوو کە وا ئیسرائیلیەکان ئەگەر سەرەداوێکیان کەوتەدەست، هەتا کۆتایی لەگەڵ داوەکە دەمیننەوەو داوەکە بەرنادەن. لەوێ یوسف منصور پرسیاری لێکردبوو:

(چی دڵنیامان دەکات کەوا ئەو خێزانە لەگەڵمان راستگۆن و هەتاسەر لەگەڵماندا دەبن).

جوزیف وەڵامی دابۆوەو وتبووی:

(ئەو خێزانە هیچ جۆرە ئینتمایەکیان بۆ ئەو وڵاتەی خۆیان نییە، ئەوانە وا راهاتوون، ئەوانە رێزو گوێرایەلییان تەنها بۆ سامان و پارە هەیەو بەس، بۆ نمونە ئەگەر باسی بەخشینی نیو ملیۆن پاوەندی ئیسترلینیان لەگەڵدا بکەی، بەو پارەیە کارەکە دەکەن و زۆریش ممنون دەبن، سەبارەت بە منیش گەیشتنم بە ئیسرائیل هەموو هیواو داواکاریمە، ئەو تەمەنەی ماومە دەمەوێ لە ئیسرائیل بەسەربەرم، ئەوانیش لەوێ باشترین خەڵاتی شیاوم دەکەن).

****

پلانێکی دارێژراو

پاش هەفتەیەک مانەوەی لە بەغدا، یوسف منصور گەڕاوەتەوە ئەوروپا، لەوێشەوە بەرەو تەلئەبیب سەفەری کردبوو، کە راستەوخۆ سەرۆکی مۆساد مائیر ئامیت خۆی پێشوازیکردبوو، هەموو زانیارییەکانی کە لەبەغدا کۆیکردبوونەوە پێراگەیاندبوو، بە دڵنیاییەوە پێیوتبوو:

(من گەیشتوومەتە قەناعەت کەوا بنەماڵەیەکی دەوڵەمەندی مارۆنی لە بەغدا هەیە، کوڕە گەورەکەیان فڕۆکەوانی مێک 21ە).

پاش دوومانگ یوسف منصور گەڕاوەتەوە بەغدا، دیمانەی لەگەڵ جۆزیف کردووە، داوای لێکردبوو ماڵباتە مارۆنەکە با یەکێکیان بەزووترین کات بە ناوی چارەسەری نەخۆشی رەوانەی سویسرا بکات، لەوێ نوێنەری مۆساد پێشەکی پارەکەیان دەداتێ، لەکۆتایی کارەکەش ئەوان دڵنیادەکاتەوە کەوا نیو ملیۆن پاوندە کەی بە لێنیان پێدراوە وەردەگرن، کە جوزیف لەپێشەکی پارەکە پرسیاری کردبوو یوسف پێیوتبوو، پێشە کییەکە چارەکە ملیۆن پاوندێکە، جوزیف بە یوسفی وتبوو، ئەوەی من دەزانم منیر بە فڕۆکەوە ناچیتە ئیسرائیل هەتا دڵنیانەبێت دایکوباوکی لەوڵات دەرنەچن، باوکیشیان ئەوە ناکات تا پارەیەکی باشی دەسنەکەوێت.

لەبارەگای موخابەراتی ئیسرائیلی بۆ جێبە جێکردنی پلانەکە کۆبوونەوەکان بەردەوام بوو، پارەکەیان بە پارەیەکی زۆر دە زانی، بەڵام کالاکەی بە رامبەریشی شتێکی گەورەو فرە گرینگبوو، دیارە کەوا موخابەراتی ئەمریکیش فڕۆکەکەیان دەویست، بۆیە ئەگەری ئەوە هەبوو ئەوانیش بڕێک لە و پارەیە بدەن، بۆ ئەو مەسەلەیەو بەردەوامی بەرنامەکە، (ئامیت) دیمانەی (ئیسحاق رابین )ی کردبوو، کە ئەوکات سوپاسالاری ئیسرائیل بوو، پاشان هەردووکیان سەرۆک وەزیران (لیڤی ئاشکۆل )یان بینیبوو، ئەویش لە کۆبوونەوەی ناتەواوی

ئەنجومەنی وەزیران رەزامەندی وەرگرتبوو کە بەرنامەکە جێبەجێ بکەن و کارەکە رەزامەندی وەرگیراوە، لەو دیمانەدا باسی دووخاڵی زۆر گرینگ و بەیەخداری کردبوو، کە ئەمانەبوون:

یەکەم:

ئەگەر مۆساد توانی فڕۆکەیەکی مێک 21 لە وڵاتێکی عەرەبی بدزێت، ئەوا دەزگای موخابەراتی ئەمریکی و ئەوروپی شکۆو رێزی زۆری بۆ موخابەراتی ئیسرائیلی دەبێت، بەوەش کۆمەک و پشتیوانییەکانیان لە داهاتوودا زۆرترو گەورەتردەبێت، هاوکارییان بۆ هەموو تۆڕەکانی زۆرتردەبێت.

دووەم:

ئیسرائیل دەبێ کۆشش بکات سوودو رێنمایی پێویست لە دەزگاکانی موخابەراتی ئەمریکی وەرگرێت، چونکە ئەوان تۆڕو بەرنامەی زۆریان لەوڵاتانی عەرەبی و عێراقیش هەیە. دەزگای موخابەرات بەهەموو هێزو تواناوە کەوتەکارکردن، کارەکەو بەرنامەکەیان وا داڕشت کە ئەگەری نسکۆو فەشەلی تێدا نەبێت، کاری زۆریان بۆ سەرکەوتنی چالاکییەکە سازکرد، بۆیەش پێنج دەستەیان بۆ ئەو کارە سازکرد.

دەستەی یەکەمیان پێکهاتبوو لە (یوسف منصور)و شارەزایەکی لاسلکی، دەبووایەو ئەو دەستەیە بەبیانۆی کارکردن لە بەغدا بمیننەوە، بەردەوامیش پەیوەندییان بە بنەماڵەکەی جۆزیفەوە هەبێت.

دەستەیەی دووەمیش چوار کەس دەبوون، دەبوایە ئەوانیش لە بەغدابن، ئەوانە بەنهێنی چاودێری و پاراستنی دەستەی یەکەم دەکەن، بەبێ ئەوەی یوسف منصوریش ئاگاداربێت، دەزگای موخابەراتی ئیسرائیل بۆکسی پۆستەیەکی لە بەغدا بۆ یوسف منصور دابینکردبوو، کە بەو بۆکسە پەیوەندییەکەی بەدەستەی دووەم دەبێت.

دەستەی سێیەمیش سێ کەس بوون، ئاودیوی بە غدا کرابوون، کارو بەرنامەیان ئەوەبوو بەئامێری گوێگرتن و چاودێری ئەلکترۆنی چاودێری ماڵە مارۆنییەکە بکەن، ئیسرائیل ئەو دەزگایەی لە موخابەراتی ئەمریکیەوە بۆ سازکرابوو.

دەستەی چوارەمیش شەش کەس بوون، ئەندامی موخابەراتی سەربازیی بوون، ئەوانە بەهاوکاری موخابەراتی ئێرانی ساڤاک لە کوردستان مانەوە، ئەودەمانەی سەردەمی شاەنشای لە عەرەش لادراوبوو، ئەو پەیوەندی بە ئەمریکاو ئیسرائیل زۆر پتەو ستراتیژی بوو، ئەو دەستەیە دەبووایە لەگەڵ کوردەکان هاوکاربن بۆ دەرچوواندنی بنەماڵە مارۆنییەکە لە عێراق،

دەستەی پێنجه م و ده ستەی شه شەمیش باره گایان له ئەهوازی ناو ئێران بوو، ئەوانیش کاریان ئه وەبوو بنه ماڵەی فڕۆکه وانەکه (منیر رضا) له ئێرانەوه بگەیێنه دەرەوەی ئێران.

هەر بۆ ئه و مەبەستەش تیمێکی دبلۆماسی ره وانەی ئه مریکاو تورکیاش کران، کارو بەرنامەکەشیان ئه وەبوو، ئه وان هاوکارو ئاماده بن ئه گەر فڕۆکه که پێویستی به نیشتنەوەی لەناکاوبوو، ئه وان مشووری راپه راندن و دابینکردنی پێویستی یەکانی بۆ بخۆن. لەبەرئەوەی فڕۆکەکه بۆ گەیشتنی به ناو خاکی ئیسرائیل بەسەر خاکی نه یاراندا دادەهات، بۆیەش هەموو پلانێکیان بۆ سه رکەوتن و به سەلامەتی گه یشتنی فڕۆکه که دانابوو. بۆ جێبه جێکردنی ئه و بەرنامەو سه رکەوتنی مسۆگەری چەندلایەنی هەستیارو دەسرۆیشتوو له ئیسرائیل و ئه مریکاو ئێران و تورکیا بەشدارو هاوکاربوون، لەودەمانەدا شای ئێران سه رپەرشتی هەموو بەرنامەکەی دەکرد، سووربوو له سەرئەوەی یارمه تی و پشتیوانی ئیسرائیل بکات دژ به ولاتانی عه رەبی، لەناو بنتاگۆنه وەش وه زیری به رگری ئه مریکیش یەک به یەک و به وردییەوه چاودێری بەرنامەو پلانەکەی دەکرد.

*****

## سەردانێکی بەنهێنی

کارەکان هەموو لەناو بەغدا نەبوو، راسته جوزیف چوار مانگ خه ریکی رازیکردنی ماڵی باوکی فڕۆکه وانەکەبوو، بۆیه هەستیکردبوو کاری هه مەلایەن و زۆرتری ده وێت،کاتی زۆرتری دەوێت، لەولاشەوه موخابەراتی ئیسرائیلی و ئه مریکی بۆنی به رهەمەکەیان کردبوو، دەیانزانی نیچیره که زۆر چه ورەو لیکاویان بۆی ده هاته خوارێ، بۆیه ش زۆر سه رقاڵ بوون، سەرۆکی موخابه راتی ئیسرائیلی (مائیر ئامیت ) لەسەرداواو پێشنیاری سه رۆک وه زیران، سەردانی واشنتۆنی کردبوو، له وێ لەگەڵ سه رۆکی موخابه راتی ئه مریکی لەسەر سه رکەوتنی بەرنامەو پلانەکەیان دیمانەیان کردبوو، مێوانەکه داوای زۆرتر پشتیوانی و زەمانەتیان کردبوو. لەسەر ئه و داوایه فەرمان به دبلۆماسێکی گه ورەی سه فارەتی ئه مریکی له بەغدا درابوو بەنهێنی لەگەڵ فڕۆکەوانه عێراقییەکه کۆببێتەوەو پشتیوانی خۆیانی بۆ دووپات بکاتەوەو لەترس و دڵەراوکێ دووریبخاتەوە، دبلۆماسه ئەمریکییەکه فڕۆکەوانەکەی دڵنیاکردبۆوەکەوا پلانەکەی سەردەوکەوێت و خێزانەکەشی بەسەلامەتی له عێراق دەردەچێت، پاش ته واوبونی دیمانەکه که زۆر بەنهێنی و له شوێنێکی زۆر دەراسەتکراودا کرابوو، دبلۆماته ئەمریکییەکەی ناو بەغدا گەڕایەوه واشنتۆن نەوەک بزاندرێت و ئاشکرابێت، ئەو لەگەڵ ئەو کەسه دیمانەی بووە.

بۆ تەواوکردنی بەرنامەکەو دارشتنی باشترین پلان، (منیر رضا)ی فڕۆکەوان لەگەڵ ژنێکی نازداری ئەمریکی گەیشتە پاریس، گوایە ئەو کیژە عاشقی بووە وەک دۆستێک سەفەر دەکەن، لەشەوێکی مەستی و رابواردندا فڕۆکە وانەکە ئاگای لەخۆ نامینێت و بە ناهوشیارییەوە گەیاندرابووە ئیسرائیل، لەوێ دیمانەیان لەگەڵ (موردخای)ی سەرۆکی سوپای فڕۆکەوانی بۆ سازکردبوو، ئەوەش بۆ ئەوەبوو کە فشاری توند بخەنە سەر فڕۆکەوانەکە کە نەتوانێ لە فڕاندنی فڕۆکەکە پەشیمان بێتەوە، هەر لەو سەفەرەدا وێنەیان گرتبوو بە ناهوشیارییەوە لە شوێنی ناشیاودا، وێنەیان لەگەڵ گەورە ئەفسەرانی ئیسرائیلی پێگرتبوو، وێنەکان هەموو بەڵگەو هەڕەشەی توندبوون ئەگەر کابرا پەشیمان ببێتەوە چارەنووسەکەی دیارە دەگاتە کێندەرێ و پاشەرۆژی چی دەبێت، ئەگەر ئەو بەڵگانە بگاتە دەسەڵاتداری حکومەتی عێراقی دیارە فڕۆکەوانەکە بەتومەتی خیانەتی مەزن بێگومان لەسێدارە دەدرێت.

لەودەمانەدا فڕۆکەوانەکە لە رەوشێکدابوو کەس ئێرەیی پێنەدەهات، ئەگەر داواکەیان قبوول نەکات، ئەوە یەکسەر لە عێراق رووبەرووی پەتی سێدارە دەبێتەوە، بۆیە بەئاسانی کەوتە ناو باوەشی ئیسرائیل، بڕیاریدا چالاکییە کە بکات، پاش چەند مانگێک بەرنامەکە هاتە واری جێبەجێکردن، یەکێک لە خزمەکانی بە ناوی چارە سەری پزیشکی گەیشتە سویسرا، بۆ فڕۆکەوانە مارۆنییەکە توانرا راپۆرتێکی پزیشکی لە نەخۆشخانەیەکی ناو بەغدای بۆ سازبکەن، کەوا دەبێ بۆ نەشتەرگەرییەک بگاتە لەندەن، بۆیەش دەبێ دایکی لەگەڵ کوڕەکەی وەک یاوەر سەفەربکات، دایکەکەش گەیشتە لەندەن.

ئەندامانی خێزانەکەش ئاسایی بوو بۆ پشودانی کۆتایی هەفتە سەردانی کوردستان بکەن، بە کرێگیراوانی مۆساد توانیان ئەوانیش بگەیێنە ئەهوازی ناو ئێران، لەوێش هیلکۆپتەرێکی ئیسرائیلی چاوەروانی دەکردن، رۆژی 15ی ئوگسستی ساڵی 1966 دەستکرا بە جێبەجێکردنی فراندنی فڕۆکەکە، فڕۆکەوانەکە لە بەیانییەکی زووی ئەو رۆژە لە دەرچوونێکی ئاساییدابوو، فڕۆکەیەکی مێک 21 ی لە ئاسمانی باکووری عێراق لەبندابوو، منیر لە بنکەی ئاسمانی شاری موسڵدا ئەو بە فڕۆکەکەی هەڵسا، هەر ئەوەندەی بەس بوو کە گەیشتە ئاسمان، لەوێ بەبێ ئاگاداری دەزگ‌روسیە چاودێرەکانی ناوچەکە، بەرەو سنووری تورکیان سووڕایەوە، لەوێ دەستەیەک فڕۆکەی ڤانتۆمی ئەمریکی لە پێشوازییدابوون، لە بنکەیەکی نهێنی سەر بە موخابەراتی ئەمریکی نیشتەوە، لەوێ سوتەمەنی پێویستی وەرگرتووە، لەگەڵ دەستەیەکی ڤانتۆمی ئەمریکی دووبارە فڕیوەتەوە، بەسەر دەریای ناوە راستدا بەرەو شوێنە دیارکراوەکەی ناو ئیسرائیل رۆیشتووە.

لەو رۆژەوە دەزگاکانی موخابەراتی ئیسرائیلی و ئەمریکی لەهەموو نهێنیەکانی ئەو فرۆکە سۆڤیەتیە تێگەیشتن، ئەو نهێنیانەی ماوەیەکی زۆر ببووە مەترسی و جێگەی گومانی هەردوولا، بۆیەش ئیسرائیل لە شەڕەکانی داهاتووی لەگەڵ وڵاتانی عەرەبیدا لە 5 ی یونیۆی ساڵی 1967 واتە پاش دە مانگ، گورزی کوشندەیان لە مصرو سوریاو ئوردن وەشاند.

لەرۆژانی 2و 3ی سپتەمبەری ساڵی 2008 لە رۆژنامەی (الجریدة)ی کویتی بڵاوکراوەتەوە.

## ژنە جاسووسێکی مۆساد
## شفرەکانی لەناو لاپەڕەکانی قورئانێک دەشاردەوە.

ئامینە داود المفتی لە عەمان لە ساڵی 1939 لەخانەوادەیەکی شرکسی موسلمان لەدایکبووە، ئە و خێزانە ماوەیەکی زۆربوو کۆچی ئوردنیان کردبوو و لە وێ دە ژیان، باوکی زێرینگرێکی دە وڵەمەندبوو، مامی پلە ی لیوای لە بەلاتی پاشایە تیدا هەبوو، دایکی ژنێکی رۆشنبیربوو، بەچەند زمانی بێگانە قسەیدەکرد، پەیوەندی و هاموشۆی بە ژنە ئورستقراتییەکانی ئوردن گەرم بوو. ئامینە کیژی گچکەی ماڵەوەیان بوو، لەهەموویان زیرەکتربوو، لەبەر زیرەکی و لێهاتووییەکەی ئارە زووی زۆری هە بوو، ئە گەرچی هە موویان لە ماڵەوە زۆر بە دابونەریتی کۆمەڵایەتی باوی چواردە ورەیان بە سترابوونەوە، بە ڵام ئە و حە زی بە کولتووری خۆرهە ڵاتی نەدەکرد، حەزی لەئازادی و کرانەوەو بەرەڵایی دەکرد.

لەساڵی 1957 بۆ خوێندن ئامینە المفتي دەچێتە ڤیینا لەخانووی ژمارە 56 لەشەقامی (یوهان شتراوس ) چەند هە فتەیەک دە مینێتەوە، کە بەشی ناوخۆی بۆ کێژە خوێندکارەکانی لایدەو بێگانە دەکرێتەوە، لەو شوقەیە دەگوازێتەوە. لەبەشی ناوخۆدا لەگەڵ کیژێکی جوهانسبرگ بەناوی (جولی پاتریک ) کە زۆر لە ژیانی ئە وروپادا شارە زادەبێت، د ەکەوێتە یەک ژوورە وە، جولی فێری جگەرە کێشانی دەکات، لە مامەلەکردن لەگەڵ کوڕان ا هوشیارو ئاگاداری دەکاتەوە، باسی ئاووسبوون و منالٚ لە بەرچواندانیشی بۆ دەکات، بۆیە لەکیژانی نزیکدەکاتەوە، تا دووربێت لە ئاژاوەو سە رئێشە لەگەڵ مێینە کانا هە وەس دە کات، بە وەش ئەو کیژە زۆرتر دەچێتەوە ناو کاری ناپە سندو بە درەفتارییەوە، لەو قۆناخە دا لە کۆت و پە یوەندییەکانی خۆرهەڵات دە ربازی دەبێت، ماوەیەکی زۆر لە زانکۆی ڤیینا دەمینێتەوە. لەبواری دەروونناسی تەندروستی بەکالۆریس وەردە گرێت و بە نادڵی و بە بێزارییەوە دەگەڕێتەوە عەمان، بەڵام ئەمجارە رەفتارو هەڵسوکەوتی جیاوازەو بیری بۆ زۆر لایە ن دەفرێت، ژانەکانی ئاوارەیی و کۆتە کان و چاودێرییەکان، بەردەوام دەبێتە مەسەلەی بیر کردنە وەکانی، لە ودەمانەداو لە و رە وشە نامۆییەدا کۆنە دۆست و یە کەم خەونی کوڕە فەڵەستینیەکەی (بسام)ی بە بیردێتەوە، کە ماوەیەک لە گەڵ یە کدا بە ڵێنیان بەیەکدابوو، بە ڵام کە دەزانێت کوڕە کە ژنی هێناوە و ئە وەی لە بەرنامەدا نە ماوە، هە ست بە رووخان دە کات، لە ناو دەریای خە مدا دە تلێتەوە، بۆیە هیچ چارە ی نامینێت و بڕیاردە دات دووبارە بگەڕێتەوە وڵاتی نە مسا، بە بیانۆی تە واوکردنی خوێندن و وە رگرتنی دکتۆرا سە فەری ئەوروپا دەکاتەوەو بە و هیوایە ی هە رگیز جارێکی تر نە گەڕێتەوە خۆرهەڵات. لەتەمەنی 23 ساڵییدا دەگەڕێتەوە نەمساو دەچێتە سەر ئاینی جوولەکە، بەژیانی ئەوروپاو ئازادییەکانی مەست و دڵشادە، بۆ ئەوەش کارکردن و خۆژیاندن دەبێتە بەرنامەی رۆژانەی، دیارە کەوا بایەخ نادات بەو پارە یەی کە مانگانە لە ماڵەوە بۆی دە هات، لە کارگەیەکی دروستکردنی یاری منالان کاردەکات، بە رێکەوت کیژێکی جوولە کە بەناوی (سارا بیراد ) دەناسێت، بە یەکەوە ژیاون و

کاریانکردوه، هه ر به یەکەوه هەوەسی سێکسیشیانکردووه ، له گەڵ ئامینه هاوجووت بوون، بەیەکەوەش خولیای گرووپی هاپیزبوون که لەودەمانه له ئەوروپا زۆر باووبه رچاوبوو، که له خۆرهەڵات ئەو دیاردەیه به (خنافس) دەناسرا.

رۆژێکیان ئەو لەگەڵ دەستەخوشکه جوولەکەکەی دەچێته ماڵی باوکی کیژەکە، لەوێ چاوی به (موشیه)ی برای گەورەی سارا دەکەوێت، خۆی پێراناگیرێت، سیحری نیگای، چوستی جولانەوەو ئاکاره سەرنجراکێشەکەی بەندی دەکات و ئامانی لەبەردەبرێت. کوڕەکه ئەفسەرێکی فرۆکەوان بوو به پلەی نه قیب، حەوت ساڵ له و گەورەتربوو، پیاوێکی هه ست شاعیرانه بوو، شەیدای (موتسارت)و (بیزیه)بوو، حەزی به قژرەشەکان بوو، پێیوتبوو من بۆ جوانی شۆخه کانی خۆرهەڵات دەسوتێم، لەیەکەم ژوواندا لەئامێزی ئەو پیاوه، تامی راستەقینەی زۆری بینیبوو، لەو رۆژەوه هەستیکردبوو تازه تێگەیشتووه هەوەس له گەڵ رەگەزی مێینه دا تامی نیه ، بۆیه وتوویەتی، وا تێگەیشتم پیاوان چه ئارەزوو و خۆشییەکم دەدەنێ. ئەو لەناو گێژاوی ئەڤین چاک نقووم ببوو، بایەخی بەوه نەدابوو ئەو ژنێکی موسلمانەو ئەویش پیاوێکی جوولەکەیه، ئەو تام و خۆشییەکانی دەویست. دیمانەو ژووانه حەرامەکانی زۆربوون، له ئامێزی ئه و پیاوه دڵشادو سەرفرازبوو ، هیچی به بیردا نەدەهات، تەنها رەحەتبوون و خۆشییەکانی ژیان، بۆ وا نه کات کەوتووته ناو کۆمەڵگەیەک بایەخ به پاکیزەیی و خاوێنی نادەن.

ئامینه بەو جۆره 5 ساڵ دەمێنێتەوه، له بیری چووبوو بۆ چی هاتووته ڤیینا، که له خوێندنا سەرنەکەوت موشیه ی دۆستی بڕوانامه یەکی دکتۆرای ساخته ی له نەخۆشییەکانی دەروونناسی بۆ دروستکردبوو، ئەوەش لقێکه له دەروونناسی تەندروستی، به و بڕوانامه یه له سپتەمبەری ساڵی 1966 گەڕاوەتەوه عەمانی ئوردن، لەوێ هەموولایەک بەگەرمی پێشوازییان لێکردبوو، داوایانکردبوو شوو بەئامۆزایەکی بکات، بەڵام ئەو داوای کردبوو، له سەرم بوەستن تا نەخۆشخانەیەکی تایبەتی له عەمان دەکەمەوه، جارێ ئەوەیان گرینگتره، بۆ وەرگرتنی مۆڵەتی کلینکه پزیشکییەکەی لەگەڵ وەکیلی وەزارەتی تایبەت بەو مۆڵەتانه کێشەیان لێ پەیدابوو، بۆیه لەلای وەزیری تەندروستی شکایەتی له وەکیلەکەی کردبوو، ئەویش بایەخی بەداواکەی دابوو، بڕیاریدابوو به زووترین کات له داواو گازاندەکەی بپێچنەوەو لێکۆڵینەوەی شیاوی بۆ بکەن، لەسەرداوای وەزیرەکه لیژنەیەکی یاسایی بۆ پەسندکردنی بڕوانامەکەی ئامینه پێکهێنرابوو، لیژنەکه داواکاربوو با بڕوانامەکەی له ڤیینا دووباره مۆرو پەسند بکاتەوه، ئامینەش چاکی دەزانی بڕوانامەکەی ساختەیەو چاکی دەزانی ئەوەی له ڤیینا لا مەیسەر نابێت، ئەگەر مەسەلەکەشی ئاشکرابێت خراپ و ناشیرین لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی دەکەوێتەوه، بۆیه بەرق و ناڕەزاییەوە، دیسان بەرەو ڤیینا سەر هەڵدەگرێتەوه، دووباره بۆ نازو ئارامی دەگەڕێتەوه ناو باوەشی موشیەی کۆنه دۆستەکەی.

****

کە سوپا عەرەبییەکان لەساڵی 1967 لەشەڕەکە دەشکێن و دووچاری نسکۆیەکی شەرمەزاری دەبنەوە، ئەو زۆرتر رقی لە و رەگەزو نەتەوەی خۆی دە بێتەوە، بە شەرمەوە باسی عەرەببوونی خۆی دەکات، پەشیمانی خۆی لە هەموو شتێک بە عەرەبی گرێبدات رادەگەێنێت، لەژووانی پڕ لە خۆشی و تاوانە وەدا، موشیە داوای دە کات شووی پێبکات، بێ دوودڵی و بەخۆشییەوە رازی دەبێت، ناوەکەی خۆشی دەگۆڕێت بەناوی (ئانی موشیە بیراد).

لەهاوینی ساڵی 1972 ئامینە بانگەوازێکی سە یر لە رۆژنامەیەک دە خوێنێتەوە، لە بانگەوازەکەدا هاتووە، کەوا ئیسرائیل داواکارە جوولەکەکانی ئەوروپا بۆ هاتنە ناو سوپای بەرگری ئیسرائیل بجولێنە وە، هە ر لە بانگەوازەکەشدا ئاماژە بەوەدرابوو کە وا پلە و مووچە ی شیاوو بەرزیان دەدەنێ، ئامینە بە خوێندنەوەی ئەو بانگەوازەو خاڵە هاندەرەکانی زۆر دڵشاددەبێت، زۆر بەگەرمی داوا لە موشیەی مێردی دەکات رازی بێت و بچێتە ئیسرائیل و لە سوپای بەرگرییدا بەشداری بکات، بە مێردەکەی وتبوو:

(دەسکەوتەکان بێجگە لە پارە، پاسپۆرتی ئیسرائیلی و خانوومان لەوێ دەدرێتێ).

ئەو وایدەزانی ئەگەر بە یەکەوە ئەو سەفەرەبکەن، ئەوە بەیەکجاری پشتی دە کاتەوەو ترسی نامینێت، بەڵام مێردەکەی چاوی لەوەبوو لەیەکێک لەکۆمپانیایەکانی فڕۆکەوانی مەدەنی کارێک بدۆزێتەوەو لەوێ وەزیفەیەک پەیدا بکات، بۆیە ئەو وتبووی:

(من چۆن بێمە ئیسرائیل لەودەمانەی وڵاتانی عەرەبی گەرمن لەشەڕکردنی ئەو وڵاتە، خۆیان چە کدارکردووە، خاکێک داگیرکراوە و عە رەبیش سوورن لە سەر وە رگرتنەوەی خاکە داگیراوەکەیان).

بەڵام ژنەکە بەرۆکی مێردەکەی بەرنادات و شەوو رۆژ لەبەری دەخوێنێت، پیاوەکە بەناچاری دە چێتە سەفارەتی ئیسرائیل و داوای رە زامەندییەکان دە کات، لە مانگی نۆڤمبە ری ساڵی 1972 بەیەکەوە بەفڕۆکەیەکی کۆمپانیای (العال)ی ئیسرائیلی دە فڕن، ئامینە کە ئێستا ناوەکەی بوویتە ئانی موشیە لە فڕۆکەخانی (اللد) بەشانازی و بە شکۆوە پێشوازییان لێکردبوو، مێردەکەی بە و پێشوازییە گەرمە لە ژنەکەی زۆر سە رسام دەبێت، دەڵێ دەبێ ژنەکەم یان ستارێکی سینەمایی ئیسرائیلە، یان لە بنەماڵەیەکی دیارو ناسراوی ئوردنە. پاش چەند رۆژێک ئامینە لەلایەن دەزگایەکی ئەمنییەوە داوەتکرا، لەوێ سەدان پرسیاریان لەسەر ژیان و رۆژانە و ماڵەوەیان لە ئوردن لێکردبوو، ناوی خزمەکانی، ناسیارەکانی، چۆن ئەو کوڕە جوولەکەی لە ڤیینا ناسیوە، ئەویش هەمووی بەدرێژی بۆ روون کردبوونە وە، لێیان پرسیبوو، ئێستا ئیسرائیل لەناو ویژدانی تۆ چی دەگەینێت، هەستی بەرامبەرو ئوردن و فەڵەستینیەکان چۆنە، لەوێ پێیوتبوون:

(من رقم لە رێکخراوی رزگاریخوازی فەڵەستین و هەموو رێکخراوە فەڵەستینیەکانیترە، مەلیک حسین لە کاتی خۆی هە لەیەکی زۆر گە ورەی کردبوو لە ئوردن ە ە مووی نە کوشتن، ئەوانە رقیان لە کەمینە شرکسییەکانی ناو ئوردنە ، خانووەکانیان لێ دە ڕماندن، سامانەکانیان دەفەوتاندن، وایاندەزانی مامم کە لەکۆشکی پاشایەتی پلەی لیوای هە بوو، دەستی هە بوو لە کۆمەڵکوژییەکەی ئەیلولی ڕەشی ساڵی 1971، کە دەرحەق بە فەڵەستینیەکان لە ئوردنکرا).

****

موشیە کە پلەی رائیدی فرۆکە وانی لە سوپای ئاسمانی ئیسرائیلی پێدرا، مە شقی ئاسمانی زۆرین پێکرد، لە دەرچوونە ئاسمانییە شەڕکەرەکان چاک شارەزابوو، لەکۆتایی ینایری ساڵی 1973 بە فرۆکەیەکی سکای هۆک بەرەو بە رەی سوری فڕیبوو، لە یەکەم دە رچوونی زانیاری کۆکردنە وە فرۆکەشکێنە کانی سوریا فرۆکە کەیان خستبووە خوارەوە، لە ورۆژەوە ناوی وەک ئەفسەرێکی گومبوو تۆمارکرا، چونکە سوریا وەک ئەفسەرێکی دیل ناوی ئە ویان نەهێناو تەرمەکەشی نە دۆزرایەوە، ئە وان رایانگە یاند کە وا فرۆکە کە بەفرۆکەوانەکەوە لەئاسمانەوە سووتاوە. بەڵام ئامینەی ژنی بە قسەی سورییەکان بڕوای نە کردبوو، چەند رۆژێک بوو هاوارو فیغانە شێتانەی تە واو نە دەبوو، دووچاری هیستریابیبوو، لە کلینکی دکتۆر (کوبات حولیم هستدروت) دەنگیان لێبڕی، لە و رۆژەوە دەنگی نە ماو هێمن بوو، پاش مانگ و نیوێک دە نگی کرایەوە، کەوتەوە قسەکردن، یەکەم قسە وتبووی:

(من گومانم لە بەیانی سورییەکان هەیە، من هە ستدەکەم و دڵنیام کە وا موشیەی مێردم ماوە و نە مردووە، لە ناو پووش و پە لاش خۆی شاردیتە وە، لە ئەشکەوتەکان خۆی ماتکردووە، ئەو فرۆکەوانێکی بەتوانابوو، دەتوانی خۆی دەربازبکات، موشیە نەمردووە!).

ژنەکە بێدەنگ نەبوو، بۆ دۆزینەوەی مێردە فرۆکەوانەکە تەسلیمی واقیع نەبوو، داوای لە دەزگا بەرپرسەکان کردبوو سەردانی لوبنان بکات، لەوێش ئەو دەچێتە دمشق، دەبێ سۆراخی مێردەکەی بکات، پاش چە ندرۆژێک بە پاسپۆرتە ئیسرائیلییەکەی بە رەو ڤیینا فڕیبوو، لە وێ چاوی بە خانەوادەی مێردە جەرگسووتاوەکەی کە وبتوو، چە ندرۆژێک بۆ هە ڵمژینی بۆنی پیاوەکەو ئارامبوونەوە لەلای ئەوان مایەوە، لەبەرئەوەی ماوەیەکی زۆر لە گەڵ موشیە لە قەراخ ڤیینا بە یەکەوە ژیابوون، سە ردانی کۆنە هەوارەکەشی کردبوو، بۆنی پێڵاوو کتێبە کانی کردبوو، قەوانەکان و جلە کانی بۆنکردبوو، سارای کۆنە هاوڕێ و خوشکی مێردەکەی بە زەحمەت توانی رازی بکات لەو شوقە لاچەپە بێتە دەرەوە، بڕیاریدا شوقەکە چۆڵ بکات و بڕوات، بەڵام بۆ ڤیینا نا، بڕیاریدا جانتاکانی بپێچێتە وەو بە رەو فرۆکە خانەو لە وێشەوە دووبارە بفڕێتەوە، پاسپۆرتە

ئوردنییەکەی دەرهێنایەوەو سەفەریکردووە، یەکەم هەواری لە فرۆکەخانەی بەیروت دابەزیبوو، لەیەکێک لە هوتێلەکانی بەیروت دادەبەزێت، لەکاتی سووڕانەوەکانیدا ژنێکی لوبنانی بە رەگەز ئوردنی بە ناوی (خدیجە زهران)ی لە بوتیکێکی جلوبەرگ فرۆشتن دە ناسێت، لە وێ چە ند پارچە یەکی بە نرخی گران لێکڕیبوو، بە و شێوە یە سەرنجی بە ڕێوەبەری ئە و بوتیکە ی بۆ لای خۆی راکێشابوو.

خدیجە لەوێ شوقە یەکی لە گەڕەکی (عین الرمانة) بۆ ئامینە دەستنیشانکردبوو، لەو شوقەوە ئامینە دەستیکردبوو بە سۆراخی مێردە بێسەروشوێنەکەی، چە ند سەفەری نێوان دمشق و بەیروتی کردبوو، ، بەڵام هیچی دەست نەکەوتبوو، لەکۆششەکانی فەشەڵی هێنابوو، کە زانیبوو بەرهەمی نابێت، دەستبەتاڵ و دڵبەخەم و بەژانەوە گەڕاوەتەوە ڤیینا.

لە ژوورەکەی خۆی لە ڤیینا کەوتبووە داوی جاسووسیە ت، بەیانیەکیان بە زەنگی تەلەفۆنیک بەئاگایان هێنابوو، لە تەلئەبیبەوە تەلەفۆنیان بۆ کردبوو، بۆ بە یانی سێ پیاو بە ناوی ئەفسەری ئیسرائیل میوانی ببوون، پێیانوتبوو، دەبێ تۆ بگەڕێتەوە ئیسرائیل سۆراخی میراتی پیاوە کوژراوەکەت بکەیت، تا لە گەڵ خانەوادەی مێردەکەوت و دە زگا رەسمییەکان لە ڤیینا یان لە ئیسرائیل کێشە ت بۆ دروست نە بێت، دە بێ خۆت راستە وخۆ سە رپەرشتی ئە و مە سەلەیە بکەیت، چونکە میراتەکەو پارەی قە رەبوویەکەی دەگاتە نزیکەی نیو ملیۆن دۆلارو شوقە یەکی باش و چەند زەمانەتێکی پاراستنی زۆر باڵاو چاودێریشی لە گەڵدایە، بۆیە داواکاردەبن ئانی یان ئامینە هاوکاریان بکات تا کارەکانی بۆ راپەڕێنن، ئەویش بێ دوودڵی و گومان رازی دەبێت، ئەو ژنە بەپێوانەی موخابە رات ئە و لە جۆری نایاب و پلە ی پێشە وە دەژمێردرا، بە پارەو سامان هەڵنەدەسەنگێندرا، ئەو ژنە عەرەبە نیشتیمان و مێردی لە کیسچووە، رەوشی دە روونی ئاڵۆزو پەشێوکاوەو دڵی مشت ترس و دڵە راوکێیە، لە ناو ئیسرائیل نە بێ هیچ نە واو هە وارێک نادۆزێتەوە، کە مۆکردن و دە ستەمۆکردنی زۆر پێویستە ، تە نها بە چاندنی کە مێ رق دژ بە عەرەب کە مێردیان کوشتووە، ئەو پیاوەی بۆ ئەو ئارامی و ژیان بوو، دەتوانن دەستەمۆی بکەن، هەر بەوەشە کە دەتوانێت لەپاش مێردەکەی ئەو بژیتەوە.

ئیسرائیل دە ستنیشانکردنەکەی راست دە رچوو، ئە و ژنە سێ رە گەزنامەی هەبوو، پاسپۆرتی ئوردنی و نە مساوی و ئیسرائیلی هە بوو، بۆیە زۆر بە رنامەو سازکردن و شاردنە وەو گۆڕینی کەسایەتی بۆیان کورت کردبۆوە، بەو شێوەیە دەتوانن ئەو بەئاسانی دژی نەتەوەکەیو وڵاتەکەی بەکاربهێنن. ئەو ژنە داکەوتبوو، شلەژابوو، لاوازو بێهیوابوو، ئە و ئایین و وڵاتە کەی هەرزانفرۆش کردبوو، شە رەفیشی نە مابوو، جلی داپۆشراوی شە رەف و حە رەمی داکە نیبوو، بۆیەش بۆ سێ ئەفسەرە میوانەکەی کە لە مۆسادەوە میوانی بوون، ئاسان و سانابوو رازی بکەن، دەیانتوانی لە ژێی لاوازییەکەی و رقی زۆری بۆ عە رەب و فە ڵەستینیەکان کام ئاوازیان بویت پێی بە ژەنن، چونکە ئەوەی لە دەزگایەکی موخابە رات کاربکات پێویستی بە سۆزو دڵسوتان و ویژدان ناکات، کەسی دڵرەقیان دەوێت، کەسی لاوازو رووخاویان مەبەستە.

لەو رەوشەوە ئامینە تەسلیمی سێ ئەفسەرەکەبوو، سوکانی ئاراستەکردنی خۆی داوەتە دەست سێ ئەفسەرەکە، لە شوقەکەی خۆیدا لە ڤیینا مانگێک و چوار رۆژ مەشقیان پێکردبوو، زۆر کارە سەرەتاییەکانی جاسووسیان فێرکرد بوو، فێری وێنە گرتن و شوفرە و وەرگرتنی هەواڵەکان و چۆنیەتی ڕێزگرتنی هەستی ئەمنی و ناسینی جۆرەکانی چەک و تەقەمەنییان کردبوو، فێری شووشتنەوەی فیلمی وێنەگرتنیانکردبوو، دوورکەوتنەوەو خۆشاردنەوە لە چاودێری و بەکارهێنانی تەقاندنی دەمانچەیان فێرکردبوو، لە ئیسرائیلەوە شارەزاییەکیان لە بەهێزکردنی بیرەوەری و هەڵگرتنی زانیاری و کۆکردنەوەو لەبەرکردنی ژمارەو وتنەوەیان بۆ هێنابوو. لەو مەشقانەدا فیلمی سینەماییان نیشاندابوو، پاشان پرسیاری وردو چاوەڕواننەکراویان لێکردبوو، وەک لێیان پرسیبوو، لەسەر مێزی خوانەکە چەند قاپ ڕێکرابوو، ڕەنگی پەردەکانی ژوورەکە چی بوو، لە ژوورەکەدا چەند لەمپا بەئاسمانەوە شۆڕکرابوونەوە، ئەو قاڵدرمەیەی لە ساڵۆنەکە سەردەکەوت چەند پایەبوو. ئانی موشیە لەو خولەدا سەردەکەوت و قۆناخەکەی بەجوانی و بەزیرەکی بڕیبوو، لەو رۆژەوە ئەو ژنە ئامادەبوو، دەیتوانی رووبەرووی دوژمنەکەی ببێتەوەو بۆ تۆڵەکردنەوە سازو ئامادەبوو، ئامادەبوو موستحیل بکات بۆ تۆڵەی مێردەکەی، ئەوەی لەنزیک جۆلان و خوارووی لوبنان بێسەروشوێن بوو، ئەو ژنە کەوتە کارکردن، مۆساد بەرنامەیان بۆ دانا سۆراخی سەرکردایەتی بزاڤی رزگاریخوازی فەلەستینیەکان بکات، ئەوانەی شەوورۆژ کۆمەڵگای ئیسرائیلیان هەراسانکردووە، بەردەوام چالاکی گیانفیداییان ئەنجامدەدا، تەقینەوەو هێرشی کوشندەو زیان بە موڵکەو شارەکانیان دەگەیێنن، دەبووایە بەدوای بوارو ڕێگای دەربازبوونی فەلەستینییەکان بۆ ناو خاکی ئیسرائیل بگەڕێت، دەروازەکان بدۆزێتەوە، خاڵە چاودێرییەکان دەسنیشان بکات، بزانێت ئەو فیدائیانە لەکێ مەشق دەکەن، چەکەکانیان چە جۆرە، ژمارەیان چەندە، چەند بەرگەی بەرهەڵستی و پاشقۆڵ لێگرتن دەکەن، کۆگاکانی چەک و تەقەمەنی و ئازووخەیان لەکێ دەشارنەوە.

****

ئامینە یان (ئانی موشیە) لەجوانترین گەڕەکی بەیروت لەیەکێک لە باڵەخانەکانی (الروشة) شوقەیەکی بەکرێگرتبوو، لە باڵکۆنی شوقەکەیەوە ئاسۆی پانی دەریای لێوە دیاربوو، ماڵەکەی ئەو لە قاوەخانە ناودارەکەی بەیروت (الدولشی فیتا) نزیک بوو، ئەو قاوەخانەیە شوێنی بەقەدەرو بەرچاوی هونەرمەندان و رووناکبیران و گەشتیاران و جاسووسان بوو. ئامینە رۆژانە لە پچرانی هێڵی تەلەفۆنەکەی زۆر بێزاربوو، بۆیە سەردانی هاورێیەکەی (خديجة زهران)ی کردبوو تا چارەسەرییەکی بۆ تەلەفۆنەکەی بۆ بدۆزێتەوە. خدیجەش یەکسەر تەلەفۆنی بۆ (مانویک عساف)ی کارمەند لە دائیرەی تەلەفۆنەکان کردبوو، ئەویش بۆ بەیانی هەر زوو سەردانی شوقەکەی ئامینەی کردبوو، پێیو تبوو، ئەو ناوچەیە هەروایە بەردەوام تۆڕی تەلەفۆنەکانیان دەپسێت و پەکیان دەوکەوێت، بۆیەش کاری نوێکردنەوەیان لەسەرەو چارەسەریان دەکەن، منیش کۆششدەکەم بەهەموو جۆرێک چاومان لە تۆ بیت، ئامینەش بە ناوی بەخشیش و خەمخواردن لە کێشەکەی 50 لیرەی دەداتێ، ئەوەشمان لەبیر نەچێت، ئەو لەگەڵیشی دەنووێت و جەستەشی دەداتێ، ئەو ژنە جاسووسە هەستیکردبوو نێچیرەکە خۆی بەئاسانی هاتووتە ناو دەستی، دەتوانی بەهۆی ئەو ژمارەی تەلەفۆنی سەرکردەکانی فەلەستینی وەرگرێت، ناونیشانەکانیان بدۆزێتەوە.

دیارە کەوا پیاوەکەش لەبەرامبەر ئەو ژنە جوانەو ئەو جەستە پڕ شەهوەتە هەموو شتێکی بۆ دەکات، کابرا بەیەکجاری لەپێش ژنەکە چۆکی شکاو هۆشی نەماو گەرمارۆدراو بۆی نەکرا لەدەستی دەربازی بێت، یان بیر لە هەڵاتن بکاتەوە، تازە زەحمەتە دەست لەو مێینە نازدارە بەربدات، لەولاشەوە ژنەکە وەک جاسووسێکی کارامە و لێزان هەڵسوکەوتی کردووە، لەگەڵ رووخان و رووچونەکانیدا ژنەکە لە ئامێزی پیاوەکە تاوایەوە، کاری ژنە جاسووسەکان وایە، خۆی وا نیشاندەدات، ئەو زۆر زۆر رەحەتە، زۆر شەیدایەو خۆشییەکی بێسنوور وەردەگرێت، دیارە لەلای ئەوان سێکس کالایەکە بۆ وەسیلەنەک بۆ مەبەست، بەڵام ئامینە تووشی شۆک هاتبوو کە تێگەیشتبوو پیاوە دۆستەکەی ئەوانەی ئەو دەیەوێت دەستی بکەوێت بەو چارەسەر ناکرێن، ئەو مەرامەکانی ناپێکێت، ئەو فەرمانبەرێکی گچکەیەو بڕیاری پێنادرێت، بۆیە هەستی بەشەرمەزاری و نسکۆکردبوو، بەڵام دڵی خۆی داوە تەوەو خۆی ئیقناعکردووە کەوا ئەوەیان یەکەم ئەزموونیەتی، با لە و ئەزموونە سەرکەوتوونەبێت، گرینگ نییە، کابرا دە یویست لەبەرامبەر ژنە ئاگرینەکە بەوەفابێت، ئەوەی لەدەستی بێت بۆی بکات، بەڵام کارەکان هەموو لەبن دەستی (مارون الحایک)ی بەرپرسەکەی بوو، بۆیەش ئەو بەراستی داواکەی پێراگەیاندبوو، بەیەکەوە لەشوقەکەی خۆی سەردانی ئامینەیان کردبوو.

الحایک کابرایەکی مێبازو کەیفچی بوو، بەردەوام خەریکی تێرکردنی هەوەسەکانی بوو، بەردەوام گوێی لە تەلەفۆنی ژنانی شارەکە دەگرت و سۆراخی هەواڵەکانی دەکردن، وێلی ژنی هەوەسبازو نوێ بوو، ئامینە کە ئەو پیاوەی بینیبوو، زانی هەموو زانیارییەکان بەو کەسە بەئاسانی پەیدادەکات، زوو جەستەی تەسلیمی ئەو پیاوەکردو لەگەڵی نووست، الحایک وا بۆی شێت و شەیدابوو هەموو پرسیارەکانی وەڵام دەدایەوە، توانی ژمارەی تەلەفۆنی هەموو سەرکردە فەڵەستینیەکانی لە بەیروت بۆ بپەیدابکات، ناونیشانی هەمووانی لە گەڕەکی (الریحانة) کەوتە بن دەست، بە هۆی پۆستی تایبەتی مۆسادەوە ئامینە راپۆرتی بە زانیاری زۆرەوە لە بەیروتەوە رەوانەی مۆسادی دەکرد، لەبەررۆشنایی ئەو راپۆرتانەوە مۆساد رێنمایی و داوای تری مەبەست بوو، دەیویست ناونیشان و ئاکاری شێوەو ژمارەی تەلەفۆنی نوێنەرە فەڵەستینییەکان لە ئەوروپا وەرگرێت، دیارە ئەوەشی تەنها لە نووسینگەی تایبەتی یاسر عەرەفاتەوە دەست دەکەوت، یان بەهۆی سەرۆکی دەزگای موخابەراتەکەیان (علي حسن سلامة)ەوە دەبێت، ئەوەی (گۆلدا مائیر) ناوی نابوو، ئەمیرە سوورەکە، چونکە ئەو پاڵەوانی کوشتنی 11 ئیسرائیلییەکەبوو کە لە شاری میونشینی ئەڵمانیا روویدابوو.

****

## علي حسن سلامة

لەمانگی یونیوی ساڵی 1973 ژیان لە بەیروت زۆر خۆش بوو ، لە رۆژانی کۆتایی هەفتەدا کیژە جوانەکان بە ناو هوتێلە گەشتیارەکان وە ردەبوون، ئە و نازدارانە لە یانەکان سەربەستانە دەسوورِانەوە، لە گەرماوەکان و مە لەوانگاکان خۆیان جوانترو ناسکتر دە نووان، بەخۆشییەوە لەو گۆرِەپانانەدا یاری گۆلفیان دەکردو بە یاری تنس سەرقاڵ و کامەران دەبوون، شەوانە تا بە یانی لە دیسکۆکان سە مایان دە کرد، لە پێشبرکێیەکانی بە حوشتر ژنی شۆخ بەرچاودەکەوتن، لە ناو ئە و رە وشە جوانەو مە ستانەدا (علي حسن سلامة )ش جاروباریش بە یاوەری (فتحي عرفات)ی برای (یاسر عرفات)و سەرۆکی کۆمەڵەی مانگی سووری فە لەستینی بەشداردەبوو، کە (جۆرجینا رزق ) بە شاهی جوانی لوبنان و جیهان هە ڵبژێردرا، سلامة لە رووداوو دەنگۆیەکی مەزن ئەو کیژە جوانەی بۆ خۆی فرِاندو مارەیکردو بووە هاوسەری، بۆیەش کیژانی ناو لوبنان زۆر شەیدای بوون، بە ڵام ئە و لە جوانی تێرببوو، جوانترین کیژی لوبنانی هەڵبژاردبوو، بۆیە پێویستی بە نازو جوانی تر نە مابوو. دیارە ئەو پیاوە لەلایەن موخابە راتی ئیسرائیلییەوە چاودێری وردی دە کرا، بە ڵام شێوە یان نە دەزانی، وێنە ی ئە ویان نە بوو، بۆیە ش زۆرجار کۆشش بۆ کوشتنی سلامة فەشەلی دەهێناو نەیاندەتوانی بیپێکن.

ئەوەی لە مۆسادە وە لە ئامینە داواکرابوو ئە و بگاتە بنکەو حە شارگەکەی ئە و، لە وێ زانیاری لە سەر زۆرترین ئە ندامانی سە رکردایەتی و نمایندە کانی موخابە راتی فە لەستینی لە ئەورووپایان بۆ وە رگرێت، بۆیە ش (سلامة) کەسێک و نێچیرێکی زۆر گرینگ بوو، چونکە ئەو کەسی دە ستەراستی (یاسر عرفات )بوو، بە رپرسی پاسە وانەکانی بوو، پاشان کرابووە سەرۆکی ئەمن و موخابە راتی سە ر بە رێکخراوی (الفتح)و هێزە کانی پاسە وانی ناوخۆ، کە ناوەکەیان گۆرِیبوو بە هێزی 17، ئەوە هێزەیە کە عرفات بەناوی قەیسەری رۆمای کۆنی کردبوون.

گەیشتن بە لیستی ناوە کانی سە رکردایەتی فە لەستینی و ئە ندامە دیارەکانی رێکخراوەکەیان لە ئەوروپا کارو چالاکییە کی گرینگ بوو، پێویستیان بە وە هەبوو، تا بتوانن پەیوەندییەکانیان لە ناو بە یروت لە یەک بپچرێنن، لە یەکتریان داببرِن، لە ئەورووپاو جیهانیان بکەنەوە. لێرە پرسیارەکە ئەوەیە بۆچی لەجیاتی کوشتنیان، دە یانەوێت دەست بەسەر دۆسیەو بەڵگەنامەکانیان دابگرن؟ کارو راسپاردەکەی ئامینە لە بەیروت ئەستەم و زەحمەت بوو، ئەگەر ئەوەی پێ جێبە جێکرا ئە وە دەبێ ئیسرائیل چە ند پە یکەری رێزو شکۆی بۆ دابنێت . لە

دیمانەیەکی بەسۆزدا لەگەڵ (الحایک) لەشوقەکەی خۆی، ئامینە پرسیاری (عرفات)و (آبو آیاد)و کەسانی تری لێکردبوو ، ئەویش لە وەڵامی ئامینەدا الحایک وتبووی:

(من، ئەوانە کەسیان ناناسم!).

پاش ئەو رۆژە ش بەردەوام الحایک تامی شیرینی لە جەستەی سۆزداری ئامینە وەردەگرت، بەڵام ئەو کە زانیبووی الحایک، کەسێکی وەک سلامة دەناسێت و دەزانی دەچێتە کام هوتێلیش، پارەی بۆ هەڵدەرێژێت و مەسرەفی زۆری لێدەکات، بۆیە بەیەکەوە چەندجار دەچنە هوتێلی (کۆرال بیتش) تا پیاوە سامناکەکەی موخابەراتی فەڵەستینی بناسێت و رووبەروو ببینێت، ئەوەش ماوەیەکی زۆری خایاند، کابرا شەوانە لەگەڵ ئەو ژنە جاسووسە دەنووێت و پارەی دەخوات بەبێ ئەوەی سلامة ببینن، ژنە کە هەست بە نسکۆو شکان دەکات، بۆیە بیردەکاتەوە بە نائومێدی بەیروت جێبهێڵێت بەرەو ئیسرائیل سەفەربکات، بەڵام لە ناکاو بیرۆکەیەکی بۆ هاتبوو، دە بووایە ئەوەشیان زۆر خێرا جێبەجێی بکات، بۆیە شوقەکەی بۆ (کورنیش المزرعة ) گواستووتەوە شوێنێکی ناو گەڕەکێکی میللی، کە خەڵکی ئوردوگاکانی فەڵەستینی لە بەیروت زۆر رووی تێدەکەن، زوو لەوێ پەرستیارێکی فەلەستینی بەناوی (شمیسة) دەناسێت، کە لە کلینکی تەندروستی (صامد) لە خیوەتگای (صبرا) کاریدەکرد، بەو نێچیرە زۆر دڵی خۆش بوو، شمیسة بە بەرێوەبەری کلینکەکەی ناساندبوو، لەوێ بەرێوەبەرەکە وتبووی:

(ئێمە دکتۆری بێگانەمان زۆرە کە بەخۆرایی کارو خزمەتگوزاری بەو ئاوارە فەڵەستینیان دەکەن).

بۆیە داواش لەو دەکات لەلای ئەوان کاربکات، ئەویش رەزامەندییان پێدەڵێت، بڕوانامە ساختەکەیان دەداتێ، ئەویش پێیدەڵێت، چاوەروان بکە تا لە سەرووی خۆمەوە رەزامەندیم بۆ دێتەوە، لەکۆتاییدا ژنە جاسووسەکە دەگاتە خەونەکەی خۆی و دەستی لە فەڵەستینییەکان گیردەبێت و ئاسان دەچێتە ناویان، لەوێیەوە قۆناخی فراوان و گرینگی جاسووسییەکەی دەست پێدەکات.

****

لە رۆژی 22 ی یولیوی ساڵی 1973 ئامینە لە شوقەکەی خۆیدابوو، مارون الحایک تەلەفۆنی بۆ کردبوو، پاش ئەوەی چەند وشەیەکی بە گوێیدا چرپاندبوو سەعاتەکەی داخستبۆوەو یەکسەر تەلەفزیۆنەکەی پێکردبوو، بێژەرەکە هەواڵی گرتنی گرۆپێکی شەش کەسی

ئەندام لە مۆسادی لە ئۆسلۆ بەتومەتی کوشتنی (گرسۆن)ێکی مەغریبی بە گوللە بڵاودەکردەوە، کە یەکێکیان ژن بوو، الحایک و ئامینە وایانزانیبوو، ئەوانە ئەندامی تیمێکن بە ناوی (الرمح ــ تیر) کە لە ئیسرائیلەوە بۆ کوشتنی علي حسن سلامة ڕۆیشتوون، بۆیە بەو هە واڵە زۆر شپرزەببوون، ئەو بیری لە وە کردەوە، ئەوان چۆن پلان بۆ کوشتنی ئەو دەکەن، لەولاشەوە من رادەسپێرن سۆراخی بکە م، کە واتە سۆراخەکەی منیان بۆ چییە ، هە ستی کرد گە مەکە لە بیرکردنەوەی ئە و گە ورەترو دژوارترە ، پرۆسە کانی موخابە رات و سیاسییە کان زۆر ئاڵۆزو فرەرەهەندن ، ئەو لەپاش کوژرانی مێردەکەی یەکەمجاربوو هەستی بە خۆشی ژیان کردبوو، بۆ بەیانی لە گەڵ مارۆن الحا یک چوونە هوتێلی کۆرال بیتش، بە کلۆفەوە شەیدای دۆزینە وەی سلامةبوو، لەناکاو الحایک ڕووی ئامینەی وەرگێرایە لای ئەستێلەکەی مەلەوانی و پێیووتبوو:

(ها ... ها ئەوەیە علي حسن سلامة، سەیری کە ئەوە خۆیەتی!).

بەوە دیمەنە ئامینە دووچاری شۆک و سە رسوورمان هاتبوو. لەودەمانە تەمەنی سلامة تەنها 33 ساڵ بوو، وە ک کەسێکی سپۆرت و قۆز دیاربوو، تازە شاهی جوانانی جیهان جورجینا رزقی ناسیبوو، کیژە کەش تەمەنی 21 ساڵ بوو، لە خانەوادەی ماڵی کریستیانە کانی بەیروت بوو، دایکی هەنگاری و باوکی لوبنانی بوو، لە تەمەنی 16 ساڵیدا وەک شاهی جوانانی لوبنان هەڵبژێردرابوو، پاش دوو ساڵ جوانیی کەی لەسەر ئاستی هە موو جیهان دە نگی دایەوەو بە شاهی جیهانیش هەڵبژێردرا، ئەو تاقە کیژی وڵاتانی عەرەبی بوو بەشداری پێشبڕکێی (میامی بیتش) کردبوو، بەوەش خاتوو رزق بووە ، خاتوونێکی ناسراو لە هەموو جیهان، هە موو پیاوێک خەونی پێوە دەبینی، کیژە کە بە قژە رەشە درێژەکەو بەژنە زراڤەکەو دوو چاوە کەسکەکانی و جەستە سیحراوییەکەی و جوانیە کەی، هەموولایەکی سەرسامکردبوو. ئەو دەمانە (جیمی کارتر) حاکمی وڵایە تی جورجینابوو، پێش ئە وەی ببێتە سەرۆکی وڵایە تە یەکگرتووەکانی ئە مریکا، شانازی بەوەکردبوو کە لەگەڵ ئەودا بە فستانە رەشەکەی وەک شاهی جوانانی جیهان وێنە ی دەربچێت، ئەو نازدارەی جیهان، بە ماسولکەکانی گەنجێکی وەرزشوانی وەک سلامة سە رسام ببوو، ئەویش دڵی بۆی لێدەدا.

ئامینە لەدوورەوە چاودێری سلامةی لەحەوزەکانی مەلەوانی دەکرد، وێنەی ئەو کارەی لە خەیاڵی خۆیدا رە سمکردبوو. سەردانی بۆ هوتیلی کۆرال بانیتش زۆرترکردبوو، هە فتانەو بەردەوام دووجار دەچووە ئەو هوتێلە، لەوێش سلامة ئەوی دەبینی، بەبزەو جوانیە ئاساییەکەی مەست ببوو. تا ڕۆژێکیان کە گەیشتووتە ناو هوتێلەکە لەجیاتی ئەوەی بچێتە ژوورەکەی خۆی، لەسەر خوانەکەی ئامینە لای دابوو، دەستی لەسەر کورسییەکی بەرامبەری دانابوو، کەمێ پشتی نەوی کردبوو، هە ر بە پێوە چەند پرسیارێکی لێکردبوو، کە مێک بە پێوە وەستابوو، بەڵام پاشان کورسیەکەی ڕاکێشابوو، لە بەرامبەری بۆ ماوە ی نیو سە عاێک دانیشتبوو، بەو دانیشتنە هەموو دەرگا داخراوەکان بۆ ئامینە کرانەوەو بووە جێگەی سپوای فە لەستینیەکان، پەیوەندی بەهەموو

سەرکردە فەڵەستینیەکان پە یداکرد، تا گە یشتە یاسر عرفاتیش، تا وای لێهات گە یشتە ناو ریزەکانی رێکخراوە کانی فە ڵەستینی، ئە و برینە کانی سارێژدە کردن و ورە ی بە رزدەکردنەوەو هانای دە دان بۆ خە باتی بە ردەوام، بە ردەوام سە ردانی خیوە تگەی فەڵەستینیەکانی لە باشووردەکرد، لە گەڵ تیمە خۆبەختکەرەکان کاریدە کرد، بواری درابوو بچێتە ناوچە سنووردارەکانیش، چاوەکانی کردبوو کامیرا، چە ندین وێنەی دە گرت و هە مووی هەڵدەگرتن، گوێیەکانی هەموو دەنگەکانی وەردەگرت، هوش و بیری وە ک هێزو ئامێرێکی مە زنی لێهاتبوو، بەرگەی زۆرترین زانیاری دە گرت، وا راهاتبوو دە یتوانی هە موو دیمە ن و زانیارییە کان کۆبکاتەوە، هەمووشیان بکاتە نەخشەو بەوردی دووبارە دروستیان بکاتەوە، لەناو لەبەرکردن و ناسیرەوەی شوێنە کان نمونە ی نە بوو، بە ئاسانی جۆرو ناوی چە کەکان فێربوو، دە یزانی چۆن مەشقدەکەن و بە کام چە ک مە شقدەکەن، کۆششی بە ردەوام بوو هە موو زانیارییە پێویست و گرینگەکان بۆ ئیسرائیلیەکان لە ناو لوبنان کۆبکاتە وە، لە نووسینگەی خۆیدا سێجار سەردانی یاسر عرفاتی کردبوو، لە وێ باسی کە موکوڕی و گە ندەڵی و گرفتە کانی باشوری لوبنانی بۆ کردبوو، سەرۆک عرفاتیش بایەخی بە پێشنیارو راسپاردەکانی دابوو، بەوردی گوێ لە قسەکانی شلکردبوو، لە سەر داواو پێشنیارە کانیشی زۆر گۆڕان و فە رمانیشی دە رکردبوو، هە لەکانی هێزەکانی بە رگری لە باشووری بۆ باسکردبوو، بۆیە ش نووسینگە کەی سە رۆک بۆ ئامینە لەسەرپشت بوو، بەردەوام دەیتوانی سەردانی بکات.

****

رۆژێکیان ئامینە لە قاوەخانەی (الدولشی فیتا ) لەسەر کە ناری (الروشة)ی کە پێچەکانی زۆر سیحراویین دانیشتبوو، قاوە ی دە خواردەوە، لە بەردەم ئە و جێبێکی سە ربازی راوەستاو سێ سە رباز بەپەلە لە ئوتومبێلەکە دابەزین، سێ پیاوە کە فەڵەستینی بوون، بە خێرایی هاتنە لای ئامینە، داوایان لیکرد لەگەڵیان بێتە خیوەتگەی (شاتیلا)ی ئاوارەکانی فەڵەستین، لەوێ تیماری چەند برینداریکی فەڵەستینیان بۆ بکات، کە لەئەنجامی بۆمبابارانی فرۆکەکانی ئیسرائیل برینداربوون. کە لەنەخۆشخانەکە تەواوبوو، بۆ سە فەرکردنی بۆ ڤیینا داوایکرد بواری بدە ن بڕوات، پێیوتبوون، سەفەردەکەم بۆ ناو تۆمارکردنە لە یەکێک لە کۆمەڵەکانی منالپاریزی دەوڵی! لەوێ ئامینە بەبێ ئەوەی گوێ بداتە سادەترین پرنسیپی نهێنی پاراستنی جاسووسیەت، بەئاشکرا دەیووت، من تۆڵەی کوشتنی موشیەی مێردەکەم لەو فەڵەستینیانە دەکەمەوە، رۆژانەو بێرەحمانە تۆڵەی خۆم لەو بکوژانە دەکەمەوە، زۆر باسی پرۆسەی کارەکانی خۆی لە بەیروت بۆ کردبوون، بە پاسپۆرتە ئیسرائیلییەکەی لەگەڵ کۆڵێ خەمەوە سەفەری تەلئەبیبی کردبوو، ئەو لە ئیسرائیل برادەرو هاورێی نەبوو، تەنها لەناو مۆسادا چەند کەسێکی دەناسی، بەسەرسامییەوە هەستیان بەو ژنە کرد کە هیلاکە، داوایان لێکرد کە مێ لە شوقەکەی خۆییدا پشووێ بدات، لە و رەوشەدا

دکتۆرێکی جوولە کەی بە رەگەز عێراقی کە ناوی (زهیرة)بوو بۆ رێنمایی تە ندروستی لە شوقەکەی لە گەڵیدا مایە وە، بە دکتۆرەکەیان وتبوو، باسی کۆتایی هێنانی کارە کەی بە هیچ شێوەیەک لەگەڵدا ناکەیت. دکتۆرەکە تەنها بۆ ئەوە دانرابوو خەمۆکییەکی بەرەویێتەوەو دڵی بداتەوەو بۆ ئە وەش بوو تا ماوە یەک ببێتە هاودەمێکی ناسک. دکتۆرەکە باسی کۆمەڵگەی جوولەکەی عەرەبی بۆ بکات، کە لەچەندین وڵاتانی عەرەبییەوە هاتوونەتە ناو ئیسرائیل، ئەوانە چۆن لە و ژینگە یە راهاتوون، چۆن لە گەڵ کولتوورە جیاوازەکان راهاتوون، ژنە کە باسی ئە و خێزانە کریستیانە عەرەبانەی بۆ دە کرد کە لە وڵاتانی عەرەبییەوە بۆ ئارامی دووردە کەوتنەوە لە کۆمەڵگە ئیسلامییەکان، بۆیەش هاتوونەتە ئیسرائیل و ژیانی ئێرەیان هەڵبژاردووە، لەوانە نەقیبی فڕۆکەوانی کریستیانی عێراقی (منیر رضا) کە فڕۆکەیەکی مێکی 21 ی شەڕکەری سۆڤیەتی لە عێراقەوە فڕاندبووە ئیسرائیل، کە دکتۆرەکە بەسەرهاتی ئە و فڕۆکەوانەی بۆ ئامینە گێڕاوەتەوە، ئامینە بە (زهیرة)ی وتبوو، حە زدەکەم ئەو کەسە ببینم، ئەویش داوای لە کەسانی بەرپرس کردبوو، کەوا ئەو ژنە داواکارە فڕۆکەوانەکە ببینێت، کە وتبوویان ئاساییەو دە توانی بیبینێت، بەرەزامەندییەکە زۆر سەرسام بوو، زۆریشی لا سەیربوو، کە داوای دیمانەی کردبوو لەبەر ئەوە نەبوو کەوا ئەو کەسێکی عەرەبەو دەیەوێت پیاوێکی عەرەب بناسێت، ئەو داواکاربوو بەسەرهات و رۆژانەی چالاکییەکی ئەو باش ببیستێت. رۆژی دیمانەکەیان دیارکراو کە لەدەرگای ماڵەکەی ئەوانی دابوو، منیرو ژنە کەی بەبزەیەکی خۆشەوە دەرگایان لە ئامینەکردیتەوە، لەودەمانە منیر تەمەنی 38 ساڵان بوو، قژی سە ری زۆری هە ڵوەریبوو، لە ماڵەکەو لە خاوەن ماڵە کەش دەوڵەمەندی و خۆشگوزەرانیان پێوەدیاربوو، منیر پێیوتبوو:

(سەرەتا بە قۆناخێکی ناخۆش و تە نگدا ژیانمان بە رێکرد، زمانی عبریمان نە دەزانی، برادەرو هاوڕێمان نە بوو، بێ کارو بێ بە رنامەبووین، بەردەوام پیاوێکی ئاسایش وە ک سێبەری خۆی بە دواوەمانەوە بوو. ماوەیەکی کورتیش لە سوپای بە رگری کارم کردووە، ئێستاش وەکالەتێکی پرۆپاگە ندەی شیاوو گە ورەی رووناکیم بە ناوی خۆم هە یە، ژنە کەشم وە ک بەرێوەبەرو بەرپرسی پەیوەندییەکان کارم لەگەڵدا دەکات.!).

ئامینە ئەو دیمانەیەی بە هەڵزانیبوو پرسیاری ئە وە لەو فڕۆکەوانەکە بکات، کەی و چۆن فڕۆکەوان لە دەربازبوون بە پەڕەشووت لە ئاسمانەوە فەشەڵ دەهێنێت و رزگاری نابێت، بۆ فڕۆکەوانی بەئەزموون ئەوەی پێناکرێت، پرسیبووی، دەکرێ فڕۆکەی سکای هۆکی ئەمریکی ببێتە گۆڕی مردن بۆ فڕۆکەوانەکە، نابێ دەربازی بیت...؟

ئەویش بەوردی باسی فڕۆکە ی سکای هۆکی بۆ دە کات، ئامینە چاک حالی دە کات، کەوا ئەو جۆرە فڕۆکانە کورسی دوو بەشی تێدایە کە لەکاتی تەنگانەدا فڕۆکەوانەکە فڕێدەدات و دووریدە خاتەوە، ئەگەر فڕۆکە کە مەترسی کوشندە ی گە یشتێ، ئە و فڕۆکە یە دەتوانی

فڕۆکەوانەکە بە کورسییەکەیەوە لە بەرزی سفرو لە خێرایی سفریش کارەکە بکات، کورسییەکە لە جۆری دو گلاس ئاسکاباکی (A_ C3)یە. کابینەی سەرکردایەتی پێشەکەی و پشتەوەی و باڵی چەپی گوللە نایبرێت، پانی پۆلاکەی 18مم دەبێت. منیر لەدرێژی قسەکانیدا بە ژنەکە دەڵێت:

(دەبێ موشیەی مێردت بە مووشەکی جۆری سام 6 پێکرابێت، ئەگەر واش بیت ئەو ئێستا لەلای سورییەکان دیلەو بەزیندووی گیراوە، ئەگەر بە مووشەکی جۆری (atoll) ئاسمان / ئاسمانیش لە لایەن سورییە کان پێکرابێت و مووشە کەش بە کابینەی سە رکردایەتیەکەی کەوتبێت، ئەوە فڕۆکەکەی تەقیوەو فڕۆکەوانەکەی مێردیشت بۆی نەکراوە دەربازی بێت).

ئامینە ئەو قسانە ی زۆر بیستبوو، قسە کانی منیری فڕۆکە وانی عێراقیش وە ک قسەکانی پێشوو بوون، لە وەڵامەکەدا وەڵامی ئەو پرسیارەی ئامینە نەدرایەوە، ئەگەر مێردەکەی لە ژیاندا ماوە یان نە ماوە، دە بێ بە زیندوویی لە لای سورییە کان مابێت؟ یان لە ئاسمانەوە تەقیوەتەوە؟ ئە گەر لە ئاسمانیش تە قیوەتەوە ئەوا لە و حالە تەدا دە بێ پارچە کانی لە ناو خاکی سوریا بدۆزرێتەوە، دیارە سورییەکان ئەوە رادەگەێنن کەوا فڕۆکەیەکیان تەقاندیتەوەو پارچەکانی کەوتوونەتە خوارەوە، بەڵام ئەوان هەواڵی دۆزینەوەی پارچەکانی جەستەی خۆی و فڕۆکەکەیان رانەگەیاندووە.

ئامینە بەهەمان بەرنامەی خیانەتەوە لە 3ی ئوکتۆبەری ساڵی 1973 بەرەو ڤیینا لە ئیسرائیلەوە بەڕێکەوت، نوێنەرەکی مۆساد پاسپۆرتە ئیسرائیلییەکەی لێوەردەگرێتەوەو پاسپۆرتە ئوردنییەکەیان داوەتەوە دەست، بۆ بەیانیش پلیتی فڕۆکەی گەشتیان بۆ بەیروت لە دەست ناوە. بەیانی زوو بە هیوای تۆڵەکردنەوەی مێردەکەی دووبارەو بەخۆشیی و بە هیواوە بەرەو کارەکەی گەڕاوەتەوە، لە و سە فەرییدا رادیۆیە کی مارکە یەکی ناسراوی باشی جیهانیشی پێبوو، بە ڵام لە راستیدا ئامێرێکی بێتە ڵی پێشکە وتوو بوو، وا دروستکرابوو کە بەکەس ئاشکرا نە بێت و گومانیشی لێنەکرێت، لەناو جانتاکەی دەستیشی قورئانێکی پیرۆزی تێدابوو، چە ند لاپە رەیەکی قورئانەکەیان قرتاندبوو، لە جیاتی ئە و لاپە رانە شوفرەکەیان بۆی لە جیاتی لاپە رە قرتاوەکان دانابوو. لە سەعاتەکانی یە کەمی رۆژی 6ی ئوکتۆبە ری ساڵی 1973 ئامینە بە ئامێرە بێتەڵیەکەی دە ستی، یە کەم ئیشارە تی بە رەو تە لئەبیب رە وانەکردبوو، (ئار.کیو.ئار.وصلت بسلام..الآمیر الحمر في اوروبا ... ( ئار. کیو. ئار. بە سەلامەتی گە یشتم... ئەمیرە سوورەکە لە ئەورووپا...)

من ئەفسەرێکی فەڵەستینیم بەناوی (آبو ناصر) ناسیووە... مارون الحایک وەعدی داوە بمباتە باڵەخانەی بەریدی ناوەندی... بەنهێنی (جۆرج حبش) سەردانی تونسی کردووە، پیاوەکانی ئەو حەوت پیاوانی (حواتمە)یان کوشتووە... آبو عمار سەرمای بووەو لەماڵەوە نەهاتووتە دەرەوە، لەرۆمانیاوە بەنهێنی بارێک دە رمان گە یشتووتە سەرکردایەتی...کەماسیمان لە ئەنتی بیوتکس هەیە.. لەگەڵ رێزم.

مۆساد ئەو نامەی ئامینە بەبایەخەوە وەرگرت، بەو نامەیە مۆسادی کامەرانی و ئارامی کردبوو، نامە کەی رە وان و راستبوو، شوفرە کانی هیچ هەلەی تێدانەبوو، هە واڵە کانیش زۆر گرینگ بوون، زوو نامە کەیان رەوانەی بە شی لێکۆڵینە وەو بە داچوونەوەکردبوو، زۆری نە خایاند ئامینە یەکەم نامەی لە ئیسرائیلەوە بەدەست گەیشبوو، لە نامە شوفرەکەدا نوسرابوو.

(پیرۆزە پێگەیشتی... بایەخ بە چالاکییە کانی ئە میر بدە ..آبو ناصر زۆر پیسە زۆر ئاگاداری خۆت بە... ئێستا بایەخ بە مارون مەدە. کە آبو عمار هەڵسایەوە.. پاپۆرەکەی (کیفین) لە صیدا چی تێدایە. زانیاریمان لەسەر کۆگاکانی خیوەتگەی البداوی لە طرابلس و مەڵبەندەکانی مەشقی نوێ لە قەڵای شقیف دەوێت).

لەودەمانەی جاسووسەکە خەریکی کارو بەرنامەی خۆی بوو، بۆ زۆرترین کارو بەرهەم پرۆژەی دادە نا، لە ناکاو هە واڵی ئە وە بڵاوکرایەوە کەوا میسرییە کان هێلی بارلیف و کە ناڵی سویسیان بڕیوە، ئەوەش بۆ ئەو سەرسامی و شۆکیکی مەزن بوو. ئامینە وەک دکتۆرێکی عەرەبی خۆبەختکەر لە ناو وڵاتی لوبنان دە سووڕایەوە، بە ردەوام زانیاری زۆری لە سەر چالاکییە کانی فیداییە فەڵەستینیەکان لە خوارووی لوبنان دە دایە مۆساد، کە لەودەمانەی سوپای میسری پێشرەوییەکی زۆری کردبوو، ئە وانیش گە رم ببوون و نە بەردییان زۆرترکردبوو. علي حسن سلامة بە بەرنامەو کاری نوێیەوە لە ئەوروپا گەڕایەوە، فیداییەکان لەناو خاکی ئیسرائیل زەبری کوشندەیان لێ دە وەشاندن، ئیسرائیلییە کان بە و چالاکیانە نیگەران ببوون . لەناو خوارووی لوبنانەوە چوونە ناو ئیسرائیل و ئەنجامدانی چالاکی زۆر ئاسایی و زۆربوو، بۆیەش داواکرا ئامینە بەیروت جێبهێڵێت و بچیتە صور، ئەو بەبێتەڵە ترسناکەکەی، رۆژانە ی نامە و پە یامی بۆ ناو ئیسرائیل دە نارد، هە رچەند ناردنی نامە کانی زۆرتردە بوون، ژیانی زۆرتر دە کەوتە مەترسی، رۆژانە نامەکانی دە گەیشتە 5 نامەی بێتە ڵ، بۆیە وەرگری نامە کان لە ئیسرائیل ناچاربوون هێلەکەیان لەسەر هە مان شە پۆل بە ردەوام بکەنەوە، هە موو دەمێ ئە گەری ئە وە هەبوو ئامینە نامە رەوانەبکات.

ئامینە لەرۆژانی شە ڕەکەی ئوکتۆبەردا نامە ی زۆر دە نارد، بە دەستێک بریندارانی فەڵەستینی تیماردە کردو بە دەستەکەی تری بە بێتەڵەکەی نامە ی دە نارده ناو ئیسرائیل، ئە و پرۆسەیە دەکرێ بە ئازاترین جاسووسی ناو دە زگای مۆساد پێناسە بکرێت، کە لەناو وڵاتانی عەرەبییەوە کلۆبکات، چونکە کارەکانی ئە فسوناویی بوون، ئە وەی ئێستاکراوە، زووتر بە (ئیلی کۆهین)یش نە کرابوو، کە پێش ئە و لە ناو خاکی سوریاوە کاریکردووە، ئەو جاسووسەبوو گەیشتبووە پۆستی پاڵێوراوی جێگری سەرۆکی کۆمار لە سوریا. ئەو کاری زۆری لەناو بەرەکانی جۆلان دەکرد، لەپیشەوەی بە رەکاندابوو، لەبنکە نهێنیەکانیش ماوەتەوە، توانیبووی بڕوای تە واو بە سورییەکان دروستبکات، بە لام لە دەرەوەی ماڵە کەی خۆی ئامێری بێتە ڵی بە کارنەهێناوە، تەنها لە ماڵەوە پەیوەندەی کردووە.

چالاکی فەڵەستینیەکان رۆژبەرۆژ زۆرتردەبوو، لە سنووری وڵاتانی عەرەبی دەربازی وڵاتانی ئەوروپی و ئاسیاییش ببوو، لەوماوەیەدا ئامینە فشاری زۆری لەسەربوو، چونکە ئاسایشی ئیسرائیل شپرزەیی پێوە دەبینرا، فشارەکە لە بەیروت گەیشتە ئەو ژنە جاسووسەش، ئەوانیش داوای زۆرترو وردترین زانیارییان دەکرد، بۆیەش بەناچاری خۆی گەیاندبووە خوارووی لوبنان، لەناوچەی (الشجرة) لە صور شوقەیەکی لەدووری 20کم لە سنووری ئیسرائیل بەکرێ گرتبوو، لەو ماڵەوەو لەو شوێنەدا کەوتە کارکردن بۆ چاودێرکردنی فیداییەکان، ئاگاداری هەموو چالاکی و جوولەکانیان بوو، ئەگەرچی ئیسرائیلییەکان لەیەکەم نامەی بێتەڵیدا لە ئەفسەری فەڵەستینی (آبو ناصر) ئاگاداریان کردبۆوە، بەڵام لە خوارووی لوبنانەوە پەیوەندی پێوەکردبوو، بەشێوەی تەنگاوکردن و ئیحراجکردن، زانیاری زۆری لێوە دەردەهێنان، بەبێ ئەوەی خۆی داوای لێبکات، یان کاری لەسەر بکات زۆری لەو وەردەگرت، چالاکییە پێشوەختەکانی ناو خاکی ئیسرائیلی پێ ئاشکرادەکرد، ئەویش کە ئەو هەواڵەی پێدەووت، بە هەلهەلەو بە خۆشییەوە، دەیووت، راستە، ئای کە خۆشە، چۆن ئەوە دەکرێت؟ ئای ئێوە کە ئازان لەناو خاکی جوولەکەوە زەبریان لێدەدەن، لە پیاوەکانتان ناترسن، ئەویش بەکامەرانی و بەسەرفرازییەوە دەیووت:

(پلانمان بۆ هەموو شتەکان چاک دارشتووە ، بەرنامەی وامان داناوە ئەگەر کەشوهەواش خۆش نەبێت، زۆر بەوردی کارمان بۆی کردووە).

ئەو دەیوویست شوێنی هێرشەکەو کاتەکانیشی پێ ئاشکرابکات، بەڵام ئەفسەرەکە ئەوەی نەدەکرد، بەڵام ئامینە وازی نەدەهێناو بەردەوام کۆششیدەکرد، تا رۆژێکیان لە ماڵەکەی خۆی داوەتێکی بۆی سازکرد، لەوێ چاک خۆی بۆ ئەو کارە سازاند، لەوێ بە زمانی خۆی وتبووی:

دەستەیەک پیاوانی بە جەرگمان سازکردووە ، کۆماندۆکانمان لە ناو ئیسرائیلن، بە مووشک شاری (نهاریا)ی سەر کەنار مووشکباران دەکەن.

ئامینە بە ئوسلوبی خۆی ئەوەی پێدرکاندبوو، ئەویش هەواڵەکەی بێ بایەخ گوێ رادەگرت، لەودەمانەدا بیری لەوە کردووە، چۆن بکارێت زۆرترین نهێنی و بابەتی گرینگی پێ ئاشکرابکات، بۆیە وەک دۆستێک رەفتاری لەگەڵ ئەفسەرەکە نواند، بەڵام ئەو لە خۆشترین حالەتی شەهوەتیش وەک ئەفسەرێکی راهاتوو لە کاری جاسووسی ، زۆری بۆ نەدەدرکاند، بەوردی باسی چالاکییەکانی بۆ ئامینە نەدەکرد، لەودەمانەدا لە باڵەخانەی مۆسادەوە بەکلۆفەوە سۆراخی وردەکاری ژووانەکەیان دەکرد، لەودەمەی کە ئاگاداری ئامینەیان کردبوو لەگەڵ ئەو ئەفسەرە وریابێت، نامەکانی بەشێواوی دەگەیشت، وەک ئەوەی ئەفسەرەکە هەستی بە شتێ کردبێت، یان گومانی هەبووبێت، واتە کارەکانی کەوتبێتە ناو بازنەی گومانەوە، هەواڵی هێرشە دەریاییەکە، ئەگەرچی لە کاتەکەی راستبوو، بەڵام شوێنەکەی هەمان شوێن دەرنەچووبوو، چالاکییەکەی ناو تەلئەبیبیش گومان و شاراوەیی زۆری پێوەبوو، بۆیە فەرمانیان بە ئامینەدابوو،

یەکسەر بگەڕێتەوە بەیروت و لە شاری صور نەمینێت، با چیتر نامە و زانیاری رەوانە نەکات، بەڵام جاسووسە کە زۆر کەللەرەق بوو، لە ناردنی نامە کان نە دەوەستا، لە نامەیەکدا هە موو پارسەنگەکانی گۆڕی، نامەکە نەک کەسە گچکەکانی مۆساد، بەڵکۆ گەورەکانیش بڕوایان پێکرد، ئەو پێیراگە یاندبوون کە وا نۆ فیدایی لە بەیانیەکی زووو بە چەکی ئارپیچی و کلاشینکۆف و نارنجۆکەوە هێرش دەکەنە سەر مۆلگەی (جیشر هازیف) لەدووری شەش کیلۆمەتر لە باکووری نهاریاوە، رۆژەکەش یادی جەژنی نەتەوەیی ئیسرائیل دەبێت، بۆیە هێزەکانی ئەمن ناوچەکانی چواردەورەی مۆلگەکەیان گەمارۆدابوو، لە چەندین خاڵدا دەستیان بە پشکنین کردبوو، لەگەڵ گزنگی رۆژی 15 ی مایۆی ساڵی 1974 شەڕ دروستبوو، بەڵام لە ناوچەیەکی تر، نەک ئەو شوێنەی ئەو دەستنیشانی کردبوو، بەڵکو لە مۆلگەیەکی دوورترو جیاوازتر، لە شەڕێکی دژواردا 117 ئیسرائیلی بەرکەوتن، لەوانە 25 کەسیان کوژران.

ئامینە بەقسەی گە ورەکانی خۆی لە مۆساد رفتا ری نە دەکرد، کە ماوەیەک چالاکییەکانی سست بکات، دیارە ئەوەش بۆ ئە وەیان بوو ئاگاداری خۆی بێت، بۆ پاراستنی گیانی ئەویان بوو. ئامینە ببووە پارچەیەک سەهۆل و دەتاوایەوەو بەحەماسەوە بەرەو کارەکانی هەنگاوی دەناو وەچانی نەبوو، لەهیچ نەدەگەڕایەوە، ملی لێدەنا، کەس وەک ئەو جورئەتی نەبوو، گیانی لە سەردەستان دانابوو، ئە وەی ترس بوو هە ستی پێنە دەکرد، تا رۆژێکیان کە مارون الحایک لە شوقەکەی سە ردانی کردبوو، کە بە دیوارەوە وێنەی ئەستێرە شینەکەی داودی بەهەڵواسراوی بینیبوو، الحایک لە ترسانا خوێنی وە ستابوو، زۆری نە مابوو رۆحی دە ربچێت. بەئاشکراو راشکاوانە ئامینە بە الحایکی وتبوو، من جاسووسی ئیسرائیلم و تۆش شە ریکی منی، وێنەی ئابڕووبەری جووتبوونەکانی پێ نیشاندابوو، دە نگەکانی خۆی بۆ لێداوە تەوە، کە ژمارەی تەلەفۆنەکانی پیاوانی بە رگری فە لەستینییەکانی بۆ دە خوێنتەوە، هە مووشتێکی تۆمارکردبوو، دانیشتنەکەی ئەو رۆژەیان بەوە کۆتایی پێ هێنابوو، پاش ئەوەی ئیمزای رەزامەندی بۆ کردبوو، رازی ببوو هاوکاری مۆساد بکات، داواشی لێکردبوو بچێتە ناو سە نترالی قسەکانی سە رکردە فەلەستینییەکان و گوێ لە هەموو قسە کانیان راگرێت، بە وەش لە مەرامی فە لەستینیەکان سەبارەت بە قەوارەی ئیسرائیل تێدەگەن و دە زانن چالاکی فیداییەکان کەی و لەکوێ دەبن، ئەوەش بۆ ئیسرائیل ئارامی و سوودی زۆر دە گەینێت. ئەگەرچی فە لەستینییەکان هەموو قسەکانیان ئاشکراو کراوە نەبوون، بە ڵام دە کرا سوودیان هە بێت، ئە وەش بە ئاسانی مەیسەردەبوو، بە زیرەکی و لێهاتوویی دە کرا لە شوفرەکانیان تێبگە ن، بە ڵام هە ندێ جار سەرکردەکانیان لە کاتی قسە کردنیان خۆیان لە بیودەکردو زۆریان لە نهێنی و پلانە کانیان ئاشکرادەکرد، ئە وان وایاندە زانی تۆڕە تەلەفۆنەکانی ناو شارە کە چاک کۆنترۆلکراوە و هیچ گومانیان نە بوو، لوبنانییەکان ناتوانن جاسووسی لە سەر قسە کانیان بکە ن، بازنە کانیان چاک داخراوەو بەکەس ناکرێت بێتە ناو بازنەکان، بەڵام الحایک بەئوسلوبەکەی خۆی، یان بە پچڕان دەکرا گوێیان لێ راگیرایێت.

میلیشیا کریستیانە کانی ناو لوبنان بۆ زانینی زۆرشت لە سەر موسلمانە کان، بازنە ی تایبەتییان هەبوو بۆ وەرگرتنی ئاخاوتنی تەلەفۆنەکان، هەر بەهەمان کاریش بۆ ئەو دەکرا گوێ لە فەڵەستینیەکان راگیرێت، ئەوان لە گەڕەکی (الفكهاتي) بارەگای سەرکردایەتیان لە ناوەراستی بەیروت دامە زراندبوو. الحایک لە بەرەبەری بە یانی رۆژی 23 ی مایۆی ساڵی 1974 پەیوەندی بە ئامینەکردبوو، ئەویش یەکسەر ئامێری بێتە ڵیەکەی کردبۆوە، نامە ترسناکەکەی ئاراستەی مۆسادکردبوو، کە ئەوەش دەقەکەی بوو:

(ئار، کیو. ئار. پاش 37 دەقەی تر هە شت فیدایی فە ڵەستینی هێرش دە کەنە سەر ئوردوگای نیشتەجێی (زرعیت) کلاشینکۆف و قونبلەی 57 ملم یان پێیە.. شالۆن).

لەکاتی دیاریکراودا چالاکییە کە ئەنجامدرا، بە راستی هە واڵەکە وردو دروست بوو، ئیسرائیلییەکان دەوری هە شت فیداییە فەڵەستینیەکەیان گرت، شە شیان کوشتن و دووشیان بەدیلی گرتن. لەئەنجامی کارە وردو رۆژانەکەی ئامینە توانی بچێتە ناو تۆڕی تایبەتی قسەکانی جورج حبش، پاش گوێگرتن لە چەندین ئاخاوتنە تەلەفۆنەکانی بۆی روون بۆوە کەوا سازکاری بۆ چالاکییە کی سە ربازی زۆر نهێنی لە ئارادایە، تا رۆژێکیان لە قسەکانی لە گەڵ یە کێک لە یاریدەرەکانی لە شاری صیدا، حبش دیاربوو زۆر هەڵچووبوو، بۆیە فەرمانی دەدایە یاریدەرەکەی کەوا چالاکییەکە لە رۆژی 13 ی یونیو ئەنجام بدەن، لەناو قسەکانییدا بە هەلە ناوی (کیبوتز شامیر)ی لە دەم دە رچووبوو، ئە و زوو هە واڵەکەی گە یاندبوو، پاش سێ رۆژ پێنج فیدایی فەڵەستینی لە گوندی (کیبوتز شامیر) بینرابوون، پێش ئەوەی ئەوان بەخۆ بکەون لێیان هاتبوونە دەست و بە چەکەکانیان رانەگەیشتن و هەموویان کوژران. لە 27 ی هەمان مانگا سێ فیدایی تر کوژران، پاش ئە وەی لە نهاریا چوار سە ربازی ئیسرائیلیان کوشتبوو، هە موو چالاکی فەڵەستینیەکان یە ک بەیەک و پێش قە ومانیان دە گەیشتە ئیسرائیلییەکان، ئەوانیش بەوردی چارەیان دەکرد.

****

ئیسرائیل بەردەوام بوو لەسەرئەوەی بنکەو پێگەی فەڵەستینیەکان لەباشووری لوبنان، بەشێوەیەکی دبلۆماسی و زۆر نهێنی بۆ بە رژەوەندییەکانی خۆی بە کاردەهێنا، بۆ هە مان مە بەستیش لە ژێرەوەش پەیوەندی پتە ویان بە میلیشیا لوبنانیە کان هە بوو، مە بەست لە وەش کپکردنی جوولە و چالاکیی فە ڵەستینیەکان و چاودێریکردنی یە کە سەربازییە سورییەکان لە لوبنان بوو. بۆ ئە و مە بەستەش تۆڕێکی گە ورە لە ئەندامانی مۆساد لە لوبنان کاریاندە کرد، لەولاشەوە دەزگای موخابەراتی فە ڵەستینی بە سەرپەرشتی علي حسن سلامة ترسی زۆری لە دڵی ئە وان چاندبوو، ئە و ببووە کۆسپ لە زۆربوونی ژمارە ی بە کرێگیراوان، هە ر بە خۆی

توانیبووی لە ناو ریزەکانی بەرگری فەلەستینیدا 20 کەسیان بدۆزێتەوەو بە دەستی خۆشی ئیعدامیان بکات، بۆیە ش هەموو دائیرەکانیان بە چاوی گومان و لێپرسینەوەو چاودێری سەیردەکران.

جاسووسە ژنەکە لە 1ی ئوکتۆبەری ساڵی 1974 لە ژووری سەنترالی نهێنی بوو، گوێ لێبوو علي حسن سلامة لەگەڵ یەکێک لە یاریدەرەکانی زۆر بەگەرمی قسەی دەکرد، کە دەقی ئاخاوتنەکانی بیستبوو شۆک ببوو، لە قسەکانی تێگەیشتبوو کەوا دوارۆژی (مەلیک حسین) نزیک بوویەتەوە، جارێکیان گوێ بیستی دەمەتەقێیەکی هێمنانەی نێوان (عبدالوهاب الكيالي) پێشەوای بەرەی عەرەبی بوو، ئەوانەی لەگەڵ حزبی بەعسی عەرەبی پەیوەندییان زۆر باش بوو (آحمد جبريل)ی پێشەوای بەرەی میللی رزگاری گرتبوو، هەردووکیان باسی ئەگەری هێرشێکی فیداییان لە ماوەیەکی کەمدا دەکرد، بەلام دیاربوو دەمەتەقێیەکە ئەوەندە بایەخدار نەبوو. لەودەمانەدا و یستی گوێ لە تەلەفۆنەکانی (یاسر عرفات) بگرێت، بەلام دیاربوو هێلەکانی داخرابوون، لەودەمانەدا بیری لەوە کردەوە، گوێ لە تەلەفۆنەکانی (علي حسن سلامة) بگرێت، ئەودەمانە ئەو لەگەڵ (آبو نضال) قسەی دەکرد، پلی بە تەسجیلەکە وەنابوو خۆشی گوێ لە قسەکان راگرتبوو، کە گوێی لە ئاخاوتنەکە راگرتبوو، هەستیکردبوو وا ئەو دووکەسە پلان بۆ کوشتنی (مەلیک حسین) دادەرێژن و بە نیازن لەکاتی ئامادەبوونی ئەو لە کۆنگرەی لوتکەیی سەرانی عەرەبی کە بڕیارە لە (الرباط) بگیرێت بیکوژن.

ئامینە بە بیستنی ئەو قسانە تووشی شۆک دەبێت، بۆیە هەواڵەکە دەکاتە راپۆرتێک و یەکسەر رەوانەی مۆسادی دەکات، پاش 36 دەقە نامەیەکی بۆ دێت کە نامەکە دووبارە رەوان بکاتەوە، ئیسرائیل بەو هەواڵە نیگەران دەبێت و ئەوان لە گیانی مەلیک حسین دەترسان. ئامینە پاش 13 دەقە لەمۆسادەوە نامەیەکی خێرای بۆ هاتبوو، نامەکە زۆر سەرسورهێنەرو نامۆبوو، داواکاربوون ئەو بە هەر شێوەیەک بێت بەبیانوی پشکنینی منداڵەکانی سلامة سەردانی ماڵەکەی ئەو بکات، ئامینە پێی سەیربوو کەوا چۆن (جۆرجینا رزق) سەر بە هەوێ شووی بە و پیاوە کردووە..! چۆن شاهی جوانەکان شوو بە پیاوێک دەکات ژن و منداڵی تری هەیە، ئەوەی نەزانیبوو سلامة ژنی یەکەمی لە بنەماڵەی (آمين الحسيني)یە، ئەو ژنەش دایکی منداڵەکانیەتی.

لەو کۆمەڵکوژییەی پاشان ناوی نرا (آيلول الاسود _ ئەیلولی رەش) کە تێدا سەدان کەسی بێتاوانی تێدا کوژراو پاشان ناوەکەی کرا بەناوی نهێنی تیمە تایبەتیەکەی یاسر عرفات، کە سەرۆکایەتیەکەی ئەو تیمە سپێردرابوو بە سلامة، یەکەمین دەسترێژییەکەشیان (وصفي التل)یان کوشت، پاشان دەستیان درێژترکرد لە و ناو ولاتانی ئەورووپییدا هاوولاتی ئیسرائیلیان دەکوشت، سلامة بەئاشکرا بیری لە کوشتنی مەلیک حسین کردبۆوە، بەلام مەلیک بەختیاربوو کە دەسەلاتدارانی حکومەتی مەغریبی توانی ئەو دوو دەستە کۆماندۆە فەلەستینیە بگرێت، کە بۆ ئەو مەبەستە لە ئەسپانیاوە هاتبوونە ئەو ولاتە، کە عرفاتیش لە کۆبوونەوەکە ئامادەبوو، بەلام مەسەلەکەیان لە کۆبوونەوە لوتکەییەکە نەورووژاند، کە تێدا عرفات چەندین دەسکەوتی لەولاتانی عەرەبی بۆ رێکخراوی رزگاری فەلەستین بەدەست هێنابوو، هەر لە و کۆنگرەیەدا

بڕیاردرا رێکخراوە کە ببێتە نوێنەری شە رعی و یە کەمی میللە تی فە لەستینی، هە ر ئە و رێکخراوەش دەتوانێ خەبات بکات و خەم لە بەدیهێنانی مافە شەرعییەکانیان بخوات.

****

ئەوەی ئامینە لە گوێگرتن لە تەلەفۆنی سەرکردە فەلەستینییەکان دە یکرد هە رگیز نە کرابوو، بۆ ئە و مە بەستەش دە ستەخوشکەکەی (خدیجە زهران)یش بۆ هە مان مە بەست بە کاردەهێنا، لەودەمانەش سە رەتای شەڕی ناوخۆی لوبنان سە ری هەڵدەدا، دەستەکانی ئە یلولە رەشەکە سەرقاڵی کارو بەرنامەی تربوون، ئامینە بیری لەوە کردەوە لە بەیروت بڕوات و بە رەو تەلئەبیب بۆی دە رچێت، بە ڵام لە ناکاو بە بیری هاتە وە کاتی خۆی داوایان لێکردبوو کۆشش بکات بچێتە ناو ماڵی سلامة، لە وێ دە توانێ لیستی ناوی پیاوە کانی موخابە راتی فە لەستینی دەست بکە وێت. ئامینە وەک جاران سلامةی لە هوتێلی کۆرال بیتش بینیبوو، کە پرسیاری مناڵەکانی لێکردبوو، هە لەیەکی گە ورەی کردبوو، ئە و وشە یەی کە لە مناڵەکانی پرسیبوو، وشەیەکی کوشندەبوو، بۆنی خوێنی لێهات، پیاوەکە زۆر سەرسام بوو، ئەو ژنە چۆن دەزانی ئەو مناڵی هەیە، هەرگیز کەس ئەو پرسیارەی لێ نە کردووە، بۆیە بڕیاریدا باش لەو رابردووی ئەو ژنە بکۆڵێتەوە، داوای لە پیاوەکانی کرد بەپەلەو زۆر بەبایەخەوە سۆراخی رابردووی ئەو ژنەی بۆ بکەن، هەموولایەک کۆششیانکرد بزانن، ئەو دکتۆرە ئوردنییەی کە ناوی (ئامینە داود المفتی)یە کێیە، ماڵی باوانی لە گەڕەکی (صویلح) عەمانی ئوردن ژیاون، کە یەکێکە لە گەڕەکە نایاب و خۆشەکانی عە مان، کە وەڵامی سۆراخی ژنە کە گەڕایەوە، وتیان راستە ئەو ژنە دکتۆرەو بۆ خوێندن رووی لە وڵاتی نە مساکردووە، لە بەرئەوەی لە گەڵ ماڵە وەیان رێکوباش نە بووە، بۆیە بڕیاریداوە عەمان جێبهێڵێت و لە عەمان دووربکەوێتەوە، بەو قسانە سلامة دڵی هێمن دەبێتەوەو بڕوای بە ئامینە نوێ دەکاتەوەو ترسی نامینێت.

سلامة ترسی لە ئامینە المفتي نە مابوو، تا رۆژێکیان لە فرانکفۆرتەوە نامەیەکی لە گەنجێکی فە لەستینی بۆ هاتبوو، لە وێ تێدا نووسرابوو، کە وا گە نجێکی فە لەستینی کە چەندجارێک بەیەکەوە لە کافتریایەک لەگەڵ گەنجێک دانیشتووەو ئەو وتوویەتی:

(کەوا ئە و هاوڕێیە کی جوولە کەی نە مساوی هە بووە، کە بە مادەی زۆری بێهۆشکە ر مردووە، براکەی ئەو فرۆکەوان بووەو کیژێکی موسلمانی هێناوە، کیژەکە عەرەب بووە، بەیەکەوە لەگەڵ براکە ی بە رەو ئیسرائیل رایانکردووە ، کیژە عەرەبەکەش لە ترسی موخابە راتی وڵاتانی عەرەبی داوای لە براکەم کردووە، بچنە ئیسرائیل و لەوێ بژین).

قسەی ئەو جوولەکەیە لەلای ئەو کوڕە فەڵەستینییە سەرەداوێکی گرینگ بوو . لە نامەکەدا نوسرابوو کە وا ئەو کیژەی شووی بە و جوولەکەیە کردبوو، لە نەمسا لە کۆلێژی پزیشکی دە روونی دە یخوێند، کە سورییەکان فڕۆکەی مێردەکەیان خستبووە خوارەوەو مێردەکەی بێسەروشوێن بووە، ژنەکە لە حەژمەتاو بۆ تۆڵەی مێردەکەی بەرەو لوبنان رۆیشتووە. بەو نامەیە رادەی گومانکردن لە ئامینە زۆر زۆربوو، سلامة ترسی ئەوەی پەیداکرد بوونی ژنە جاسووسێکی عەرەب لەناو ریزی فەڵەستینییەکان کارەساتە.

سلامة زۆر بە پەلە نامەیەک رەوانەی ئەوروپا دەکاتەوەو تێدا داوایکردبوو، دووبارە لێکۆڵینەوە لەگەڵ گەنجە عەرەبەکە بکەنەوەو زۆرتر کاری لەسەر بکەن، ئەگەر ویستی کوڕەکە ببەنە ڤییناش، لە پەراوێزی نامەکەش نووسیبوی زۆر بە پەلە. سلامة چاوەروانی وەڵامەکەی نەکردبوو، یەکسەر فەرمانی دابوو سەرژمێری ناوی هەموو ژنە دکتۆرە عەرەبەکانی ناو نەخۆشخانەکانی ناو فەڵەستینییەکان و لوبنانییەکانیشم بۆ بکەن. سلامة گەنجێکی زۆر لێزان و زیرەک بوو، لەتەمەنی 15 ساڵی بەچاوی خۆی بینیبووی کە چۆن جوولەکە باوکیان کوشتووە، وەک هەزارەها فەڵەستینی تر لە خیوەتگاکان بەهەژاری و بە برسیەتی لە خیوەتگە بێ ئاوو کارەباکان ژیاوە ، لە نابلس قۆناخەکانی خوێندنی بە پلەی زۆر باش تەواوکردووە، پاش تەواوکردنی دواناوەندی، زەمالەیەکی لە زانکۆی ئەمریکی لە بەیروت وەرگرتووە، کە مەڵبەندێکی رۆشنبیری گەورەو فراوانی فەڵەستینییەکان بوو، کە لەزانکۆ وەک ئەندازیار دەرچووە، یاسر عرفاتی ناسیووە، ئەوەی تازە رێکخراوی رزگاریخوازی فەڵەستینی دامەزراندبوو، پاش ئەو دیمانەیەی هەموو بوارەکانی ژیانی گۆڕا، پاش ماوەیەک کرابوو بە سەرکردەی هێزی 17و پاشان بە سەرۆکی موخابەراتی فەڵەستین (رصد) دانرا، پاشان کرا وە بە سەرۆکی چالاکییەکانی رێکخراوی ئەیلولی رەش، کە بە مووشەکانیان ئیسرائیلیان هەراسان کردبوو، سلامة لە دۆزینەوەی بەکرێگیراوو جاسووسەکانی ناو ریزەکانیان لێهاتوو و زانابوو، لە ماوەیەکی زۆر کەمدا توانیبووی 20 کەسیان بدۆزێتەوە، لە سەردەستی پیاوانی موخابەراتی میسری چەندین خولی بە هێزکردنی دیبوو، ئەو زۆر شەیدای راوانانی جاسووسەکانی مۆسادبوو، چەند جاریش لە کوشتن دەربازی بووە.

بەپەرۆشەوە چاوەروان بوو، تا نامەیەکی بەدەست گەیشتبوو، تێدا ئاماژە بەو کرابوو کەوا لەناو شاری بەیروت ژنێکی دکتۆر وەک جاسووسی مۆساد هەیە، ئەویش ناوی 37 دکتۆری ژنی لەبەردەم دابوو، لەوانە چواریان خوێندنیان لە نەمسا تەواوکردبوو، لەوانە یەکێکیان شووی نەکردبوو، ئەویش ئامینە داود المفتی بوو. پاش هاتنی ئەو نامەیە سلامة فەرمانی دابوو ئەو چوار پەرستیارە بخرێنە ژێر چاودێری زۆر وردەوە، بیست و چوار سەعات چاودێرییان بکەن، هەموولایەک بەپەلەبوون زوو بگەنە راستییەکان و جاسووسەکە بدۆزنەوە، ئامینە لەبەرئەوەی لەو کارە شارەزاو لێزان بوو، باش لە چاودێریکردنی دەزانی، بۆیە هەستیکردبوو، کەسانێک هەیە بەوردی چاودێری دەکەن، هەستیکرد بواری ئازادی گەڕان و سووڕانەوەکانی

تەسک کراوەتەوە، سەرەتا ویستی ئامێرە بێتەڵەکەی لەکۆڵ خۆی بکاتەوە، چونکە ئەوەیان بەرەو پەتی سێدارەی دەبات، دوانامەی بە بێتەڵەکی نارد کە تێدا نووسیبوی:

(ئار. کیو. ئار. لە دوێنێیەوە شەوو رۆژ چاودێرییم دەکەن، من ترساوم، من نیگەرانم.. لەترسانە گیانم دەردەچێت.. دەربازم بکەن.. شالۆم).

پاش نیو سەعات وەڵامەکەی وەرگرتەوە، کە تێدا نووسرابوو:

(ئامێری بێتەڵەکەت لەنهۆمی سەرەو لەناو بەرمیلەکەی زبڵ دانێ، شوفرەکان بسوتێنە، بەرێگای ئوتومبێلەکان بەرەو دمشق وەرە، لەوێ لە قاوەخانەیەک نامەیەکت دەگاتێ).

ئامینە بە نامەی گەورەکانی دڵی خۆش بوو، دەست بەجانتایەکی گچکە لە شوقەکەی بەراکردن و دڵەڕاوکێ دەرچوو، بەدڕندەترین شێوەی دەربازبوون و راونان جاسووسە ترساوەکە دەرۆیشت، گەیشتە گەراجی پاسەکانی دمشق، گەیشتە ناو پاسەکە هەستیکرد دەربازی بووە، لەناو پاسەکەدا دوو پیاوی ئەمن لەسەر سەری وەستابوون، لەوێ دەمی دەگیرێت و ترس دایدەوەشێنێت، لەوێ هەستیکردووە، ئەو رۆژە دوا ساتی خیانەتەکەیەتی، کە تێگەیشتووە دواساتی تەمەنیەتی بۆیە بڕیاریداوە بەدەست فەلەستینیەکان نەمرێت، بە جولەیەکی بێشعوری دەستی بۆ قژی بردووە ، تا کە بسولە ژەهرە سیانیدەکە دەربهێنێت و قووتی بدات، بەلام دوو پیاوەکەی سەرسەری زوو دەستیان گرتووەو کە پسولەکەیان لە ناودەستی دەرهێناوە، توند قۆڵبەستیان کردووە و بۆ ناو بیجۆیە ستێشنەکەیان کە لەپشت پاسەکە بەدەرگاکراوەیی چاوەروانی دەکردن راپێچیان کردبوو، هەردوو پیاوە ئاکار وشکەکان لە تەنیشتیبوون، لەودەمانەدا ئەو قاچەکانی بۆیان نەدەکرا هەڵیگرن، هەردوو پیاوەکە لەسەر ئەرزەکە بەرزیانکردەوە، فڕێیاندابووە ناو ئوتومبێلەکەی وەک با بەرەو گەرەکی الفکهاتی فڕاندبووایەن، لەوێ لە ژوورێکی بن ئەرزی دایاننابوو، هەردوو دەستیان بە کەڵەپچەی ئاسن بە دیوارەوە گرێیان دابوو.

ئەو گیراوو قۆڵبەستکرا بەلام تا ئەو ساتەش یەک بەڵگەیان لەسەر ئەو ژنە نەبوو، هیچیان لەسەری نەبوو، راپۆرتێکیان لە ئەوروپاوە سەبارەت بە پاکی یان بە خیانەتەکەی ئەو نەگەیشتبووە دەست، بەلام لەو ترس و دڵەڕاوکێیەی لەو بەدیدەکرا گومانی پەیدادەکرد، چونکە لەو جۆرە ئاکارەو لەو شێواوییە پێناسەی خیانەتی لێوە دەبینرا، هەموویان هەستیانکرد ئەوەیان کارێکی گەورەیە، ئەو ژنە دکتۆرە خۆبەختکەرە تاوانێکی زۆر گەورەی کردووە، کە مادەی ناو کەپسولەکەیان تەحلیلکرد، پیاوانی ئەمن، دڵنیابوو ئەوە ژنەی کە لایان گیراوە جاسووسەو خیانەتی گەورەشی کردووە، زانیان یەک دڵۆپە لەو سیانیدە بەشی کوشتنی یەک فیل دەکات، بۆیەش دەبووایە ئامینە بۆ چەند رۆژێک بێ لێپرسینە وە جێبهێلن، بەوەش بە یەکجاری دادەوەشێت و دەرووخێت، دەستەیەکی تایبەت بۆ دۆزینەوەی بەڵگەو راپۆرت و کەرەستەی تر

سەردانی شوقەکەیانکرد، زۆر بەوردی شوقەکەیان چەندجاریک پشکنیبوو، بەلآم هیچیان تێدا نەدۆزیەوە، بەڵگەیەکیان دەست نەکەوت کەوا ئەو ژنە جاسووس بیت، ژنەکە بواری لەپێش بوو خۆی دەربازبکات، دەبووایە خۆی راگرێت، ئەوان هیچیان لەدەستدا نەبوو، بەڵام گومانیان لەو قورئانە پیرۆزە پەیداکردبوو، کە لە شوقەکەی ئەو دۆزرابۆوەو چەند لاپەرەیەکیش قرتابوو، لاپەرە قرتاوەکانیش بیتی بوو لە سورەتی (بني آسرائیل)و لاپەرەو نیوێکی سورەتی (الکهف)بوو، ئەوەیان دەزگای (رصد)ی سەرسام کردبوو، ئەو دەزگایەی لەژێر سەرکردایەتی آبو آیاد (صلاح خلف) باوکی رۆحی موخابەراتی فەلەستینی و رێکخراوی ئەیلولی رەش کە بەسەرۆکایەتی (علي حسن سلامة)ی سەرۆکی چالاکییەکان و دینمۆی بزوێن و بلیمەتی لێهاتووبوو، ئەو دەزگایە یەکێک بوو لە نهێنیترین دەزگاکانی ناو رێکخراوی رزگاری خوازی فەلەستینی، کاری سەرەتایی ئیستخباراتی و کاری قەلاچۆکردنی جاسووسیان دەکرد، لەناو ئەو دەزگایەش یەکەیەکی نهێنی چالاکییە تایبەتیەکانیان هەبوو، لە ولآتانی لوبنان و میسرو ئوردن و مەملەکەتی عەرەبی سعودی و کویت و سوریا یەکەی تایبەتی نهێنییان هەبوو، نەدەکرا ژمارەی ئەندامەکانی بزاندرێت، آبو اياد مامۆستای یەکەمی جاسووسەکان بوو لە رێکخراوەکە، هەر ئەویش بەرپرسی ئاسایش و دەزگا نهێنییەکانی بوو، کە راپۆرتی ئامینەیان لەبەردەم دانابوو، بە سلامةی وتبوو:

(سلامة ناکرێ ئەو ژنە عەرەبە سزابدرێت، تا بەڵگەیەکی لەسەر نەدۆزرێتەوە، بەڵگەکانیش بەباشی تاوانەکانی دەسلمێنن، دەبێ چاوەروانی دوا راپۆرتی پیاوەکانی ئەوروپامان بکەین، تا راپۆرتەکە نەگات، ئێوە هیچ ناکەن، سزاو لێپرسینەوەی لەگەڵدا ناکەن).

لە ولآتانی ئەوروپاش پیاوانی موخابەراتی فەلەستنی سەرگەرمی دۆزینەوەی ئەو گەنجەبوون کە شتێکی لەسەر ئامینە دەزانی، ئەو کورەی لە فانکفۆرتەوەش بۆ ئەو مەسەلەیە هاتبووە ڤیینا لەگەڵیاندا دەگەرا، بەو کورە سەری داوەکە دەدۆزرایەوە، بەیەکەوە لە کوچەو باخچەکانی ئەو شارە گەران هیچیان دەست نەکەوت، کەسیان نەدۆزیەوە، بۆیە بەناچاری بیریان لەوە کردەوە، لە تۆماری ناوی ئەو هاوولآتیانە بگەرێن کە ژنی بێگانەیان هێناوە، ئەوەش کارێکی ئاسان نەبوو، دەترسان پیاوانی مۆساد لە ڤیینا هەست بەوە پشکنینە بکەن، دەبووایە کارەکەیان زۆر بە نهێنی بکەن، زۆر ئاگاداری خۆیان بن، بۆ ئەو مەبەستەش نووسراوێکی ساختەیان بەناوی سەفارەتی ئوردنی لە ڤییناکردو داوایان لە نووسینگەی هاوسەرگیری بێگانەکان کردبوو ئەدرێس و زانیارییمان لەسەر ئەو ژنە ئوردنییە بدەنێ، لەوێ وێنەیەکی پسولەی مارەییەکەی ئەوو پیاوە جوولەکەیان دەسکەوت و نوێتەریان بە فرین پسولەکەی گەیاندبووە بەیروت، لەو دەمانەش پیاوانی رصد لە ڤیینا هەڵیانکووتایە سەر شوقەکەی ئامینە لە ڤیینا، لەناو کە لوپەڵەکانییدا دەفتەری گچکەی بیرەوەرییەکانی ئامینە یان دۆزیەوە، بەکورتی

سەرەدێری بیرە وەرییەکانی تێدا تۆماربوو، نووسیبوی چۆن لە بەیروت کاریکردووە ، چۆن سەفەری ئیسرائیلی کردووە، مەشقی لە کێندەرێ و لەسەرچی کردووە.

****

پاش سۆراخێکی زۆرو پشکنینی ورد لە ڤیناو لەناو شوقەکەی گەیشتنە ئەنجام کەوا ئامینە ئەندامی مۆسادە، هەموو بەڵگەکانیان لەپێش کەسێکی لێزانی وەک (آبو آیاد)یان دانا، بۆیە بەخێرایی گە مارۆی ئامینە دا، ویستیان هە موو چالاکییە کانی پێ ئاشکرابکە ن، ئە وان دەیانزانی زۆر لە نەبەردی فیدایییەکان سەری نەدەگرت، جاسووسێکی زۆر وریا هەیە زانیاری و پلانەکان زوو دەگەیێنێت، دەیتوانی لەناو بەیروت و لە دەرەوەشی مۆساد دەستی وریاو ئاگاداری هەیەو تۆڕێکی مۆساد کاردە کات. قسەدەرهێنان لە ژنێکی جاسووس بۆ دە زگای موخابەراتی فەڵەستینی نوێ و تازە بوو، ئە وان زۆر لە گەڵ پیاوانی جاسووس کاریانکردبوو، لە وانە باش شارەزابوون، بەڵام لەگەڵ ژنێک ئاسان نە بوو، بۆیە سلامة بۆ ئەو حالەتە بیری لەبەرنامەیەکی تر کردەوە، ویستی بە فێڵێک لەگەڵ ئامینە هەڵسوکەوت بکات، بۆیە بە ژنەکەی وتبوو:

(موشیەی مێردت لەلای سورییەکان دیلە، لەو رۆژانە لەگەڵ دەستەیەکی تر لەگەڵ ئیسرائیلییەکان گۆڕدرانەتەوەو ئەو گەڕاوەتەوە ئیسرائیل، ئە و هە واڵەش لە رۆژنامەکان بڵاوکراوەتەوە).

ئەو قسەیان بۆ ئەوەبوو بە ژنەکە بڵێن، فەرموو تۆ ئەوەندە کارت بۆ مۆسادکردووە، ئەوەندە دڵسۆزی مێردەکەت بوویت، ئەوا ئەو ئازادەو مۆساد ئەوەش باش دەزانێت، ئینجا تۆیان ئاگادار نەکردیتەوە، بزانە تۆ چەند بێ قیمە ت و بێبایە خی، تۆیان لە لا گرینگ نییە ، ئەوەندە تۆیان ویستوە تا کارت بۆیان کردووە ، دەبی هە ست بەشەرم و شوورە یی بکە یت، بۆ کێ و لەگەڵ کێ کارت کردووە. تا راستی قسەکانیان بۆ ژنە گیراوەکە نیشانبدەن، رۆژنامەیەکیان بەو هەواڵە هەڵبەستراوەیان نیشاندابوو، لەرۆژنامەکەو لەلاپەرەی یەکەمیدا وێنەی مێردەکەی لەناو دەستەیەک لە برادەرەکانیان دیاربوو، لە وێنەکە دیاربوو مێردەکەی لەگەڵ دەستەیەک لە کارمەندانی خاچی سووری نیودەوڵەتییە، دیارە کەوا رۆژنامەکە یەک دانەی بۆ ئامینە چاپکرابوو، ئەویشیان لەپێشی دانابوو. بەیانیەکیان کە نانی بەیانیان بۆ هێنا بوو، پاسەوانەکە رۆژنامەیەکی لەدەست بوو لە لاپەرەی یە کەمی وێنە ی موشیە ی مێردی لە سەربوو، ژنە کەش زۆر لە پاسەوانەکە دەپاڕێتەوە هەواڵی سەر وێنەکەی بۆ بخوێنێتەوە، پاسەوانەکە رۆژنامەکەی بۆ لەسەر ئەرز داناوە، ژنە دەست بەزنجیرەکە توانی هەواڵە هەڵبەستراوەکە بخوێنێتەوە، دڵنیابوو کە وا مێردەکەی ئازادکراوەو بەزیندوویی گەڕاوەتەوە ئیسرائیل، بەو هەواڵە شادی و خەم لە ئاکاری

بەدیکرا، هیچی لەدەست نەما یەک بەدەنگی خۆی هاواری لێهەڵساوە، ئاگای لە ژانی دەستەکانی نەماوە، سەری لە دیوار داوەو، هاواری کردووەو وتوویەتی:

(موشیە بگەرە فریام، رزگارم بکە، زوو وەرە..!).

****

لە 8 ی سپتەمبەری ساڵی 1975و پاش نۆ رۆژ لە گیرانەکەی، بۆ لێکۆڵینەوە ئامینە المفتی یان بردە نووسینگەی ئە فسەری لێکۆڵینە وەی موخابە راتی فە لەستینی، ابو داود بەئوسلوبێکی هێمنانە لێپرسینەوەی لە گەڵدا کردبوو، دە ستنووسەکانی خۆیان نیشاندابوو، بەدەستنووسەکانی خۆی کە لە شوقەکەی لە ڤیینا هێنرابوون، رووبەرووی بوونەوە، ئەویش وەک نەخۆشێکی دەروونی و نەخۆش بە زیندەخەون لەگەڵیان دەجوولایەوە، ئینکاری هەموو شتەکانی کردو وتبووی:

من بە خەیاڵ زۆر شتم دا ڕشتووە، داواکرابوو آبو آیاد بە زووترین کات کارە کەی تەواوبکات، ناوی ئە ندامەکانی تۆڕەکەیان بۆ ئاشکرابکات، هە رچەند ئەو دوابکەوێت ئەگەری ئەو هە بوو ئە ندامەکان لە دەست دادگاو لێکۆڵینە وە دەربازیان ببێت و کە سیان پێ دەستگیرنەکرێت، لە یەکەم رۆژدا 18 سەعات کاریان لە گەڵدا کردبوو، بە ڵام ئە و هیچی نەدرکاندبوو، بۆ هەموو پرسیارەکان وەڵامی مەنتقی ئامادەی هەبوو، بەڵام لەیەک شت نەیتوانی خۆی دەرباز بکات، بۆچی ژەهری سیانیدی لەناو قژی شاردبۆوە، ئەو کەبسولە ژەهراوییەی بۆ چ بوو، لەبەرئەوەی خۆی تە ندروستی دەروونی خوێندبوو، بۆیە وەڵامەکانی دروست دە دایەوە، لە وەڵامی بوونی ژەهرەکە وتبووی:

(من نەخۆشی دەروونیم هەبووە، بۆیەش بیرم لە خۆکوشتن کردیتەوە.!).

بەڵام پیاوەکانی سەر بە موخابەرات پێیان وتبوو:

(ئەو جۆرە ژەهرە لەبازاردا نیە ، تە نها دە زگاکانی موخابە رات بۆ دە ربازبوونی جاسووسەکانیان لە لێکۆڵینەوە بۆ جاسووسەکانیان پەیدای دەکەن، کەواتە ئەو ژەهرە تەنها لەو کارانەو بە و دە زگایانە پەیداو مە یسەردەبێت، بۆیە ش ئە و ژە هرە نیشانەی ئە وەیە تۆ لە دەزگایەکی لەو شێوەیە کاردەکەیت).

آبو آیاد زانی ئە و شێوە لێکۆڵینەوەیە لەگەڵ ئەودا سوودی نییە، بۆیە ئوسلوبی ئازارو ئەشکەنجەیان گرتە بەر، کارە کە کەوتە بن دە ستی هاوڕێیانی (آبو هول)، تێگە یشتن کارە کە بەوان تەواو دەبێت.

ئامینە دەیزانی بەڵگەکانی موخابەراتی فەڵەستینییەکان لاوازەو بەوە ناتوانن تاوانباری بکەن. لەبەرامبەر ئەوەش فەڵەستینییەکان لەو دەترسان دەسەڵاتدارانی لوبنان داوای بکەن، چاکیش دەیانزانی ئەوانیش سووک و ئاسان ئازادی دەکەن، بەڵگەشیان ئەوەبوو ئەو ژنە عەرەبە لە ڤییناوە هاتووتەوەو ماوەیەک لە ئۆردوگا فەڵەستینییەکان بەخۆڕایی کاری پەرستیاری و خەیری کردووە، زۆریش دڵسۆزانە خۆی ماندووکردووە، بۆیە لەجیاتی سوپاس و ستایش ئازاری دەدەن، ڕەنگە سەرپشکی بکەن لەنێوان دەرچوونی لە بەیروت یان مانەوەی لەو وڵاتە. بۆ نەهێشتنی ئەو داوایە، آبو اياد سەردانی (شيخ بهيج تقي الدين)ی وەزیری ناوخۆی لوبنانی کردبوو، لەوێ داوایکردبوو، کە وا هەردوولا هاوکاربین بۆ دۆزینەوەی تۆڕە جاسووسییەکانی مۆساد کە بەدرێژی و بەپانی وڵاتەکە دەسووڕێتەوە، بۆیە داوایانکردبوو ئەو ژنە سێ ڕۆژی تریش لەلای ئەوان بمینێتەوەو لەو سێ ڕۆژە دا لێکۆڵینەوەکانی لەگەڵدا تەواودەکەن، بەوەش ئەندامانی تۆڕەکەی دەدۆزینەوە، وەزیرەکە ڕازی بوو گیراوەکەیان بۆ ئەو ماوەیە دیارکراوەدا لەلایەن بمینێتەوە.

ئامینە کەلەپچە لەدەست و لە پێیان بردەوە ژێرزەمینەکەیان، فەڵەستینیەکان بیریان لەوکردەوە شوێنەکەی بگۆڕن، نە وەک لوبنانییەکان لەوێ داوای بکەنەوە، یان دەستەیەکی مۆساد بیفرێنن، یان ئەگەر نەکارن ڕزگاری بکەن، نەوەک وەکیلەیان شتێ بڵێت و ناوی کەسانی تر بدرکێنێت، ناوچەکە بتەقێنەوەو ئامینەش بکوژن، بەڵام صلاح خلف (آبو آياد) وایدەزانی ئەگەر بگوازرێتەوە شوێنێکی ترسناک و نوێ لەوێ زووتر دان بەناوی ئەندامانی تۆڕەکەی دەنێت و زۆر شتیان بۆ ئاشکرادەکات، هەموو کۆکبوون لەسەر ئەوەی ژنەکە بگواسترێتەوە ناو ئەشکەوتی (السعرانة) لەخوارووی لوبنان، نزیک لەکەنارەکانی دەریای ناوەڕاست، کە ئۆردگاکانی فەڵەستینیەکانیش لەوێ نزیکە.

لەژێر چاودێرییەکی زۆرەوە بە ئۆتومبێلێکی داپۆشراودا، ئامینە یان گواستەوە ئەشکەوتەکە، ئۆتومبێلەکە دوو سەعات ڕۆیشت، بە گەیشتنیان ئەویان لە ئۆتومبێلەکەیان دابەزاند، بە ڕێگایەکی سەختی شاخاوییداو بە ڕۆیشتنی دوو سەعاتیش، لەگەڵ (آياد خشنة) بردیان، لەوێ دەمامکەکەی سەر دەموچاویان لادا، کە چاوی کردەوە، سام گرتی. نەیدەزانی شوێنەکە کێندەرێیە، لەکام ناوچەیە، لەوێشەوە بردیانە شوێنێکی تاریکی ترسناک. زۆر هەستی بەترس کردبوو، هەرگیز لە ژیانیدا ئەوەندە نەترسابوو، لەوێ کیژێکی لە تەمەنی خۆی بە بەستراوی بینیبوو، گشت گیانی خوێن بوو، هەموو ئەندامێکی جەستەی خوێنی لێدەچووڕایەوە، کیژەکە ماندوو و برسی و تینووبوو، پارچە نانێکی ڕەشی ڕەق و شەربەیەک ئاوی پیسیان بۆ دانابوو، لەودەمانەدا پیاوێک فەرمانی بە پاسەوانەکان کرد دەست و قاچەکانی بە زەنجیر لەپشترا ببەستنەوە، تا آبو هول دەگاتە شوێنەکەو هەڵیواسن، بێجگە لە ئازارەکانی بەدەنی، لەڕووی دەروونیش ئازاری زۆریان دەدا، پیاوەکان لەبەر چاوی ئەو کیژەکەیان گوللەبارانکرد، بەڵام پاشان بۆی ڕوون بۆوە کەوا کوشتنەکە شانۆگەرییەک بوو بۆ ترساندنی ئەو نمایشیان

کردبوو، تا بەو دیمەنە ئامینە بروخێت و هەموو شتەکان بەئاسانی بڵێت، ئەگەرچی کیژەکە رەگەزنامەی فەرەنسیشی هەبوو، بەڵام لەگەڵ فەڵەستینیەکان کاریدەکرد.

****

لە ئەنجامی ئازاردانا هاواری ئامینە بەرزدەبۆوە. لەودەمانە یەکێک داوای دەکرد بەسە بەوەستن، ئێستا هەموو شتەکان ئاشکرادەکات وازی لێبهێنن . لەپێش چاوی آبو هول، بۆ لێپرسینەوە ئامینەیان بردە ناوچەیەکی چۆڵ لە (الجبل)، لەوێ هیچ دەزگاو ئامێرێکی تۆمارکردن و دەنگ وەرگرتنی لە بەرچاوان لێوە نزیک نەبوو، بەڵام لە راستیدا لە ناو جێبێک کە چەند مەترێک لێوە یان دووربوو، دەنگەکەی تۆماردەکرا، عەقید آبو هول لەگەڵیدا دەستی بە لێکۆڵینەوەکرد، لەوێ لێی پرسی:

کێ بەرپرسی یەکەمی تۆیە لە مۆساد؟ بەڵام ئەو لە وەڵامدا وتبووی:

زۆرم تێنووە، وا خەریکە دەخنکێم. هێشتا قسەکانی تەواو نەکردبوو، ئەفسەرەکە بە پاسەوانەکەی وتبوو، ئاگر لە پشتی بەردەن، بە گورزی توند بیسوتێنن، بۆیە یەکسەر وتبووی:

ناوی ئاشیتوف بوو. ئەویش پرسیبووی:

(کوانی ئامێری بێتەڵەکەت، کوانی شوفرەکانت.؟).

تەماشایەکی گورزەکەی کردبوو، بەترسەوە لە وەڵامدا وتبووی:

(ئەو فەرمانی پێکردم، بێتەڵەکەو شفرەکان فڕی بدەمە ناو بەرمیلەکەی زەبڵی، نۆتەی شفرەکانیش کەلەناو لاپەرەی قورئانێکدا شاردبوومەوە بسوتێنم).

تا زۆرتر درۆ نەکات و کارەکەیان دوا نەخات، ئازاردانەکانی لێ توندترکردبوو، ئەو وتبووی:

(مێردەکەم کەسێکی سەر بە مۆسادبوو، منی بۆ ئەوە هێنابوو تا کاریان بۆ بکەم.!).

پیاوەکە تەنها ئەوەندەی لەو دەویست، بۆیەش دانی بە زۆر شت دانا، پێیوتبوو، ئەگەر شتەکان و ناوەکان نەڵێت، گوللەبارانت دەکەین، ئەویش ناوی هەموو هاوکارەکانی ناو لوبنانی بۆ ژماردبوون، لەوانە بەرێوەبەری سنترالەکە، ئەوەی ژوورە نهێنیەکەی گوێگرتن لە تەلەفۆنەکانی بۆ دەکردەوە بواری بۆ سازدەکرد گوێ لە هەموو ئاخاوتنەکان راگرێت، بەوەش زۆر لە قسەی سەرکردە فەڵەستینیەکانی دەبیست.

کە عەقید آبو هول گە ڕایەوە سەر ئەفسەرەکەو سەبازەکانی ئەشکەنجەی ئامینە یان دەدا، هاواری کردبووە سەریان، کەوا بۆچی دەستتان نەرمەو توند ئازارتان نەداوە، تا ئەو دان بە شتەکان دابنێت، با هەموو جەستەی خوێنی پێدا شۆڕبێتەوە، من وامدەوێت، پاش جەولەیەکی تر لە لێدان و ئە شکەنجەدان، ئامینە بەیەکجاری دەبوورێتەوە، ئەوەش مانای ئە وەبوو، ئە مجارە هەموو نهێنیە کان ئا شکرادەکات، لە لێپرسینەوەی ئە وجارەدا، لە بەرامبەر آبو هولدا، وە لامی هەموو پرسیارە کانی داوەتەوە، وردو درشتی رۆژانە و بە سەرهاتەکەی خۆی بۆ گێڕاوەتەوە، لە رۆژی یەکەمی دەرچوونی لە عەمان و مانەوەی لە ڤیيناو شووکردنەکەی بە پیاوە جوولەکەکەو بوونی بە جوولەکەو پاشان رۆیشتنیان بۆ ئیسرائیل و چۆن کراوە بە ئەندام لە مۆساد، کە تەحقیقەکەی تەواوکرابوو، دۆسیەکەی بەتەواوی رەوانەی پێش آبو آیادو یاسر عرفات کرابوو، بۆ بە یانی بە رێوەبەری سنترالە کە (مارون الحایک )و (مانویل عساف)و (خدیجة زهران )یان گرتبوو، بەلام عساف خۆی لە نهۆمی پێنجەمی باڵەخانەکەی فڕیدابووە خوارەوەو یەکسەر گیانی لەوێ دە رچووبوو، بە لام دوو کە سەکەی تر کە وتنە بن دە ستی موخابەراتی فە لەستینی، ئەوانیشیان بردبووە هەمان شوێنە کەی ئامینە، بۆ ناو ئە شکەوتە تاریکەکە، لە وێ رووبە رووی ئامینەیان کردبوونەوەو لەپێش چاوی ئەوەو قۆڵبەستیان کردبوون، پاش لێدانێکی زۆر، دانیان بە هەموو شتە کان دانابوو، پاشان هە ردوو لوبنانیەکەیان رادەستی حکومە تی لوبنانی کردبۆوە ، تا خۆیان تە حقیقیان لە گەڵدا بکە ن، هە رچەندی لوبنانییە کان داوای تە سلیمکردنەوەی ئامینە المفتییشیان کردبوو، بە لام فەلەستینیەکان رازی نە بوون بیدەنەوە دەست لوبنانیەکان، گوێیان نەدابووە فشارەکانی وە زیری ناوخۆی لوبنانی . وەزیرە لوبنانیەکە تووڕەببوو، بە لام فەڵەستینیەکان بۆ وەرگرتنی زۆرتر زانیاری لە ئامینەو بۆ پاراستنی یە کە فیدائیەکانیان، داوای زۆرتریان لە و زانیاریانە دەکرد کە ئامینە بۆی سەلماندبوون ئەو سە ر بە مۆسادبووە، ئە وان دەیانویست بزانن کام پلان و بە رنامەی بە وان داوە ، دە یانویست تە واوی ئیعترافە کانی لێ دەربهێنن، بەڵام ئەو زۆری لەوان دەشاردەوە.

*****

ئامینە کە رۆژانەی خۆی لە کتێبێکی گەورەی 600 لاپەرەییدا بڵاوکردەوە، لە وێ باسی ئەوەی کردووە، کەوا لە رۆژانی لێکۆڵینەوەکانیدا زۆر زانیاری گرینگی لە فەڵەستینییەکان دەشاردەوە، هە مووشتەکانی بۆیان ئاشکرانە کردووە. کە هەواڵی گیرانی تۆڕە کەی ئامینە لە رۆژنامە لوبنانیەکان بڵاوکرایە وە، هە موو دە زگاکانی مۆساد هە ژانیان تێکە وت، سە رکردە گەورەکانی بە خێرایی کۆبوونە وە، بیریان لە وە کردووە، چۆن شتێکی بکە ن پرۆسە ئەفسوناوییەکەیان بگە ڕێتەوە، ئە گەرنا هە موو بڕواپێکراوە کانیان لە و وڵاتە دەردەچن، هە موو تۆڕەکانیان لە ترسانا هە رەس دە هێنن، لە وڵاشەوە یاسر عرفات دۆسیە کەی ئامینە و

چارەنووسەکەی خستبووە بن دەستی خۆی، علي حسن سلامة، زوو وتبووی، سەرۆک با ئەو ژنە ئیعدام بکەین، بەڵام ئەو رازی نەبوو، ئەو وایدەزانی بەو ژنە دەتوانن چەند گیراوو دیلی خۆیان لە گرتووخانەکانی ئیسرائیل دەرباز بکەن.

ئەودەمانەی ئامینە لەلای فەلەستینیەکان لە زیندانابوو، ئە و دە ستوەستان نە بوو، لەگەڵ یەکێک لە پاسەوانەکانی بەناوی (حسن الغزاوي) تۆڕێکی دانابوو، بە پاسەوانەکەی وتبوو، ئەو لە بەرئەوەی مامێکی لە بلاتی پاشایە تی ئوردن بووە ، گوایە ئەو لە کۆمەڵکوژی فەلەستینیەکان لە ئەیلولی رەشدا دەستی هەبووە، بۆیە ئەویان گرتووەو ئەو هەموو تومەتەیان بۆی هەڵبەستاوە، بۆیە پاسەوانەکە دڵی پێ سووتابوو، پیاوەکەی ئیقناعکردبوو، ئەو دەتوانی بیباتە ناو ئیسرائیل، ئەگەر بەیەکەوە دەربچن بەئاسانی دەگەنە ناو ئیسرائیل، ئەوەش یەکەم چالاکی مۆسادبوو، کە ئەندامێکیان لە زیندانا پاسە وانەکەی خۆی رازی بکات هاوکاری بکات و بەیەکەوە بۆی دەرچن، بەڵام خەونەکەی نەهاتبوو دی، چونکە پاسەوانەکەی لەلای هاوڕێیەکی خۆی لە ئوردوگاکەیان باسی مە سەلەکەی کردبوو، بە رێوەبەرەکانی زیندانە کە چاودێری پاسەوانەکە دەکەن، تا رۆژێکیان دەستەجلێکی سەربازییان لێگرتبوو، کە بەنیازبوو لەبەر ئامینەی بکات و بەو جلەوە لە زیندانا رابکەن، سەربازە پاسەوانەکەیان گرت و لەمانگی ئوکتۆبەری ساڵی 1976 گوللەبارانیان کردو کۆتە ئاسنینەکانی دەستوپێی ئامینەشیان قورسترو زۆرترکردبوو، بەو شێوەیە بە دیواریشیان بەستابۆوە، لە و رۆژە وە خواردن و خواردنە وەیان لە سەر کە مکردەوە، بۆیەش هە ناوی بە رەو داوە شان دە چوو، لاوازو سیس بوو، بە و جۆرە پێنج ساڵ مایە وە، زۆر هیوای بە مردن دەخواست تا لەو ژیانە بەژانە رزگاری بێت.

رێکخراوی خاچی سووری نێودەوڵەتی لەگەڵ فەلەستینیەکان خەریکی دانوستان بوو تا ئامینە بگۆڕیتەوە، بەڵام ئیسرائیل بۆ بە رامبەر بە و کە سی لاوازیان دانابوو، دە یانووت کەستان نادەینەوە، ئەگەر دەستی بە خوێنی ئیسرائیلییەک سووربێت، لە ولاشەوە یاسر عرفات بەرامبەر بە ئامینە ئازادکردنی دوو فیدائی فە لەستینی دەویستەوە، ئەوانیش (محمد مهدي بسيسو) کە بە حکومی هەتاهەتایێ گیرابوو، کە لە ساڵی 1971 بە بەلەمێک چەند ئیسرائیلییەکی کوشتبوو، کەسی دووەمیش (وليم نصار)بوو، کە ئەویش بە حکومی ئەبەدی زیندانی کرابوو، بە تومەتی کوشتنی سێ ئیسرائیلی ی لەساڵی 1968 لەشاری قدس گیرابوو، ئیسرائیل داواکە ی یاسر عرفاتیان لا پەسندنەبوو، نوێنەری رێکخراوی خاچی سووری نیونەتەوەیی بە یاسر عرفاتی وتبوو، ئەو ژنە لای ئەوان ئەوەندە نایێت، ئەو وەک خائنێک و ناپاکێک بۆ وڵاتە کەی و نەتەوەکەی و ئاینەکەی کاریکردووە، بۆیە بەو دوو کە سە نایگۆڕنەوە، لەوەڵامدا عرفات وتبووی ئە گەر ئە وە نە کەن، ئە وا لە سێدارەدانەکەی لە سەر شاشە ی تە لەفزیۆنەوە دەبینن، ئە وەش چارە نووسی هەرکەسێکە بۆ بە رژەوەندی ئیسرائیل و مۆساد جاسووسی بکات، بە و وەڵامە (آسحق حوفي) بێزارو نارەحەت دەبێت، چونکە ئەوەیان جاسووسەکانیان لەناو وڵاتانی عە رەبیدا دەترسێنێت و لە کارەکانیان سارددە بنەوە، تۆڕە جاسووسیەکەیان کە ملیۆنەها دۆلاریان تێدا سە رفکردووە ئیفلیج دە بێت، لە کۆتاییدا داوای فە لەستینیەکان هاتە قبوولکردن. بۆیەش رێکخراوی خاچی

سووری نێونەتەوەیی کە وتبوو کارکردن بۆ دۆزینەوەی وڵاتێک کە تێدا دیلەکانیان تێدا بگۆڕنەوە، نوێنەریان سەردانی وڵاتانی فەرەنساو ئیتالیاو یونان و بولگاریا ی کردبوو، دەرئەنجام وڵاتانی تورکیاو رۆمانیاو قوبرس رازیبوون بۆ گۆڕینەوەکە رێوشوێن دابین بکەن، لە کۆتاییدا هەردوولا رێکەوتن لەسەرئەوەی لەسەر خاکی قوبرس پرۆسەکە ئەنجام بدرێت، لەسەر زاری وەزیری ناوخۆی قوبرس لە 13ی فبرایری ساڵی 1980 راگەیاندرا کەوا لە فڕۆکەخانەی لارنکای نێونەتەوەیی پرۆسەکە دەکرێت، لەو رۆژەدا ئاسمانی فڕۆکەخانەکە لەنێوان سەعات 14:00 تا 20:50 لەرووی هەموو فڕۆکەیەک داخرا، لەودەمانەدا هەموولایەک لەسەر ئاوو ئاگربوون.

****

دە رۆژ پێش رۆژەکە ئەفسەرێک لە سەرکردایەتی رێکخراوە فەلەستینیەکە لە زیندانا سەردانی ئامینەی کردبوو، لە وێ بڕیاریدابوو کۆت و زنجیرەکەی لێبکەنەوە، فەرمانیش دەدا خواردنی لەپێش دابنێن، دەیویست کەمی بەهوژێتەوەو کەمێ گۆشت بگرێتەوە، لەو دیمانەشدا چەند وانەی رەوشت بەرزیشی بۆ خوێندبۆوە، باسی ئەوەی بۆ کردبوو لە ئەنجامی کارەکانی تۆ کە دەرحەق بە وڵاتەکەت و نەتەوەکەت و کە سوکارەکانت کردووتە، خەڵکێکی زۆر بوونە تە قوربانی، تۆ بە رپرسی لە هەتیوبوونی منالانی زۆر، بێوە ژنی زۆریش، چە ندین ماڵ و نواش رووخێنراوە، کە قسەکانی بۆ کردبوو، ژنەکە بەگەرمی و بەسۆزەوە گریابوو، کەس نەیدەزانی ئەو ژنە لە خۆشیان گریابوو، یان لە ئاکامی پەشیمانی بوو گریابوو، لە کتێبەکەی خۆیدا نووسیویەتی، کەوا قسەکانی ئەو ئەفسەرەی منی بینی، لە گوللە تۆپێک بەهێزتربو، رەشاشێک بوو جەستەی دەبڕیم.

لەبەیانی رۆژی 9ی فبرایردا ئامینە بەنهێنی گواستراوەتەوە ئوردوگایەکی باشووری صیدا، ئێوارەکەی بە نهێنی و بە چاودێری و پاسەوانی ژمارە یەک ئوتومبێلی چەکدارەوە گەیاندراوەتە بەیروت، لەوێ بردوویانەتە ژووریکی رێکخراوەکە، پاش ئەوەی 1561 رۆژ وەک لە رۆژانەکەی خۆییدا حیسابی کردووە ، لە ئەشکەوتی السعرانة مایە وە، وا دووبارە رووناکی دەبینێتەوە، لە بارەگاکە دوو کیژ هاوڕێیەتیان دەکردو لە ژوورەکەی لەگەڵی نوستن، بەلام ئەو شەوەکەی خەوی لێ نەکەوت، ئەو دەیزانی ئەگەر بچێتەوە ئیسرائیل بواری دەرچوونی نادەن، بەناچاری و بەنادڵییەوە دەبێ هەر لەوێ بژیت، لەودەمانە دایک و بنەماڵەکەی بەبیردەهاتەوە، بۆیە لە سەرینەکەی هەڵساوەتەوەو هاواری دەکردو دەگریاو دەیووت:

(من نامەوێ بچمەوە ناو ئیسرائیل، لێرە دەمینێمەوە، لێرە لەسێدارەم بدەن، من دەخوازم بگەڕێمەوە ئەشکەوتەکەی السعرانة، رقم لە دەوڵەتی ئیسرائیلە).

لەودەمانە لەوپەڕی شەرمەزاری و پەشیمانی بوو، دەپاڕایەوەو دەیووت:

(تكایە بمكوژن، لە سێدارەم بدە ن، بادە ست بە كەلەپچەوە بژیم، نامە وێ بچمە وە ئیسرائیل).

ئەفسەرەكەش پێیدەووت:

(تۆی خائین بە دوو كەسی پاڵەوان دەگۆڕینەوە.!).

كەزانیان رە وشی خراپە ، دكتۆرێک ە اتە ژوورەوەو د ەرزییەكی بێهۆشی لێدا، بۆیەكەوتە خەوێكی قوڵەوە، لەئێوارەی 13ی فبرایری ساڵی 1980 لەژێر چاودێرییەكی زۆرەوە گەیاندراوەتە فڕۆكەخانەی بەیروت، لەناو چەندین ئەفسەرو سەربازی فەلەستینی و نمایندەی خاچی سووری نێونە تەوەیی، نەوەک فڕۆكەی ئیسرائیلی بیفڕێنن، بە فڕۆكەكە بەرەو ئەنقەرە سواری فڕۆكەكرا، فڕۆكەكە لەوێیەوە بە ئاسمانی یونان گەڕاوەتەوە قوبرس. ئەو رۆژە قوبرس لە رۆژێكی سامناک دە ژیا، رۆژی وای بە خۆییەوە نەدیبوو، شەقامەكان بە زرێپۆشو چەكداری زۆرەوە گەمارۆدرابوو، لەسەربانەكان چەندین قەناس وەستابوون، فڕۆكەخانەكەش بە زرێپۆش دەوری گیرابوو. كە فڕۆكەكە دەنیشێت، چەندین زرێپۆش گە یشتن بۆ پاراستنی رە وشەكە، هەموولایەک هە ناسەیان راگرتبوو، كە فڕۆكەكەی كۆمپانیای (العال)ی ئیسرائیل نیشتە وە، ئەفسەرێک ئامینەی لەسەرشان هێنایە دەرەوە، زرێپۆشێک گەیاندیە ناو فڕۆكە ئیسرائیلییەكە، لەولاشەوە دوو فەلەستینیی پاڵەوانەكەیان دابەزاندە ناو زرێپۆشەكە، گواستنەوەو گۆڕینەوەی هەردوولا لە فڕۆكەخانەكە تەنها 43 دەقەی خایاندبوو، ژنێكی شەرمەزار رۆیشت و دوو پاڵەوان گەڕانەوە، لەگەڵ نیشتنەوەی فڕۆكەكەیان یاسر عرفات لە پێشوازی دوو دیلەكە وەستابوو، ئامینەش ماوەیەک لە نەخۆشخانەیەكی دەروونی ژیاوەتەوەو پاشان هەواڵی نەماوە، زۆر قسە لەسەر چارەنووسی ئەو ژنە هەیە، دەڵێن گوایە بە نەشتەرگەرییەک ئاكاری دەموچاوی گۆڕیوەو سەفەری ئەمریكای كردووە، هەندێكیش دەڵێن ئێستا لە خوارووی ئەفریقیا دەژیت، چیرۆكی لەو جۆرەش لە ململانێی عەرەبی ئیسرائیلی نمونەی زۆرە.

---

لەرۆژنامەی (الجریدة)ی كویتی لە رۆژانی 14و 15و16و 17ی سپتەمبەری 2008 بڵاوكراوەتەوە.

## ئەو جاسووسە میسرییەی کە لەیەکەمین نامەدا گیرا.

یەکێک لەسەربردە سەیرەکانی جاسووسەکان بەسەرهاتی (جمال حسنین)بوو، ئەوەی لەناو رۆژانی ژووان و دڵدارییدا کەوتبووە ناو تۆڕی جاسووسیەت، لەکۆتاییشدا دەستی نەگەیشتە خۆشەویستەکەی. حسنین لە 29ی ئوکتۆبەری ساڵی 1941 لە قاهیرە لەدایکبووە، باوکی فەرمانبەرێکی ئاسایی وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی بوو، بە مووچە کەمەکەی حەوت سەر خێزانی بەخێوکردووە. حسنین بە زەحمەتی قۆناخی سەرەتایی خوێندنی بڕیوە ، بەڵام لە سەر خوێندن بەردەوام بووە، تا لە ساڵی 1962 دبلۆمی لە رووپێوی (مساحە) وەرگرتووە، لەمەسلەحەتی رووپێوی قاهیرە دامەزراوە، لەبەر مووچە کەمەکەی، خۆی زۆر بەکەم و گچکە دەبینی. حسنین هیواو ئارەزووی زۆری هەبوو، بۆیە لە ئامۆژگەی ئۆلومپی لە ئەسکەندریە دەوامی کردووەو لەساڵی 1968 دبلۆمی وەرگرتووە، ئەو ساڵانەش رەوشی وڵاتی میسر پاش نسکۆی شەڕەکانی لەگەڵ ئیسرائیل ناڵەبارو شپرزە بوو، هەموولایەک چاویان لە تۆڵەو بەرنامەیان کاری بوژانەوەی وڵات بوو.

حسنین لەبەرئەوەی لەمناڵییەوە دووچاری (flat foot) ببوو، بۆیە بۆی نەدەکرا ببێتە سەربازو بەشداری تۆڵە و شەڕی دژ بە ئیسرائیل بکات، بۆیەش زۆرجار لە خەمەوە بەسەر ماڵەوەو هاوڕێیەکانی هەڵدەشاخا بۆ ئەو مەبەستەش هیوای زۆربوو رۆژێ بێت نۆرەی ئەویش بێت لەبواریکدا بەشداری بوژانەوەو سەرفرازی وڵاتەکەی بکات، بۆ ئەوەش هەناسەی قووڵی هەڵدەکێشا. ئەگەرچی لەگەڵ خۆشەویستەکەی بەڵێنیان بەیەکدابوو، بەڵام لە ماڵەوە کەس یارمەتی نەدابوو تا هەردووکیان بەیەک بگەن، کە داوا لە باوکی دەکات ژنەکەی بۆ بگوازێتەوە، ئەو پێیدەڵێت:

(دەبێ ئەو پرۆسەیە بەخۆت جێبەجێ بکەیت).

ئەوەش زیاتر کوڕە عاشقەکە شێت و شەیدا دەکات، بۆیە بەتەنگاوی دەچێتە لای باوکی کیژەکەو لە باوکی داوای دەکات، بەڵام ئەویش بە مەرجە زۆرەکانی دەیشکێنێتەوەو ئەویش نائومێد دەگەڕێتەوە. بەڵام ئەو کۆڵ نادات و بیر لە چارەسەرییەک دەکاتەوە تا بتوانێ ماڵێک بۆ خۆی دامەزرێنێت، بەناچاری و بۆ پارەپەیداکردن روو لە بەیروت دەکات، ئەودەمانە خەڵکێکی زۆر بۆ سەرمایە کۆکردنەوە لە لوبنان کاریانکردووەو بازارەکەی گەرم بوو. حسنین

موچەی مانگانە ی تە نها 16 پاوندی میسری بوو، لەوەش مۆلە تی بێ موچە وەردەگرێت، لەدەریاوە لە ئەسکەندریە بەرەو بەیروت دەڕوات، پێش سەفەرەکەی ئامۆژگاری و ڕێنمایی زۆر لەوانە وەردەگرێت کە پێشتر ئە و سە فەرەیان کردووە، یان ئە وانەی لە میسر بۆ کارکردن ڕۆیشتبوون، هە روەها حکومە تیش خولی پە روەردەیی و ئامۆژگاری بۆ ئە وو ئەوانەی وە ک ئەو دەکاتەوەو زۆریان لە بنگوێ دەخوێنن، کەوا ناوی وڵاتەکەیان بەرزو شکۆدار ڕاگرن و لەرفتاری ناپەسند خۆیان دوورکە نەوە، چاپوک بن نە کەونە ناو داوی نە یارەکان، چونکە زۆر لە گەنجانەکانمان لە دەرەوە دەزگای مۆساد دە یانکرێت، بە پارەو هە وس و سێکس دە ستەمۆیان دەکەن و دژی نە تەوەو وڵاتە کەیان کاری جاسووسیان پێرادە سپێرن، بە ڵام حسنین ئە وانە بەکەسانی نە فسنزم و بە زیوو ناودەبات، بۆیە ش زۆر لە قسەکانی ئە فسەرەکان بیردە کاتەوەو دڵنیادەبێت کەوا هەرگیز دەست لەکاری وا شەرمەزاری نەدات و بیر لەوانە نەکاتەوە.

****

حسنین لەسەر پشتی پاپۆرەکە پاڵی داوەتەوەو بیری لە بەرنامەو کردنەوەی دەرگای ڕەزق و کارکردنی دە کردەوە، چی بکات تا بە زووترین کات کارێ بدۆزێتەوەو ژیانی داهاتووی مسۆگەربکات، برێ پارە پەیدابکات و پاشان بە دڵخۆشی بگە ڕێتەوەو نازدارە کەی بگوازێتە وە. لەودەمانە گەنجێکی هاوڵاتی سوری کە لەسەر پاپۆرە کەی کارمەندبوو، لەخەونەکەی بە ئاگای دەهێنێت، دە کەونە قسەکردن و دە مەتقێ، پرسیاری لێدە کات، لە بەیروت چۆن کارێک بدۆزێتەوە، لە کێ کاربکات، ئە ویش ئامۆژگاری دە کات بچێتە قاوەخانەی فاروق، لە وێ دەتوانی کۆنتاکت بکەیت و ئاسانکاریی هە یە کارێکت دەسکەوێت. ئەو لە پاپۆرەکە دادەبەزێت و لە ناو شارەکە زۆر بە دوای کارێک دە گەڕێت، زۆر هیلاک دە بێت، بەڵام ڕۆژانە دەستبەتاڵ دەگەڕێتەوە شوێتەکەی خۆی لە گەڕەکی المزرعة لەخوارووی بەنداوەکە، لە کۆتایی بەناچاری دەچێتە قاوەخانەکەش، کە لەوێ میسریەکان کاری تێدا دەدۆزنەوەو یەکتردەبینن، بەڵام ئەو لە ئاکاری میسرییە ماندووەکان بێزاریی و بێ بە رنامەیی دە بینیت، هە ست بە شکان و ڕووخان دەکات، پاش چە ند ڕۆژێک حسنین پارە کەشی تە واودەبێت و کاری دە ست ناکە وێت، بۆیە بەناچاری و بەبێهیوایی جانتاکەی هەڵدەگرێت و دەگەڕێتەوە قاهیرە.

ئەو بەرنامەی پارە پەیداکردن بۆ ژنگواستنەوەکەی لە مێشکییدا هەرمابوو، هەرچەند ئامۆژگاریانکرد ماوە یەک با پاش دە وام لە شوێنێکیتر کاربکات، بە وەش برێ پارە ش کۆدەکاتەوە، بەڵام ئەو هەستیدەکرد، ئەو ناتوانی لەناو وڵاتا کارێک بدۆزێتە وە، تا کارە کانی پێ مەیسەربکات، ئەو جارە بیری سەفەرکردنی بۆ وڵاتی یونانی دە کەوێتە مێشک، وادەزانی ئەوەی لە سەفەرەکەی بەیروت بۆی نەهاتەدی، ئەوا لە شوێنێکیتر بەئاسانی بۆی دەستەبەردەبێت، کە سەفەر دەکات ناچێتە لای دەستگیرانەکەی (سماح فرحة) نەوەک پەشیمانی بکاتەوە، چونکە ئەو مانەوەی لا باشترە، کە لەدائیرەکەی مۆلەتی نادەنێ یەکسەر دەست لەکاردەکێشتەوەو ئیستیقالە

دەدات، بەپاپۆڕێکی قوبرسی دەچێتە بەنداوی (بیریە)، تەنها دووسەد دۆلاری ئەمریکی و چەند زاراوەیەکی زمانی ئینگلیزی هەبوو.

بەنداوی بیریە یەکێکە لە بەنداوە گەورەکانی یونان، بۆیە کارکردن و بواری کار دۆزینەوەی تێدایە، بە و گفت و قسانە حسنین هاتبوو. بەڵام دیسان لە یونان خەونەکانی نەهاتەدی. کاری دەستنەکەوت، رۆژانە لەوێ سەرگەردان دەسووڕایەوە، دڵتەنگ و پەشێوکاو چاوەروان بوو، بەلام هیچی دەستنەکەوت، ئەو چەند (دراخما)یەی لە گیرفانیدابوو بەرەو تەواوبوون دەچوو، لەودەمانە کوڕێکی مەغریبی بەناوی سمعان ناسیبوو، ئەو وەعدی پێدابوو کارێکی بۆ بدۆزێتە وەو لەو تارماییە رزگاری بکات، بەڵام زۆریش چاوەڕوانی ئەو دەکات و کارێک نادۆزێتەوە. تا رۆژێکیان هاوڕێیە مەغریبەکەی بۆ پەیداکردنی بڕە پارەیەک پێشنیاری بۆ دەکات پاسپۆرتەکەی بفرۆشێت و لەهەمان کاتیش بڵێ گوومم کردووە، لەبەرئەوەی پارەی هیچ نەمابوو یەکسەر بیرۆکەکەی قبوولکردووە. سمعان بۆ فرۆشتنی پاسپۆرتەکەی، نێچیرەکەی دەباتە قونسلەیەی ئیسرائیلی بە بیانوی ئەوەی لەوێ هاوڕێیەکی هەیە، ئەو دەیکرێت، هەر ئەویش لە هوتێلێک کارێکی بۆ دەدۆزێتەوە، لەوێ ئەفسەرێکی مۆسادی ئیسرائیل پێشوازی دەکات و بە گەرمی بە خێرهاتنی کردبوو، وە عدیشی پێدابوو کارێکی بۆ بدۆزێتەوە، هەر لەودیمانەدا داوای لێدەکات بلانکێتێکی بۆ پڕبکاتەوە، کە پێناسەی خۆی و خێزانەکەی بێت، هەموو زانیارییەکی تایبەتی خۆی تێدابێت، پاش سەوداکردنی پاسپۆرتەکەی بە 200 دۆلار لێدەیکرێت، پاش فرۆشتنی پاسپۆرتەکەی هاوڕێیە مەغریبەکەی حسنین دەباتە هوتێلی (ئایسخیلوس)ی ناودار، ئەو زوو لە کرێی شەوی نووستنەکەی هوتێلەکە دەترسێت، بەلام بەکرێگیراوەکەی مۆساد لە پارەکەی دڵنیای دەکاتەوە، کەوا ئەو میوانی قونسلیەتی ئیسرائیل دەبێت، چونکە ئەوان کاری وا زۆر بە رامبەر بە گەنجانی عەرەب دەکەن تا نیازپاکی خۆیان بەوان رابگەیەنن، تا بزانن ئەوەی لە میدیای عەرەبی بڵاودەکرێتەوە سەبارەت بە ئیسرائیل هەمووی درۆن.!

****

### پێوەبوون بە داوەکە

لەودەمانە حسنین قسەکلێی ئەفسەرە میسرییەکەی بەبیرهاتەوە کە لەسەفەری یەکەمی باسی فێڵ و پلانەکانی مۆساد بۆ کڕینی کەسانی میسری لە دەرەوە بۆ کردبوو، تێگەیشت ئەوانە چەند زیرەک و بەکارن بۆ راکێشانی گەنجان لە خزمەتی خۆیان، چۆن بە دروشمە بەجۆشانە کاردەکەن تا کەسانی وەک من بکەوینە ناو تۆڕەکانیان، ناچاربن کاریان بۆ بکەین، ئەوانە کەسانی وا دەدۆزنەوە، کە سەرلێشواوبێت، پارەی لێبڕابێت، رەوشی نەفسی خراپ بێت، لەودەمانە تەلەفۆنێکی بۆ هات، کابرایەک بەناوی یوسف خۆی پێناساندو وتبووی:

(من کارێکم بۆ تۆ دۆزیوەتەوە).

بۆیە ئەویش بەخۆشیەوە شوێن و کاتی دیمانە کەیان دانابوو، ئە و لە دیمانەکەیاندا کابراکەی زۆر دەچێتە بەردڵان، بە پیاوێکی قسەخۆشی دەزانی و ئەویش بەکراوەیی باسی جوانی ژیانی بۆ کردبوو، باسی ئایین و جوانی سروشتیان ک ردبوو، کابرا لە بەخێوکردنی سە گ شارەزابووە، زۆری لایە نی خاوە نداری سە گی بۆ باسکردبوو، پاش ئە و قسانە کابرا باسی قەیرانەکانی خۆرهەڵاتی ناوەراستی بۆ کردبوو، کەی ئاشتی لەو ناوچەیە بەرقراردەبێت، ئاماژەی بە فەرموودەیەکی پێغمبەر د.خ، کردبوو کە چۆن پێویستە جیرانەکان بەئارامی و بە کامەرانی هاوشانی یەک بژین. دانیشتنەکانیان گەرم بوو، حسنین باسی دە ستگیرانەکەی بۆ کردبوو کە چەندی خۆشدەوێت، بەنیازە بیگوازێتەوە ئەگەر ئیشێکی دەسکەوت و پارەیەکی باشی کۆکردەوە، وێنەکەشی نیشاندابوو، ئە فسەرەکەی مۆسادیش بە جوانی دە ستگیرانەکەی پێکە نینی پێهاتبوو، بۆیە پێیووتبوو:

(تۆ لە یونان هێشتا ژنی جوانی ئێرەت نەدیوە، لێرە نازداری وای لێیە شێتت دەکات).

بۆ یەکەمجار ئەفسەرەکە حسنینی بردبووە دەرەوەو لە دەروازەی تیاترۆخانە پیرەژنێک بەگەرمی پێشوازی کردبوون . وای نیشاندابوو کە وا جارێکیتر حسنینی دیوە ، بەڵام حسنین سوێندی خواردبوو ئەو هەرگیز ئەو ژنەو ئەو تیاترۆخانەی نەدیوە، لەوێ شەوەکەیان زۆر خۆش رابواردبوو، کە دەرگاکەش داخرابوو بە رەو شوقە کەی خۆی گە ڕاوەتەوە، کیژێکی بە سۆزیش بەگەڵی کەوتبوو، کیژەکەش دوورۆژ لەباوەشی ماوەتەوە، بەو دوو شەوەو رابواردنەکانی پارەکەی حسنین تەواودەبێت، کە پارەی نەماوە بێسەرو پەریشان دەسووڕێتەوەو ئەفسەرەکەش لە لاوازی و بەکەساسی رووبەرووی دەبێتەوە، ئەویش لەناچاری خۆی رادەستیکردووە، لەودەمانەدا پیاوێک بەناوی ابراهیم سەردانی کردبوو، ئەو وتبووی من هاوڕێ یوسفم، کە لە بلانکێتەکە سەربردەی تۆم خوێندەوە، حەزمکرد تۆ ببینم.

ئەو ئەفسەرە مۆسادەی لەژێر ناوی ابراهیم خۆی پێناساندبوو، کە سێکی زۆر زۆرزان بوو، خاڵی لاوازی ناو دە روونی حسنینی دۆزیبۆوە، لەو خاڵەوە خۆی کردبووە ناخی ئەو، دەیزانی ئەو لە سیاسەت و مێژوو کۆڵە وارە، بۆیە دەستی کردبوو بە درۆهەڵبەستن و چە واشەکردنی رووداوو راستییەکان، چە ندین درۆی بۆ دە ڕێسێت، زۆر باسی جوولە کەی بۆ کردبوو، هە موو قسەکانی ئەویشی تۆماردەکرد، ئەویش پیاوێکی سادەو پەریشان بوو، لەودەمانە لێدوانێکی لەدەم دەرچوو کە تێدا وتبووی:

(جوولەکە زۆر غە دریان لێکراوەو مافە کانیان خوراوە، لە فەڵەستینیش مافی رە وای دەوڵەتبوونیان هەیە، زۆریش باسی قەیرانە ئابوورییەکانی ناو میسری بۆ هەڵڕشتبوو، بۆیەش ئەو

بۆ پەیداکردنی پارەی ژن گواستنەوەکەی بۆ کارکردن رووی لە یونان کردووە، مەسەلەکەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کەوا میسر بە ردەوام ئامادەیی شەڕی هەیە، زۆر بۆ شەڕ خۆی سازدەکات، ئەوەش ژێرخانی ئابووری میسر دەرووخێنێت، ناتوانێت گەشە بە وڵاتەکە بکات).

حسنین لەبەرئەوەی پیاوێکی سادە و کەم ئەزموون بوو، بۆیە زوو بە قسەکانی ئەو بڕوادەکات، بۆیە ش حسنین لە گەڵ هەستکردن بە شەرمەزاری و نسکۆوە جنێوێش بە حکومەتەکەی دەدات، زۆریش باسی کەموکوڕییەکانی ژیانی هاووڵاتیانی خۆیانی کردبوو. کوتینی ئاسن بەگەرمی باشترین شێوەیە بۆ گونجاندنی بۆ هەموو شتێک، بۆیە ش لەو رەوشە ناڵەبارو لاوازەی حسنین و نە بوونی پارەو نەمانی پاسپۆرتەکەی و هیوا نە بوون بە سەفارەتی میسر بۆ یارمەتیدانی، لە هەموویان کوشندەترین لێرە ولەوێ زانیبووی، گوایە وێنەی ناشیاوی ئەویان لەگەڵ ژنان بۆ گرتووە، ئەوانە هەموو رێخۆشکەربوون ئەو پیاوە میسرییە لە یونان بکەوێتە ناو تۆڕی مۆسادەو بە ئاسانی بگیرێت. پیاوە داماوەکەیان بەوە رازیکردبوو ئەگەر ئەو یان هەر کەسێکی تری هاوکاری مۆساد بگیرێت و بکەوێتە دەست موخابەراتی میسری، ئەوان بە هاوکاری رێکخراوی خاچی سووری نێونەتەوەیی، یان وڵات و لایەنیکی دۆست لە پرۆسەیەکی نهێنیدا دەیانگۆڕنەوە، زۆر ناوی کەسانی میسریشیان بۆ ژماردبوون کە لەگەڵ مۆساد کاریانکردبوو، پاش گیرانیان لە لایەن موخابەراتەوە بە گۆڕینەوە ئازادکراون، ئێستاش ئازادانە لەناو ئیسرائیل لە ڤیلای گەورەو نازدار دەژین، بێگومان ماڵ و منداڵەکانیشیان راکێشاونەتە ئیسرائیل، بۆیە ئەو کەسانە بیریان لە خۆدزینەوە لەو کارە نەکردیتەوەو دەربازبوونیان نەبووە.

****

### شێکی خیانەت

ئەو لە شوقەیەکی نازدار لەگەڵ ئەفسەرێکی مۆساد مایەوە، تا دەرسی سەرەتاییەکانی جاسووسیەتی فێربکات، فێری زۆرترین خیانەتی بکات، لەبەرئەوەی حسنین لە میسر خزمەتی سەربازی نەکردبوو، بۆیە فێری بەکارهێنانی هەموو جۆرە چەکێکیان کردبوو، زۆر کە رەستەو پێوسیتە سەربازییەکانیان بە فیلم نیشاندابوو، پاشان بیرتیژی و ژیریان تاقیکردیتەوە، لەبەرئەوەی لە مەسلەحەتی رووپێوی کاریکردبوو، بۆیە دەیزانی نەخشەو شوێنەکان زوو بناسێتەوە، پاش چوارهەفتە ئەو جاسووسە نوێیە هەموو قۆناخە سەرەتاییە پێویستەکانی بڕیبوو، بەپلەی جاسووس و خائین و خزمەتکارێکی دڵسۆز بۆ بە رژەوەندی ئیسرائیل لە و کۆرسە دەرچووبوو.

بۆ ئەوەی ورەی بەرزبکەنەوەو زۆر پشتیوانی نیشان بدەن، بەرپرسەکەی پێیوتبوو، ئێمە ناهێڵین لە بەرامبەر دەستگیرانەکەت شەرمەزار بگەڕێتەوە، یان دەستەبەتاڵ بێت، سەرەتا وەک

پاداشت فەرمووو هەزار دۆلارت پێشکەش بێت، مانگانەش دووسەد دۆلار وەردەگریت و بۆ ەەر نامەیەک کە بەو بۆکس ئەدرێسە کە لە رۆمایەو بە ناوی (کاستالا یوستالی)یە، بۆمان دەنێریت ئێمە وەک پاداشت 50 دۆلارت لە سەر مانگانە کەت بۆ رە وانەدەکەین، ئە وانەش هە موو پێشەکی بوون، تا حسنین بەحەماسەوە بگەڕێتەوەو ئەرکی سەرشانی خۆی بوێرانە راپەڕێنێت. تا گومانی ئە وە برِە پارەی لە ماڵەوەو لە لای هاوڕێیە کانی لێ نە کەن، چوار مانگ لە بەنداوی بیریەی یونان مایەوە، پاشان جانتاکەی پێچاوەتەوەو بەدیاری فستانی بووکینی کە لە موخابەراتی ئیسرائیلییەوە وەریگرتبوو بۆ دەستگیرانەکەی سواری فڕۆکەبووە بەرەو قاهیرە.

حسنین زۆر بە پەلەبوو، زوو نامە یەک بە حبری ئاسایی بۆ هاوڕێیە کەی یوستالی لە رۆما دەنووسێت، بۆی دە نووسێت من بە سەڵامەتی گەیشتم و لە و نزیکانەش دەستگیرانەکەم دەگوازمەوە.

هەر بۆ کارە جاسووسیەکەی و بۆ زانیاری کۆکردنە وە، سەردانی خزمە دوورو نزیکە سەربازەکانی دە کردو پرسی رە وشی سوپاو ورە ی سە ربازانی دە کرد، لە ناو دە فتەرەکەی بەرباخەڵی هەموو زانیارییەکانی دەنووسیەوە، بەبیانۆی ئەوەی نامەی تایبەتی برادەرانی میسری لە بیریەی هێناوە بۆ خزم و برادە رەکانی سەردانی شارەکانی ئەسکەندریەو دمیاط و منصورەو مرسی مطرح کردبوو، لەوێ چاوی لە کاروانە سەربازییەکان دەبڕی، لە چالاکییەکانی دەپرسی، سەیری باری ناو ترێنە کانی دەکردو لە دیار لۆرییە گەورەکانیش دەوەستا، بەو شێوەیە بابەتی زۆری کۆکردبووەو تا رۆژێکیان لە ژوورەکەی خۆیدا دە رگای لەسەر خۆی داخستبوو، لە ناو دەفتەرەکەیدا هەواڵ و زانیارییە کانی بژارکردبوو، بۆ یە کەمین جارو بە حبری نهێنی یە کەمین نامەی بۆ مۆساد نووسی.

ئەودەمانە حسنین یەکەمین نامەی نووسیبوو رە وشی وڵاتی میسر نائارام بوو، پێش شەرەکەی ساڵی 1973 بوو، هەڵوێستی سە رۆکی میسری السادات روون نە بوو، جەماوەری میسری چاوە روانی تۆڵە و کارێکی گە ورەبوون، زۆر بە ڵێن و پە یمان هە بوون، لە ولاشەوە فەڵەستینیەکان لە بەرگری بە ردەوام بوون، بۆیە ئیسرائیلییەکان سە دان جاسووسیان لە ناو توێژەکانی میللەتی میسری چاندبوو، هەموو بەردەوام کاریاندەکردو زانیاریان رەوانەدەکرد، بۆیە موخابەراتی میسریش چاودێری وردی نامە کانی پۆستی دە کرد، بە تایبەتی ئە و پۆستانە ی رەوانەی دەرەوەی وڵات دە کران، بۆیە یەکەمین نامە ی حسنین کە وتە بەرچاوی موخابە رات، بەئاسانی ناوەرۆکی نامەکەیان خوێندەوە کە بە حبری نهێنی نووسرابوو.

لەو رۆژە وە بەهێمنی لە حسنین گە ڕان تا ئێوارە ی رۆژی 29ی نۆڤمبە ری ساڵی 1972 لە ژوورەکەی خۆی بە ئۆامی نووستبوو، بە بەڵگەی روونەوە دەستگیریان کردبوو، لەناو دەفتەرە گچکەکەی بەرباخەڵیشی زۆر زانیارییان دۆزیەوە، کە بەنیازبووە نامەی دووەمی رەوانەی رۆما بکات، لەرۆژانی دادگاش دانی بەوەدانابوو کەوا ئەو بۆ مۆساد کاریکردووەو زانیاریەکانیشی لەخزم و هاوڕێیە کانی کۆکردیتە وەو ئە وانیش لە بەرئەوەی گومانیان لە و نە بووە، بۆیە زۆر

**قسەیان بۆ کردووە، دادگا لە ناوەندی حەفتاکانی سەدەی رابردوو سزای گرتنی کاری قورسی هەتاهەتایی بۆ بڕیبۆوە، لە تەمەنی 60 ساڵ رۆژێکیان لە ناوەڕەی نۆهەدەکانی سەدەی رابردوو لە گرتووخانەی (آبو زعبل) وەک کەسێکی شل و شێواو لە دەرگاکە هاتە دەرەوەو کەسیش لە پێشوازییدا نەبوو. دیارە وەسایە چارەنووسی هەموو خائینێک.**

---

**لەرۆژنامەی (الجریدة)ی کویتی رۆژی 28ی سپتەمبەری ساڵی 2008 بڵاوکراوەتەوە.**

# بنەماڵەیەکی خۆفرۆش

لەهاوینی ساڵی 1995 تەلەڤزیۆنی میسری زنجیرە یەکی درامی لە نمایشکردنی هونەرمەندان (سعید صالح)و (آسعاد یونس)و (طارق الدسوقي) نیشاندا، رووداوی زنجیرەکە لە چیرۆکێکی راستەقینەی دۆسیەکانی هەواڵگری میسری وەرگیرابوو، پاڵەوانی رووداوەکە ژنێک بوو بەناوی (آنشراح موسی)و لەناوچەی العریش لە رۆژانی داگیرکردنی ئیسرائیلی لە سینا لە حوزەیرانی ساڵی 1967 قەومابوو.

(آنشراح علي موسی) لەشاری (المنیا)ی صعیدی میسری لە ساڵی 1937 لەبنەماڵەیەکی مامناوەندی لە دایکبووە، لە ساڵی 1951 بڕوانامەی ئامادەیی لە خوێندن وەرگرتووە، ئەو لەودەمانە کیژێکی بەرچاوبووە، بۆیە زۆر لە گەنجەکانی شارەکە چاویان تێبڕیوە، بەڵام قەدەر بەرەو قاهیرەی دەبات، کە لەئامادەیی دەرچووە، باوکی خەڵاتەکەی بەوە داوە کە بۆ ئاهەنگی ژنگواستنەوەی یەکێک لە خزمەکانی سەفەرێکی قاهیرەی پێ بکات، لە وێ دەگاتە کوڕی نەسیبی خۆی کە گەنجێکی لەدایکبووی ساڵی 1929 العریش بوو، ناوی (آبراهیم سعید شاهین)بوو، لەو ئاهەنگەدا ئەو کوڕە سۆراخی هەموو شتەکانی ئەو کیژە میوانەی کردبوو، پاش چەند رۆژێک ئەگەرچی دایکی پێیدەڵێت ناکرێ تۆ ئەو رێگایە دوورەی نێوان شاری المنیاو العریش ببڕیت، هێنانی کیژێک ئەو کاروانە دووروودرێژە ناهێنێت، بەڵام ئەو لەشاری المنیا دەگاتە پێش ماڵی کیژەکە، کیژەکە زۆر عەشقی دەبێت، لە ماوەیەکی کورتدا پرۆسەی هاوسەرگیری دەبەستن و بووکەکە دەگوازرێتەوە شاری العریش.

آبراهیم لە بەڕێوەبەرایەتی العریش فەرمانبەری بەشی ژمێریاری بوو، ئەویش وەک هاوسەرەکەی بڕوانامەی ئامادەیی هەبوو، بەیەکەوە بەشیرینی و بەتاڵی دەژیان، تا ساڵی 1955 کوڕێکیان بوو، ناویان نا (نبیل)، لە ساڵی 1956 کوڕی دووەمیان بوو ناویان نا (محمد)، پاش دووساڵیتر (عادل)یان بوو، ماڵەکەیان پڕ زاق و زیقی منداڵان بوو، بە یەکەوە لەساڵی 1963بڕیاریاندا کوڕەکانیان رەوانە لای مامیان لە قاهیرە بکەن، لەوێ کوڕەکان رەوانە بەر خوێندن کران و لە کۆمەڵگەی کۆچەری العریش دوورکرانەوە، لەساڵی 1966 آبراهیم بە تومەتی وەرگرتنی بەرتیل گیرا، لەدادگا بڕیاری سێ مانگ گیرانی لەسەردرا، کە لە گرتووخانە هاتە دەرەوە، ژیانیان کەوتە کۆڵەمەرگی و نەبوونی.

****

**تۆچاو ئارد**

پاش شکان و نسکۆکەی ساڵی 1967 ناوچەی سینا لەلایەن ئیسرائیلیەکان گیرا، لە ئەنجامدا ژن و مێردە کە سەفەری قاهیرەیان پێ نەدەکراو ڕێگایان لێ گیرا، هیوای دیمانەی منالەکانیان نەما، ژنەکە بەردەوام بۆ منالەکانی دەگریا، ڕەوشی ماڵەوەشیان بەرەو خراپی دەچوو، پارەو پوولیان نەما، بۆیان نەدەکرا سادەترین پێویستییەکانی ناوماڵ و ڕۆژانەیان بکرن، ئاشکرایە بۆ کۆمەڵگایەکی کۆچەری شەکرو تۆچا سادەترین و پێویسترین کە ڕەستەن، ئەوەشیان بۆ نەدەکرا، ڕۆژانەیان بە گیایەکی خۆماڵی بە ناوی (مرمرية) بەڕێدەکرد، کەوتنە ناو ژیانێکی ناخۆش و دەردەسەری.

لەناو برسیەتی و ڕەوشی خراپی دانیشتووانی دوورگەی سینا، موخابەراتی ئیسرائیلی بۆ پەیداکردنی بەکرێگیراوو لەژمارەیەکی زۆر لەجاسووس دەگەڕا، لەگەڵ باری ناڵە باری خەڵکەکەو گەمارۆی سوپای داگیرکەر لەناوچەکەو کۆنترۆلی توندی هاتوچۆی هاووڵاتیان بارەکە لەباربوو کەسانی زۆر بۆ ئەو کارە جاسووسیە بدۆزنەوە.

خێزانەکەی آبراهیم برسیەتی تەنگی پێ هەڵچنیبوو، لەبەر سروورداركردنی ناوچەکەو فەرمانەکانی حاکمی سەربازی ئیسرائیلی لە ناوچەکە، ژنەکە بۆ دیتنی منالەکانی لە قاهیرە زۆر دەسووتا، بەردەوام دەگریا، بۆیە ڕۆژێکیان آبراهیم لەتاو برسیەتی و دڵسوتانیان بۆ منالەکانی لە دەرگای حاکمە سەربازە ئیسرائیلییەکە دەچێتە ژوورەوە، داوایکردبوو مۆڵەتی پێبدەن سەفەری قاهیرە بکات، کە ئەوان دەرگایان لێ نەکردۆتەوە، لەخەفەتا هاواری کردۆتە سەر ئەفسەرێک و وتبووی:

(هەموو دەروازەکانی ژیانمان لەسەردا داخراوە، برسی و رووتین، یەک لەتە نان لە ماڵەکەمان نادۆزینەوە، لە برسانا وشک بووینەتەوە).

ئەفسەرەکە کە بە (آبو نعیم) ناویان دەبرد، دڵی داوەتەوەو بەنەرمی قسەی لەگەڵ کردووەو بەڵێنی پێداوە مۆڵەتەکەی بۆ وەرگرێت، لەگەڵ نەرمی قسەکانی ئەفسەرەکەو سووتانی پیاوەکە، دەمەتەقێ پەیدادەبێت، ئەفسەرەکە کیسێک ئاردو بڕێ شکرو چای دەداتێ، بەکۆڵێ زادو بە موژدەی وەرگرتنی مۆڵەتی سەفەرکردنیان بۆ قاهیرە ، بە دڵێکی کامە ڕانەوە ئەو دەگەڕێتەوە لای ژنەکەی. پاش چەند ڕۆژێک لە سەر بەڵێنی ابو نعیمە کە، آبراهیم ڕۆژانە دەچێتە بەردەرگای ئەفسەرەکە، چەند جارێک دەستەبەتاڵ، لە کەمێ زادو مۆڵەتی سەفەری خۆی ژنەکەی بۆ قاهیرە دەگەڕێتەوە، هیوای بە بەڵێنەکانی نامینێت.

بەیانیەکیان ئاگاداریان کردیتەوە کەوا لە نووسینگەی آبو نعیم داوای دەکەن، حاکمی سەربازیش ڕەزامەندی لەسەر سەفەرەکەی خۆی و ژنەکەی بۆ قاهیرە دەرکردوە، ئەفسەرەکە هەواڵەکەی پێوتبوو، بەڵام ئەفسەرەکە مەرجێکی بۆ دانابوو، داوایکردبوو ئەو نرخی سەوزەو میوەی ناو بازارەکانی قاهیرەیان بۆ بهێنێت، لە براکەشی ڕەوشی هێنان و بردنی بازاریان بۆ

سۆراخ بکات. آبراهیم وەڵامی دابوونەوە، کەوا ئەو مەرجە زۆرئاسانەو بەچاوان بۆیان دەکات، زۆر بەباشی و بە وردی نرخی خواردە مەنی و سە وزەو ماسییان بۆ دە هێنێت، ئامادەشە شتی زۆرتریشیان بۆ بکات، کە ئەفسەرەکە وەڵامەکەی آبراهیمی بە و شێوە وەرگرتەوە، تێگەیشت کابرا لە یەکەمین تاقیکردنەوە دەرچووە، ئەویش رەوانەی لای ئە فسەرێکی تری دە کات کە ئەرکی پۆلین و پاڵاوتنی لەسەرشان بوو.

****

رووخانەکەی ئەو لە شاری بئر السبع

بۆ بە یانی ئوتومبێلێکی سە ربازی لە پێش ماڵی آبراهیم راوە ستاوەو سە ربازێکی لێ دادەبەزێت و سەری لەبن گوێ کابرا ناوەو ابراهیمی لەگەڵ خۆی بردووتە نووسینگەی ئاسایش، لەوێ ئە فسەرێک بە ناوی (آبو یعقوب) چاوەروانیدەکرد، لە سەرداواو پێشنیاری آبو نعیم ئەفسەرەکە زۆر ریزی گرتبوو و پێشوازی گەرمی لێکردبوو، ئەویش سوپاسی گەرمی ئەوو آبو نعیمی کردبوو، بە یەکەوە زۆر قسە دەکەن، آبو یعقوب بە هەستێکی جاسووسیانە لێی دەچێتە پێشەوەو نەرمی بۆ دە نواند، داواشی لێکرد ووە لە (بئر السبع) سەردانی نووسینگەی سەرۆکی تایبەت بە کاروباری دانیشتووانی سینا بکات. لەوێ ئیسرائیلییەکان زۆر ریزی دەگرن، داوایان لێکردبوو ئەگەر هاوکاریان بکات و زانیارییان لە سەر میسر بۆ کۆبکاتەوە، پارەی زۆری دەدەنێ، یارمەتی بەرچاوی پێشکەشدەکەن، لەکۆتاییدا یەکەم پێشینەی پارە وەردەگرێت، پیاوێکی لاتی برسی، ئە وەی پارە ی یە ک پاکێت جگە رەشی نە بوو، یە کدەست هە زاردۆلار وە ردەگرێت، گۆڕانێکی زۆر گەورەو وەچەرخانێکی سەرسووڕهێنەربوو لەژیانی ئەو روودەدات، ئەوانیش بەڵێنی ئەوەیان پێداوە ژیان و سەلامەتی مناڵەکانی دابینبکەن، با لە العریش ترسی نەبێت. لەو رۆژەو لەو شوێنە دا آبراهیم لە کەسێکی ئاسایی کە پەرۆشی مۆڵە تێکی سە فەری قاهیرە بوو، شێکی جاسووسی و خیانە تی مۆرکردو خۆی بۆ بە رژەوەندی دوژمنەکەی فرۆشت و دە ستی لەگەڵ شەیتان تێکەڵکردووە.

ابراهیم یش وە ک هە موو جاسووسەکانی تر کە وتە بەر مە شقێکی چاک و دژوار، فێریان کرد چۆن بە حبری سپی بابەتیان بۆ بنووسێت، چۆن زانیاری لەناو خزم و کەسوکاریان کۆبکاتەوە، فڕۆکەکان بناسێت و لە یەکتریان جیابکاتەوە، چەکەکان بناسێت. ئەوان زاراوەکانی جاسووسیان پێناساند، لەبەرئەوەی ئامادەیی زۆری تێدابوو بۆ ئەو کارە بۆیە لە بەرنامەکانی زوو و باش سە رکەوت. آبراهیم فێرکرا چۆن پروپاگە ندە بڵاوبکاتەوە، چۆن نوکتە و گاڵتە پێکردنی لەنێوان سوپاو سە رکردەکان هەڵبەستێت، چۆن هەستی ئەمنی بخولقێنێت، چۆن وەڵامی ئەمنی میسری بداتەوە ئەگەر دووچاری لێپرسینەوەبوو، چۆن خۆی وا بسازێنێت گومانی لەسەرنەبێت.

آبراهیم بەکوڵی دیارییەوە گەڕاوەتەوە ماڵەوە، گیرفان تەژی پارە گەیشتۆتەوە ماڵەوە، کە ژنەکەی پرسیاری ئەو هەزار دۆلاری لێکردبوو، ئەو لە وەڵامدا وتبوو:

(من ئەو پارەم وەک پاداشت لە ئیسرائیلییەکان وەرگرتووە، من پێگەیەکی فیدایە فەڵەستینییەکانم نیشانداون، بۆیە ئەوانیش خەڵاتیان کردووم!).

ئەو بەبێ دوودڵی و ترس ئە و قسەیەی لەمستی ژنەکەی نابوو، بە ژنەکەشی وتبوو، لەو رۆژانە پسولەی رێپێدانەکەشمان بۆ قاهیرە دەدەنێ، بۆیەش ژنەکە بەخۆشیەوە مێردەکەی لە ئامێزگرتووەو دڵشادی لە ئاکاری دەربڕیوەو وتوویەتی:

(ئەو فیدائییانە ئیمرۆش نەگیرابووانە، بەیانی هەر دەگیران).

پیاوەکە بە ژنەکەی وتبوو:

(ژنەکە ئەوەی من کردوومە خیانەتە؟!).

ئەویش وەڵامی داتەوەو وتوویەتی:

(پیاوەکە تۆش ئەوەت نەکردبووایە، ئەوا یەکێکی تر، ئەوەی بۆ دەکردن و ئەوانە هەر دەگیران، هەزار دۆلارەکە بووە نەسیبی ئێمە! چاکت کردو دەستت خۆش!).

ابراهیم بە ژنەکەی وتبوو، ژنەکە ئەوانە ریزی زۆریان گرتم، بەڵێنی زۆریان پێداوم، بڕیاریانداوە خۆم و ماڵ و مناڵەکانم بپارێزن، ئەگەر من بەردەوام هاوکاریان بکەم، پارەی زۆرم دەدەنێ، ئەوان لە قاهیرە زانیارییان لە من دەوێت. آبراهیم راستییەکانی بە ژنەکەی وتبوو، ئەوان ئامادەنە بۆ هەر نامەیەک 200 دۆلارم بدەنێ، ئەوان نرخی بازاری ناو قاهیرەیان لە من دەوێت، ژنەکە بەو قسەیە خەنی ببوو، بیرو خەیاڵ دوور رۆیشتبوو. ژنەکە بە پیاوەکەی وتبوو:

(تا من هەست بە ترس نەکەم و دڵنیابم ژیانمان لە مەترسیدانییە، دەبێ لەهەموو نامەکان ئاگادارم بکەیتەوە، هەموو نامەکانم نیشان بدەیت، من مافی ئەوەشم هەبێت ئەگەر دێرێک یان هەواڵێک بەدڵم نەبێت ئەو بڕگەیە لابدەم. پاش ئەو دانوستانە ژن و مێردە کە رێکەوتن، واتە ژنەکە لەپرۆسەکە بووە هاوبەشی مێردەکەی).

****

## سەفەرکردن بۆ تەلئەبیب

لە 19ی نۆڤمبە ری ساڵی 1967 آبراهیم و ژنە کەی بە پێناوی رێکخراوی خاچی سووری نێونە تەوەیی گە یشتنە قاهیرە، حکومە ت بە شێوەیەکی کاتی لە گەڕەکی (المطربة) شوقەیەکی بۆ تە رخانکردن، کە دەزگا رە سمییەکانی پارێزگای سینا لە العریش گواسترایە وە قاهیرە ئەویش گەڕایەوە سەر وەزیفەکەی خۆی، پاش ئە وەی ژیانی کەمێک بەرەو باشی گۆڕا ماڵەکەی گواستە وە گەڕەکی (الامیریة)، لە ویێەوە آبراهیم دەستیکرد بە کۆکردنەوەی زانیاری، ژنەکەی یارمە تیدەدا بۆ نووسینی راپۆرتە کانی بە حبری نهێنی، لە نامەکاندا ژنەکە دەینووسی کەوا ئەو لە هەموو بابەتی گچکەو گەورەکان شەریکی پیاوەکەیەتی، آبراهیم بەو دەستەواژەیە کۆتایی بە نامەکانی دەهێناو دەینووسی: (بژی ئیسرائیلی مەزن!).

دیارە کەوا باری ئابووری آبرهیم بە رەو باشی دە چوو، بۆیە بیری لە بەکارهێنانی پارەکانی دە کردەوە، روو لە بازرگانی جلوبە رگ و کە رەستەی کارە بایی کردە وە، لە بەرئەوەی پارەی باشی هەبوو، بۆیە کە لەکاری رۆژانەی دەوامەکەی دوادەکەوت ئیدارەکەیان گلەییان لێ نەدەکرد، چونکە بەردەوام دیاری دە دایە بەرپرسەکانی ناو دائیرە کەی، بە ردەوامیش نامە و زانیارییەکانی بە پۆستی رۆما دەگەیاندە مۆساد، بۆیە خۆی و ژنەکەی داوەتی رۆما دەکەن، تا بۆ کارو بەرنامەی باشترو گرینگتر بەکاریان بهێنن.

لەمانگی ئۆگسستی ساڵی 1968 بەناوی بازرگانی ژن و مێردەکە بەدەریاوە گەیشتنە لوبنان، لەوێشەوە بەرەو رۆما فڕین و نمایندەی مۆسادیش لە پێشوازیاندابوو، لەوێ دوو پسولەی سەفەری ئیسرائیلی بە ناوی (موسی عمر )و (دینا عمر )یان وە رگرتبوون، بە فڕۆکەیەکی کۆمپانیای (العال)ی ئیسرائیل هە ردوو خائینە کە بەرەو تەلئەبیب دەفڕن، لە فڕۆکەخانەی اللد ئەفسەرێکی مۆساد پێشوازیکردن . ئەوان فێرن بە و شێوە یەو بە گەرمی پێشوازی هە موو بە کرێگیراوێکیان دە کەن، لە ڤیلایەکی نایاب هاتنە خوارەوەو هە شت رۆژ جۆرە ها زانیارییان فێر کردن، شێوەو ناوی فڕۆکە کان، چەکان، وێنەی فۆتۆگرافی و کۆکردنەوەی زانیاری، پاش ئەو کۆرسە چڕوپڕە پلەی عقیدیان بەناوی موسی بەخشی بە آبراهیم، پلەی ئەفسەری یەکەمیش بە ناوی دینا داوەتە ژنەکەی.

لەدیمانەیەکی تایبە تی لە گەڵ سە رکردەیەکی مۆساد ژنە کە داوایکردبوو، با مووچە و پاداشتەکانیان بە گوێرەی کارە زەحمەتەکانیان بێت، ئەو کارەی ئەوان ئەنجامی دەدەن پارەی زۆرتری شیاوە ، مۆساد ریزی ئە رک و ماندبوونی هە ردووکیانی بە رز نرخاندو ستایشی زانیارییەکان کردن، بۆیە بڕیارياندا پاداشتی زۆر باشیان بکەن، هەردووک بە هەگبەیەک مشت دۆلار گەڕانەتەوە میسر، لەو رۆژەوە هەستیان بە لێپرسینەوەی زۆرترکردو زۆرتر کەوتنەخۆ بۆ کۆکردنەوەی وردترین و بە سوودترین زانیاری. وڵاتی میسر ئە ودەمانە لەسەردەمی شە ڕێکی

تایبەتی بوو، فڕۆکە کانی ئیسرائیلی دە گەیشتە قوولایی خاکی میسرو بە ئارەزووی خۆیان مەبەست و خاڵی گرینگیان دەپێکاو ئامانجە مەدەنیەکانیشیان بەوردی دەپێکا. ژن و مێردەکەش سەربەستانەو ئازایانە لەناو ولاتا دەسووڕانەوەو بەئارەزووی خۆیان وێنەیان دەگرت و رەوانەی شوێنە تایبەتیەکانیان دەکرد، وێنەو نەخشەی زۆری کارگەکانیان نارد، بەو ئوتومبێلە نوێیەی کە مۆساد بۆی کڕیبوون، زۆرتر دەگەڕان دەگەیشتنە هەموو خاڵێکی پێویستی دیاریکراو.

لەساڵی 1997 رۆژنامەی معاریفی ئیسرائیلی دیمانە یەکی لە گەڵ (عادل)ی کوڕە گچکەی آبراهیمی جاسووس سازکردبوو، لەوێ وتبووی:

(ئەو رۆژە نیگبەتییەم لەهاوینی ساڵی 1969 تا لەژیاندا ماوم لە بیرناچێت، تێدا لەو رۆژەدا لەگەڵ چرپەو پستەپستی قسەکانی دایکو باوکم لە ژووری نووستنەکەیان بەئاگاهاتم، کە باسی بابەتێکی نامۆو سەیریان دەکرد، دایکم جانتایەکی پێستی دەستی لە دەستدابوو، باوکم دەیویست کامیرایەک لە ناو جانتاکە دابنێت، هەرگیز دایکم وا تووڕە نەدیبوو، بە باوکمی دەووت:

(نا وا نابێت، کامیراکە دەبینن!).

باوکم کامیراکەی دەرهێنایەوەو دووبارە لەناو جانتاکەی دانایەوە، منیش بە رامبەریان دانیشتم، دەمەتەقێیەکەیان گەرم بوو، باوکم دەیووت:

ئێمە بەسەیران دەچینە ئەسکەندریە. لەودەمانە دایکم و باوکم زۆر نیگەران بوون و دەترسان، هەمووماں بە ئوتومبێلەکەمان دەرچووین، هەرچەند لە قاهیرە دووردەکەوتینەوە، باوکم زۆرتر ئارەقەی دەکرد، ئەوەندە ئارەقەیکرد تا هەموو قەمیسەکەی تەڕبوو، بەزەحمەتی قسەی لەگەڵ دایکم پێدەکرا، ئێمەش تێگەیشتین ئەو گەشتەمان وەک گەشتەکانی ترمان ئاسایی نییە، بێدەنگ دانیشتین، لەودەمانە لەسەر هەموو رێگا گشتییەکانی ناو میسر سەربازمۆڵ درابوون، رێگاکە هەموو بنکەو ربایەی سەربازیی بوون، کە لەیەکێک لەسەربازگاکان نزیک بووینەوە، دایکم کامیراکەی دەرهێناو باوکم فەرمانی پێدا، بە زووترین کات وێنەبگرە، زووبە وێنەی زۆر بگرە، خیرابە، دایکم چاکێتەکەی تەنیشت پەنجەرەکەی لاداو وێنەی دەگرت و دەستی دەلەرزی و بە ترسەوە دەیووت، پیاوەکە بەو کارانەت ئێمە دەچینە دۆزەخ، باوکیشم بەتووڕەییەوە دەیووت، ئەوجارە دواجارمانە، تەواو ...! دایکم پرتەو بۆڵەی دەهات و هاواری دەکرد، خۆمان لەزیندان دەبینینەوە، باوکم بەپاڕانەوە دەیووت زووبە، ئەو وێنەیەش بگرە...!

محمدی برام ویستی بپرسێت، ئەوە چ قەوماوە، چ روودەدات، زوو ئەوان وەلامیان دایەوەو خۆیان لە و تووڕەکرد، بۆیە کەسمان چیتر پرسیارمان نە کرد، بێدەنگ ماینەوە، کە

گەڕاینەوە ماڵەوە، باوکم دە رگای لەسەرخۆی داخست، پاش دە مێک دەرگاکەی کردەوەو هاتە دەرەوەو دەستی لە ملی دایکم کردو بە خۆشییەوە وتی:

خۆشەویستەکەم وێنەی نایابت گرتووە، دەستەکانت خۆش.!

دایکم وتبووی:

دەبێ مناڵەکانیش لە مەسەلەکان بگەن، دەبێ بزانن ئێمە چ دەکەین.

تا ئە ودەمانەش شۆک هە موومانی گرتبوو، نە ماندەزانی چ رووده دات. ئەوە یەکەم سەفەرمان بوو، وای لێهات سەفەرەکانمان لەناو هەموو میسر ئاسایی بوو، زۆر دە گەڕاین، هەموو رۆژانی کۆتایی هە فتە دەچووینە شارێک، دەچووینە شارەکانی الاقصرو آسوان و ... شوێن نەما ئێمە بۆی نەچووین، باوکم هەندێ جاریش لەناوەندی هەفتەش لە دائیرە مۆڵەتی وەردەگرت و سەفەری دوورودرێژمان دەکرد، چەند رۆژ دەماینەوە، لەهەموو سەفەرەکان وێنەی پێگەو مۆڵگە سەربازییەکانمان دە گرت، نێوان سە ربازگەکان و رێگا گشتییە کانمان دە پیوا، بە وەش شوێنی کارگەو سە ربازگەکانیان دە ستنیشان دە کرد، بوونی ئێمە ی مناڵیش لە ناو ئوتومبێلە کەو هاوڕێیەتی ئەوان لە سەفەرەکانیاندا گومانی لەکارەکانیان دووردەخستەوە).

****

آبراهیم و آنشراح بە ردەوام سە فەری رۆمایان دە کرد، زۆرجاریش سە فەرەکانیان لەسەرداوای مۆسادبوو، سە فەریشیان دە کردو ئە و هە زارەها دۆلارە ی لە و کارە جاسووسیانەدا دەستیان دەکەوت بەکاریان دەخست و ئیشیان پێدە کرد. تا زۆرتر پارەکە وەرگرن و ئەندامانی تۆڕەکەیان فراوانتربێت، مناڵەکانیان هەموو خستەکارو ئەوانیش بوونە جاسووس.

سەبارەت بە و سە فەرەیان بۆ رۆما، عادلی کوڕیان بە رۆژنامەی معاریفی ئیسرائیلی راگەیاندبوو:

(کە دایک و باوکم لە رۆما گەڕابوونەوە، چە ندین دیاری جوانیان بۆ هێنابووین، جلی باشیان بۆ کڕیبووین، هە ستم دە کرد شتێکی نائاسایی لە ماڵەکەمان روودە دات، زۆر بیرم لە و مەسەلەیە دەکردەوە، تا رۆژێکیان رووبە رووی هە ردووکیان دانیشتبووم، باوکم مە سەلەکەی بڕاندەوەو نهێنییەکەی بۆ درکاندین و وتی:

ئێمە رۆژی رەشمان زۆر بینی، برسیەتیمان بەسەرداهات، نانمان نەبوو، مستێک خوێمان نەبوو، ئیستاش هەموو شتێکمان هەیە، رەوشمان باشە، ژیانمان خۆشەو لە هیچمان کەم نییە، دەبینن منالەکانی چواردەورمان چەند برسین و بەرووتی دەژین، وەک کوێلە لە برسانا دەنالێنن، دیارە ئێوە وەک پاشایان دەژین، راستە من و دایکت بەردەوام کارمانکردووە، مووچەمان هەبووە، لە بازرگانی کارمان باش و سەرکەوتووبووە، بەلام هێشتا ئەو سامانەی زۆرەی هەمانە، ئەو ژیانەی دەژین، لە نیوچەوانی کەسانی تری دڵسۆزە، کەبەردەوام هاوکاریمان دەکەن، دیاری زۆرمان بۆ رەوانەدەکەن، پارەمان دەدەنێ، ئەوانەی رەوشی ئێمە یان گۆری ئیسرائیلیەکانە...! ئەوانە ئێمەیان لەبرسیەتی رزگارکرد، ئەوانە ئێمەیان لەدەربەدەری رزگارکرد، بە خێرو چاکەی ئەوانە وا ئێمە هەموو شتەکانمان بۆ دابینکراوە.! ئەوەدەمانە من تەمەنم 12 ساڵ بوو، هاوینی ساڵی 1971 بوو، نبیلی برام دوو ساڵ لە من گەورەتربوو، محمدی براشم یەک ساڵ لە من گەورەتربوو، من مناڵ بووم ئەو مەسەلەیەم ئەوەندە لا گرینگ نەبوو، باوکم لەکێ کاردەکات و هاوکاری کێ دەکات، منیش وەک هەموو منالەکانی کۆلانەکەمان رقمان لە جوولەکە هەبوو، بەلام لە مالەوە بەشێوەیەکیتر پەروەردەدەکراین، مەسەلەکە لەمالەوەمان روویەکی تری هەبوو، لەمالەوە فێرکرام کەوا من نانی سەرخوانەکەمان لە خێرو بەرەکەتی ئیسرائیلیەکانە، جلە جوانەکانم لە وانەوە سەرچاوە دەگرن، خۆشییەکان ئەوان بۆیان مەیسەرکردووین. کە گەورەتربووم هەستمکرد باوکم چە جۆرە کارێک دەکات، پارەی چۆن دەستدەکەوێت، ترسم لێ دەنیشت، باشم دەزانی ئەگەر کارو سەرچاوەکەم ژیانی باوکمان نەبێت، ئەوا برسیەتی لە ناومان دەبات، ئیفیلج دەبین، من وەک پاشایەک دەژیام، هەموو شتەکانمان بەئاسانی دەهاتە ناودەست).

****

مالەکە هەموویان کەوتنە ناو تۆرەکە، هەموو بوونە جاسووس، ژنەکە حەزی دەکرد مالەکەیان بگوازنەوە گەرەکی دەولەمەندەکان، بەلام مێردەکەی ئارەزووی ژنەکەی قبوول نەدەکرد، بۆیە ژنەکە پێیوتبوو:

(تا نەگیراوین با بە خۆشی بژین).

ئەوان مالەکەیان گواستەوە گەرەکی (الرصر)ی نوێ، منالەکان چوونە خوێندنگای باش. لەو گەرەکە نوێیەدا آبراهیم پەیوەندییەکانی کۆمەلایەتی لەگەل هەمووالایەک خۆشکرد، بەردەوامیش هاموشۆی کۆنە هاوسێیەکانی دەکردەوە، لە ڤیلا گەورەکەیان بەردەوام گەورە ئەفسەرانی سوپای تێدا داوەتدەکرا، میوانی فرۆکەوانی زۆر دەهاتن، کورە گچکەکانی وەک جاسووسی تەمەن گچکەو تازە لەگەل دایکوباوکیان کەوتنە کارکردن، بۆ هێنانی زانیاری لە کورە

ئەفسەرە هاوپۆلەکانی هەموویان پێشبڕکێیان بوو، شە ڕیان لەسەر ئەوەبوو هەریەکێکیان چەند زانیاری و هەواڵی بەسوود بە تۆڕەکەی ماڵەوەیان بگەیێنێت. لەماڵەوەیان فیلمە فۆتۆگرافیەکانیان دەشووشتەوە، منداڵە کانیش دە بوونە پاسەوانی تاقیگە کەی ماڵە وە تا دایکوباوکیان کارە کانیان تەواودەکرد، لەو پیشە یە نبیلی کوڕیان زۆرتر چووە پێشەوەو باوکی فێریکرد بە حبری سپی نامەکان بنووسێت، لە دارشتنی راپۆرتەکان هاوکاری تۆڕەکەی ماڵەوەی دەکرد.

****

بیری شەرمەزاری

ئێوارەیەکیان هەموو بەیەکەوە لە تەلەفزێون تەماشای فیلمێکیان دەکرد، لەفیلمەکەدا پاڵەوانە جاسووسەکە گیراو دادگاش بڕیاری لە سێدارەدانی لەسەردەرکردو هەموویان بەچاوی خۆیان چارەنووسی جاسووسەکەیان لە فیلمەکە بینی، بەدیتنی ئەو دیمەنە ترسناکە هەموویان ترسیان گە یشتێ، ڕە نگیان زە رد هە ڵگەڕاو تووشی شۆک هاتن، ئە و ترسە ماوەی چە ند هەفتەیەک بەرووویانەوە دیاربوو، بۆیەش لەوماوەیەدا هیچ راپۆرتێکیان نە دەناردو چالاکیە کانیان ساردکردبوو. هەموویان ترسی زۆریان لێنیشتبوو و دووچاری ئیفیلجی کردبوون، بۆیەش آنشراح دەستەیەک فیلمی نوێێ تازە وەرگیراوی دەزگاکانی میسری لەگەڵ خۆیدا بردو سەفەری رۆمای کرد، لە وێ دیمانە ی (آبو یعقوب )ی کردبوو، باسی ترسە کەی ناو ماڵە وەی بۆ کردبوو، ئەفسەرەکە بەقسەی خۆش ئارامی کردبۆوە و لە یانەیەکی شە وانە داوەتیکردبوو، شە وەکەی بەیەکەوە مانەوە، ژنەکە بەرووتی خۆی لە باوەشی ئەفسەرەکە دەدۆزیەوە، سەرەتا زۆر دڵتەنگ و نارە حەت بوو، بە ڵام ژنە کەی بۆ تام وە رگرتن لەو پیاوە لە تەلئەبیب سە ردانی کردبوو، بەپەرۆشەوە شەیدایی خۆی بەو دەربڕیبوو.

لەکۆتایی مانگی سپتەمبەری ساڵی 1973 آنشراح بەتەنها سەفەری رۆمای کردبوو، لەوێ دیمانە ی لە گەڵ بە رپرسەکەی دە کردو راپۆرتە کانی پێشکە شدەکرد، لە ودەمانەبوو کە شەڕی مەزنی ئوکتۆبەر روویدا، لەورۆژانەدا سوپای میسری لە هێڵی بارلیف پێشرەوی کردبوو، توانیبووی ئەو هێڵە پتەوە ببەزێنێت و لە کەناڵی السویس بپەڕێتەوە، لەودەمانەدا آبو یعقوب بە گریانەوە دەگاتە لای آنشراح، هە ست بە شکانەکە دەکات، وادە زانن تازە ئیسرائیل رووخاوو هەموو وڵاتانی عە رەبی پشتیوانی سوپای میسریان کردووە، ژنە کەش وە ک ئە فسەرە ئیسرائیلیەکە خەمگین و ترساو تەماشای رووداوەکانی دەکرد.

****

لەئەپریلی ساڵی 1974 آنشراح لە گەڵ ماڵە وە بۆ گە شتوگوزار سە ردانی تورکیای کردبوو، لە ئەنقەرەبوون آبو یعقوب پەیوەندی بە آبراهیم دەکات، داوا دەکات بەزووترین کات

لە ئەسینا ببینێت، لە وێشەوە سەردانی ئیسرائیل بکات، کارێکی بە لەزو ترسناکیان هە یە، لە دەزگای موخابەراتی ئیسرائیل لە تەلئەبیب پرسیاری لێدە کەن، بۆچی لە هێرشەکە ئاگادار نەبوویت، چۆن بۆت نە کرا لە چالاکی سوپای میسری ئاگادارمان بکە نەوە، لەوێ آبراهیم لە وەڵامدا وتبووی:

(من هە ستم بە چالاکی سوپا نە کردبوو، زۆربەی ئەفسەرە خزم و هاوڕێیە کانم بۆ زیارەتی عمرە لە کعبێ مۆڵەتیان وەرگرتبوو، کەسیان لەوێ نەبوون، ئەگەر ئاگاداریش بم، من تەنها دەتوانم بە نامە هەواڵەکانم بگەیێنم، ئەوەش کاتی دەوێ، پەیوەندییەکە ئەوەندە خێرا نییە، بۆیە سوودیشی نابێت).

پاش دانوستانێکی گەرم و زۆر، مۆساد بڕیاری دابوو ئامێرێکی بێتەلی زۆر پێشکەوتوو و نوێی بدە نێ، کە بەهاکەی دە گەیشتە سەرووی سە دهەزار دۆلار، ئیسرائیلییە کان ترسیان هەبوو، ئە وان لە بەرنامەو پلانی فریق (سعد الشاذلی ) دەترسان، ئە و دە یویست شە ڕەکە بەردەوام و دژواربێت، شەڕەکە بگاتە هەموو پارچەیەکی دووری سیناش، بەپێچەوانەی سەرۆک السادات، ئەو دەیویست شەڕەکە تەنها بۆ جولانەوەی مەسەلەکەو رووداوەکان بێت.

بە سێ رۆژ مە شقێکی چڕوپڕیان لەسەر ئامێرە بێتەڵە نوێیەکە بە آبراهیم کردبوو، بەڵام ئەو نەوێرابوو ئامێرەکە لەگەڵ خۆی بهێنێتەوە قاهیرە، ئەوان بۆیان پێشنیاریانکردبوو، کەوا ئامێرەکەی لە خاڵێکی کیلو 108 لەرێگای قاهیرە سویس بۆ دادە نێن، لەوێ ئامێرەکە لەناو بەرمیلێکی ئاوی گە ورەی بێ سوودی کون ل ە بن خۆڵ بۆ دە شارنەوە، شوێنەکەش لە پشت دیوارێکی چیمەنتۆیی رووخادەبێت. ئیسرائیلییەکان پێیدەڵێن کە ئێوە گەڕاونەوە ماڵەوە، بچنە شوێنەکەو بە هەڵکۆڵینی نیو مە تر ئامێرەکە دەردەکەوێت. لەگەڵ وەرگرتنی هەواڵەکەو دانانی ئامێرەکە، مۆژدەی دووقاتکردنی مووچەکەی دەدەنێ، پێیدەڵێن:

(ئەگەر هە واڵی پێشینە ی شە ڕێکمان پێرابگە یێنن بە یەک ملێون دۆلارت خە ڵاتت دەکەین.!).

ماڵەوەی جاسووسەکە لە ئەسینا چاوە روانی پارە حەرامەکەیان دە کردو بە یەکەوە گەڕانەوە میسر. کە گەڕانەوە قاهیرە سواری ئۆتومبێلەکەیان بوون، بە رەو خاڵی کیلۆ 108 بەڕێکەوتن، لەوێ انشراح دەست بە خاکەناسەوە خەریکی هەڵکۆڵین بوو، کە ماندووبوو عادل خاکەناسەکەی لێوە ردەگرت، ئامێرەکەیان لە ناو کیسە یەکی پلاستیکی لوولدراو دۆزیە وە، کە گەڕانەوە ماڵەوە آبراهیم کۆششی زۆری کرد، نە یتوانی ئامێرەکە بەکاربهێنێت، دیارە لەگەڵ دەرهێنانەکە سەرەکەی شکابوو، کە زانیان شوێنی کلیلە کەی شکاوە، هە موولایەک دڵتەنگ لەدیار ئامێرەشکاوەکە دانیشتن، لەودەمانە ژنەکە بڕیاریدا سەفەری لەناکاو و ئازایانەی ئیسرائیل

بکات. لە 26 ی یولیوی ساڵی 1974 آبو یعقوب بەدیتنی ژنەکە سەرسام بوو، چۆن ئەو ژنە هاتووە، چەند شەوێک بەیەکەوە مانەوە، لەپاداشتی سەفەرەکەی 2500 دۆلاری وەردەگرێت و مووچەکەشی 1500 دۆلاریشی بۆ براوە تەوە، کە لە و رۆژانە فەرمانبەری ئاسایی دە رچووی زانکۆ تەنها مانگانە 17 پاوەندی میسری وە ردەگرێت. لەودەمانەی ژنەکە لەگەڵ ئەفسەرێکی مۆساد لە تەلئەبیب دەسووڕایەوە، پیاوەکە توانی ئامێرەکە بەکاربهێنێت، بەئیشکردنی ئامێرەکە موخابەراتی میسری بە ئامێرێکی زۆر هە ستیاری سۆڤیەتی بەناوی (گیرەی شەپۆڵەکان) زوو هەستی بە شەپۆڵەکە کردبوو، بۆیە یەکسەر مەفەرەزەیەک ناوچەکەی پشکنیبوو، کە جاری دووەم ئامێرەکە دەنگی لێوە هاتبوو، یەکسەر ئامێرەکەو شوێنەکەو خاڵەکە دەدۆزرێتەوەو دەچنە سەریان و ئامێرە ئیسرائیلییەکە دەگرن!

لە 5ی ئۆگستی ساڵی 1974 موخابەراتی میسری آبراهیمی گرتبوو، کە گیرابوو یەک وشەی لە زاری نەهاتبووە دەرەوەو هەموو گیانی لەرزیبوو، لەودەمانە وتبووی:

(من پەشیمانم، من شەرمەزارم... برسیەتی کافرە... نسکۆکە وای بەسەرهێناین.. من بۆ ئاردو چا خۆم فرۆشتە جوولەکە...!).

پیاوانی موخابە راتی میسری ماڵە کەیان ورد پشکنیبوو، ئامێرە کەو شوفرە کەیان دەدۆزنەوە، کابرا قۆڵبەستدەکەن و بە سەرشۆڕی دەیدەنە پێش خۆیان، تیمێکی سێ کە سیش لەگەڵ مناڵەکانی دەمینێنەوەو چاوەروانی گەڕانەوەی ژنەکەیان لە تەلئەبیب دەکەن. لە 24ی ئۆگسستی و بە فڕۆکەیەکی هێڵی ئاسمانی ئیتاڵی گە شتی ژمارە 791 ژنە جاسووسەکە لە ئیسرائیلەوە دەگاتەوە رۆماو لە وێشەوە دێتەوە قاهیرە . ژنەکە یەک مانگ بوو لە قاهیرە دەرچووبوو، لەناو فڕۆکەخانە بەئارەزوویەکی خۆشییەوە عارەبانەکەی پاڵدەداو جانتا گە ورە پڕ دیارییەکانی بەخۆشییەوە بەرەو دەرەوەی ساڵۆنی دەرچوون دەبرد، لەگەڵ دەرچوونییدا چاوی لە مێردەکەی و مناڵەکانی دەگێڕا، لەدەرەوەش چاوی لە ئۆتومبێلەکەیان گێڕابوو، کە تێگەیشتووە کەس چاوەروانی ناکات، بە ناچاری تاکسییەکی راگرتووەو بەرەو ماڵەوەیان لە شاری (الصدر) رۆیشتووە. کە دەرگای ماڵەوەی کردیتەوە هەموو گیانی هەژاوە، کە زانیویەتی چەند میوانێک لە ماڵەکەی چاوەروانی دەکەن، دووچاری شۆک هاتووە ، لە ترسانا میزی بەگیانی هاتووتە خوارەوە، یەکێک لە ئەفسەرەکانی ناو ماڵە کەی جانتاکەی دەستیان لێوە رگرتووە، هە ردوو کلیلەکەی ئامێرەکەی بێتەڵەکەی دەرهێنابوو، لەناو جانتاکەی هەزارەها دۆلاریش دە دۆزنەوە، ئەفسەرێکی تریان کە لەپچەیەکی ئاسنی لە دەستی دەکات و لە گەڵ سێ کوڕە کەی بەرەو باڵەخانەی موخابەراتی میسری بردوویانە.

موخابەرابەتی ئیسرائیلی ئاگای لە هیچ نەبوو، ئاگاداری گیرانی سەری تۆڕەکە نەبوو، نەیدەزانی آبراهیم و مناڵەکانی گیراون، ئەوان چاوەروانی وەڵامی کلیلی ئامێرەکەبوون، لەناکاو نامەیەکیان لە موخابەراتی میسری پێگە یشتبوو، تێدا لە وەڵامدا بە مۆساد دەڵێن نامەکانتان

راگرن، چیتر که ستان نه ما له و ئامێره ئێوارانی یه کشەمموان نامه کانتان وه رگرێت، جاسووسەکەتان بەژن و مناڵەکانییەوه گیران.!

له 25 ی نۆڤمبه ری ساڵی 1974 لەلایەن دادگای باڵای ئه منی دەوڵەت بڕیاری لەسێدارەدانی (آبراهیم شاهین)و (آنشراح موسی)ی ژنی ده رچوو، کوڕه گەورەکەیان نبیل 5 ساڵ بڕیاری زیندانیکردنی بۆ ده رچوو، له بەرئەوەی دوو کوڕه کەی تری ته مەنیان گچکه بوو، ئەوان رەوانەی دادگای نەوجەوانان کرابوون.

لەرۆژی 16 ی ینایری ساڵی 1977 آبراهیم بۆ جێبه جێکردنی بڕیاره کەی دادگا راپێچی زیندانی ئیستئنافکرا، له بەرئەوەی شه نگی هه ڵسانەوەو رۆیشتنی نه مابوو، دوو سه رباز بنهەنگڵیان گرتبوو، کەزانی دواساتی ژیانیەتی و لەسێداره دەدرێت، دەپارایەوەو هاواری دەکرد:

خودای گەوره لێمان خۆش به، خودایه لێمان خۆش به...!

پاش ئه وەی مه ڵای زیندانه که شەهادی پێ ده ڵێتەوە، به چەند چرکه یەک له سێدارەیاندا. سەبارەت به چارەنووسی ژنه کەش چه ند بۆچوونێک ده گوترا، تا رۆژی 26ی نۆڤمبەری ساڵی 1989 رۆژنامەی حداشوتی ئیسرائیلی بەسەرهاتی جاسووسی ئەو ژنەی لەسەر لاپەرەکانی پێشه وەی بڵاوکرده وه، له وێ ئاشکرابوو که وا سه رۆک السادات له لایەن حکومه تی ئیسرائیلی فشاری زۆری له سەربووە، بڕیاری له سێدارەکەیان بۆ زیندانیکردن به 15 ساڵ بەکاری قورسه وەی بۆ ده گۆرێت. که بڕیارەکەیان گۆ ڕیەه به فەرمانێکی سه رۆکایەتی به ر لێبووردنی سه رۆکایەتی دەکەوێت و خۆی و هه ر سێ کوڕه کەی ره وانەی ئیسرائیل دەکرێن، دەڵێن ئەوەیان به گۆڕینەوەیەک بوو، که کەس و مه بەستی به رامبەرەکەی ئاشکرا نه کرا، که ئەو خێزانه گەیشتنه ناو ئیسرائیل هه موویان رەگەزنامەی ئیسرائیلیان پێ به خشراو بڕوایان به ئاینی جوولەکه هێناوەو ناوی (شاهین) گۆڕاوه به ناوی (دیڤید)و ناوی ژنه کەش کراوه به (دینا)و ناوی (عادل)یش کراوه به (رافی) و ناوی (نبیل)یش کراوه به (یوشع)و ناوی (محمد)یشیان گۆڕیبوو به حاییم!

عادل لەدیمانەیەکی تایبەت به رۆژنامەی معاریف وتبووی:

(دواجار که دایکم بۆ کەرەستەی ئامێره بێتەڵەکه سەفەری ئیسرائیلی کردبوو، باوکم لەسەرکار به مەلوولی گه ڕایەوە، هه ستمکرد ره نگی گۆڕاوه و له سەر کورسیه ک دانیشت و بەنەرمی به منی وت:

وادەزانم گیرام، دیاره له دائیره له منیان پرسیوە!

باوکم ماوەی حه وت ساڵ له کاری جاسووسی به هەستێکی تیژ کا ریکردووە، دیاره هەستی به ترسناکی کردبوو، بۆیه ئەو رۆژه ئەو قسه یەی کردبوو، ئه و رۆژه 6 فیلمان له

ماڵەوەمان هەبوو، باوکم هەموو فیلمەکانی دڕاندو نامەکانی سووتاندو تێکە یشت گە یشتووتە خاڵی کۆتایی، تا ئیمرۆش بیر لەوە دەکەمەوە، بۆ باوکم ئەودەمانە بیری لە دەربازبوون نەکردەوە، بۆ لە ماڵەوە ماینەوە؟ بەیانیەکی زوو بەتوندی لە دەرگای دەرەوەماندرا، سێ کەس هاتنەژوورەوە لە باوکمیان پرسی، منیش وتم، باوکم لە سەرکارە، وتیان کە لە ماڵەوە نییەو لەسەر کارە ئێمە چاوەروانی دەکەین، دوو کە سیان لە ساڵۆنەکە دانیشتن، کەسی سێیەمیشیان لە پەنا دەرگاکە دانیشت، من و براکانم بیرمان لە فەوتاندنی بەڵگەنامەکان کردەوە، بەڵام دۆلابەکان داخرابوون و کلیلەکان لەلای باوکم بوون . ئەودەمانە کاتەکە نەدەرۆیشت، ساعەتێک بە رۆژێک بوو، هەستمکرد کاروانێک ئوتومبێل بە رەو ماڵە کەمان دە هات، ئوتومبێلە کەی باوکم بە دەیان ئوتومبێل دەوری گیرا، دەیان سەرباز دابەزین، هاتنە ناو ماڵەکەمان، سەربازەکان بەسەرفرازی و بەدڵی زۆر خۆشە وە ماڵەکەیان دەپشکنی، کە ئامێری بێتەلەکەیان دۆزیەوە هاواریان دە کرد، بەگەرمی پیرۆزباییان لەیەکتری دەکرد، لەودەمانە باوکم سەری بۆ ئێمە نەوی کردو وتی:
کوڕەکانم داوای لێبووردنتان لێدەکەم).

عادل سەربردەی گیرانەکەی دایکیشی بەو شێوەیە بۆ رۆژنامەکە گێڕاوەتەوە:

(دایکم بەیانی رۆژی 24 ی ئۆگستی زۆر بەتووڕەییەوە هاتەوە ماڵەوە، چۆن باوکم لە فڕۆکەخانە پێشوازی نەکردووە، کەسمان لەوێ نەبووین، کە گەیشتە ژوورەوە یەکەم قسە وتی، کورەکان کوا باوکتان؟ کە سەری بە رزکردەوەو سە یری چواردە ورەی ماڵەکەی کرد، زانی پیاوانی موخابەرات گەمارۆیانداوە، یەکێکیان وەڵامی دایەوەو وتی:
الحمدلله بە سەلامەتی هاتیتەوە مادام دینا.
یەکسەر دایکم گیراو رە وانەی باڵەخانەی دەزگای موخابە راتی میسریکرا، ئە و باڵەخانەیەی ئێمە چەندجار بۆ مۆساد وێنەی زۆرمان گرتبوو).

# ناوی چەند دەزگایەکی هەواڵگری لە جیهان:

1. دەزگای موخابەراتی ئەمریکی CIA
2. دەزگای موخابەراتی سۆڤیەتی جاران KGB
3. دەزگای موخابەراتی گشتی رووسی SVR
4. دەزگای رووسی بۆ قەڵاچۆکردنی جاسووسیەت MB
5. دەزگای ئاسایشی ناوخۆ MBD
6. دەزگای موخابەراتی سەربازی رووسی BRU
7. دەزگای موخابەراتی گشتی ئیسرائیلی (مۆساد).
8. دەزگای موخابەراتی سەربازی ئیسرائیلی.
9. دەزگای ئاسایشی ناوخۆی ئیسرائیلی (شین بیت).
10. دەزگای موخابە راتی دە رەوەی بە ریتانی (نووسینگەی شە شەم) M16
11. دەزگای م وخابەراتی دە رەوەی بە ریتانی (نووسینگەی پێنجە م) M15
12. دەزگای موخابەراتی گشتی فەرەنسی (نووسینگەی دووەم).
13. دەزگای موخابەراتی گشتی ئێرانی (ساڤاک).
14. دەزگای پۆلیسی نهێنی نازی پێشوو (جیستابو).
15. مباحسی فیدرالی ئەمریکی FBI
16. موخابەرایەتی سەربازی ئەڵمانی فیدراڵ MAD
17. موخابەرایەتی ئەڵمانی دژە جاسووسیەت BND

---

لەرۆژنامەی (الجريدة)ی کویتی لەرۆژانی 29و 30ی دیسەمبەری ساڵی 2008 بڵاوکراوەتەوە.

# ئیلی کۆهین ترسناکترین جاسووس لە مێژووی ئیسرائیل

کە لەمانگی فبرایری ساڵی 1958 یەکێتی میسرو سوریا ڕاگەیاندرا ئیسرائیل هەستی کردووە مەترسییەکان زۆرتربوون و دە بێ پلانەکانیان بەو ئاراستەیە ببەن، یەکێتی عەرەب بگۆڕێت و کاربکات یە کێتیەکە نەبێت و سەرنەگرێت، چونکە لەدواڕۆژ لە ئەنجامی ئەو یەکێتیە سیاسییە چارەنووسی ئیسرائیل دەکەوێتە مەترسی، چونکە یەکێتی سەربازی عەرەبی هەڕەشەی نەمانی لێدەکات. بۆیە پیاوێکی بە وەچە سوری، میسری پەروەردەکراو، بە جوولەکە ئایین، دەدۆزنەوە تا کارێک بکات پەیوەندییەکانی میسری و سوری بروخێنێت.

لەپاش ئەوەی لە 28 ی سپتەمبەری ساڵی 1961 یەکگرتنەوەکەی میسرو سوریا شکستی هێنا، ئیسرائیلییە کان هەناسەی شادومانیان هە ڵکێشا، ئەوەش وە نەبێ گە لی سوری هزری سەرکردایەتی (جمال عبدالناصر)یان پشتگوێ خستووبێت، چونکە ئەگەری یەکبوونەکە هەرمابوو، بۆیە موخابەراتی ئیسرائیلی بۆ لە باربردنی یەکبوونەکەی نیوان ئە و دوو وڵاتە کارکەربوون. (لیڤی ئاشکۆل) سەرۆک وەزیران بە سەرۆکی مۆسادی وتبوو:

یەکەمجار کە سورییەکان بیرۆکەی یەکبوونەکەیان لەگەڵ میسر پێشنیارکرد، ئێمەیان بەتوندی هەژاند، بۆیە نابێ بواربدەین جارێکیتر ئەو هەواڵ و بەرنامەیە بمانهەژێنێت.

سەرۆکی مۆساد لە ئاگادارکردنەوەکەی سە رۆکە نوێیەکەی باش تێگە یشتبوو، لەودەمانە کەسایەتی بە کرێگیراوێکی خۆیانی ب ە بیرهاتووتەوە، کە ماوەیەکی زۆرە مەشقی پێدەکەن، ئەویش (ئیلی کۆهین)بوو، ئەو لە دیسەمبەری ساڵی 1924 لە شاری ئەسکەندریەی میسر لە دایکبووە، بە ڕەچەڵەک سورییە و بنە ماڵەکەی هاتوونە تە میسر، حە وت برای هە بوو، هەموویان ڕەگەزنامەی میسریان هەبوو، لەوێش دەچێتە زانکۆو لە ساڵی 1944 دەبێتە ئەندام لە ڕێکخراوی گەنجانی جوولەکە لە ئەسکەندریە، لەودەمانەوە ئەو دڵسۆزی بۆ ڕێکخراوە کەو پاشانیش بۆ دەوڵەتی ئیسرائیلی هەبووە، کە دەوڵەتی ئیسرائیل دامەزراوە، هەموو بنەماڵەکەی دەچنە ئیسرائیل تەنها ئەو نەبێت، ئەو وەک کەسێکی کارکەرو بەکرێگیراو بۆ ئیسرائیلی تازە دامەزراو دە مینێتەوەو لە گەڵ دە ستەیەکی تری جوولە کە بۆ کاری پێویست و پابە ند بە دەوڵەتەکەیان دە مینێتەوەو ئامادە یی کارکردن نیشاندە دات کە هەموو کاتێ لە خزمەتیاندا کاربکات.

لە 15ی یولیۆی ساڵی 1954 چەند تەقینەوەیەک دەزگا بریتانی و ئەمریکییەکان و چەند سینەمایەکی لەناو قاهیرەدا، وڵاتەکەی هەژاند، بۆ بەیانیەکەی چەند تەقینەوەی ترسناک و کاوڵکارانە شاری (ئەسکەندریە)شی گرتووتەوە، لەبەرئەوەی ئیخوان المسلمین دژی پرۆژە ی ڕێکەوتن بوو لە گەڵ بریتانییەکان، بۆیە زوو ئەوان بەو کارانە تاوانبارکران، پاش لێکۆڵینەوەو چاودیری ورد حکومە تی میسری بۆی روونبۆوە ، کە وا ئە و کارە تێکدەرانە بەدەستی چەند گەنجێکی جوولەکەبوو، لە وانە 12 گەنجی جوولە کە گیران بە تاوانی ئە و کارە تیرۆریستانە دادگایی کران. چالاکییەکە بەناوی (سۆزانا) ناسرا، هەروەها ناوی (شەرمەزاییەکەی لافۆن)یشی

لێنرابوو. کۆهین یه کێک بوو له و 12 گەنجی بەو کێشه یەوه دادگاییکران، به ڵام له دادگای تاوانەکەی له سەر ساخ نه بووتەوە، بۆیه ئازادکراوە، بە ڵام چاوه کانی پیاوانی ئه من به ردەوام چاودێری وردیان کردووە، بۆیه بەناچاری سەفەری ئیسرائیلی کردووەو لەساڵی 1957 سنووری بڕیوەو له ئیسرائیل دامەزراوەو وه ک ژمێریارێک له یه کێک له کۆمپانیاکان کاریکردووە، بەڵام ئەو بەردەوام چاوی له کاری جاسووسی بووە، دووجار خۆی سەردانی دەزگای مۆسادی کردووەو حەزی له کاری جاسووسی کردووە و ئه و ئاره زووی بۆیان ورووژاندووە ، به ڵام هه ردووجار بەرسڤی رازیبوون و ئه رێ وه رنەگرێت، تا رۆژێکیان کا برایەک دە ستی ده گرێت و موژده ی ئەوەی دەداتێ کەوا مۆساد ئامادە یه کاری پێبکات، ئه گەر له ئەزموون و مه شقه تایبەتیەکانی پێویست دەرچوو و تێگه یشت ئەو کاره مەترسی زۆرەو ژیانی ده کەوێته مەترسیش. که باسی ترس و مردنیان له گەڵ کردبوو که مێک نیگەران ببوو، ئاره زووی جارانی نه مابوو، به ڵام رۆژێکیان لەناکاو فەرمانی دەرکردنیان له سەر کارەکەی بۆ دەرکردبوو، ئەویش زوو تێگەیشتبوو کەوا ئه و نانبڕینه لەلایەن موخابه راتەوە بووە، بۆیه بەناچاری خۆی ته سلیمی مۆسادکردووە و بڕیاری کارکردنی بۆ بەرژەوندی ئەوان دابوو.

سەرەتا ئه وان چه ند راهێنانێکی ساده و ئاساییان پێکردبوو، فێری چه ند ئامێرێکی پێویستیان کردبوو، یەکەم هەنگاو پێیانوتبوو:

(دەبێ تۆ له تەلئەبیبەوه بچیته قودس، له وێ روو له کاری که رتی گه شتوگوزاری بکەیت. لەوێ پا سپۆرتێکی فه رەنسیان به ناوی جووله کەیه کی میسری بۆ کردبوو، له وانەی له میسرەوه گەیشتبوونه وڵاتی خوارووی ئه فریقیاو ئێستاش بۆ ماوه یەکی کاتی له ئیسرائیله، بەو پاسپۆرتەوه ده رۆژ له قودس دەمینێتەوە، ئەو لەو رۆژانەدا تەنها بەزمانی فەرەنسی و بەزاراوەی میسریش قسه دەکات و ناوی کرابوو به (مارسیل کویان)، پێشان پێیانوتبوو، ناکرێ ئه گەر بشکوژرێت ناوه کۆنەکەی خۆت بڵێیته وە، یان هه لەیەک بکه یت، بە ردەوام خۆت چاودێری خۆت بکە. لەکۆتایی مانگی دیسمبه ری ساڵی 1960 ئەو بۆ کارکردن له وڵاتێکی عەرەبی و سازو ئاماده بوو، ده بووایه کار بۆ رووخانی هزرو به رنامەی یه کبوونی میسری سوری بکات، دەبووایه ئەو بگاته کەسه نزیکەکانی دەسەڵات و لەناو ئەو بازنەیەدا کار بۆ کودەتایەک بکات، دەبووایه بچێته میسر یان سوریا، به ڵام له کۆتاییی بڕیاریاندابوو ئه و نه چێته میسر، با چالاکییەکەی له ناو سوریا بکات، چونکه زەمینەی ناو سوریا بۆ ئەو کاره لەبارتربوو. مۆساد سەرەتای بەرنامەی کارەکەی کۆهینی له ئەرجنتینه وه بۆ دانابوو، ئەوەشیان لەبەر دوو هۆکاربوو، یه کەمیان مولحه قه سەربازییەکەی سوری لیوا (ئەمین حافیز) لەوێ بەوه ناسرابوو، زۆر دژی یه کبوونی میسری سوری بوو، زۆریش رقی له رژێمی جەمال عەبدولناسربوو، دیاره ئەویش بیرو حەزی کوده تای سه ربازی لەناو سوپای سوری هه بوو، دەبووایه کارو بەرنامەیەک بۆ ژیان و گەیشتن به سوریای بۆ سازبکه ن، بۆیه ئەفسەرەکەی مۆساد پێیوتبوو، من ژیاننامه ی رۆژانەی ئەرجنتینت بەو شێوه بۆ دادەرێژم، کەوا تۆ له بەیروت لەدایکبوویت، له تەمەنی سێ ساڵییه وه

بەماڵەوە چوونەتە ئەسکەندریەو لەورۆژەوەش ناوت دەبێتە (کامل ئەمین سابت)، ناوی دایکت (سعیدە ئیبراهیم)ە، بەڕەچەڵەکیش ئێوە سوریین و ساڵێک پاش مردنی خوشکێکت هاتوونە تە ئەسکەندریە، لەورۆژەوە تۆ کوڕی بازرگانێکی کاری رستن و چنینیت، بۆیەش لەساڵی 1946 باوکت سەفەری ئەرجنتین دەکات، پاش ماوەیەکی کورت نامەیەکت بۆ دەنووسێت تۆش بچیتە ئەرجنتین، لەساڵی 1947 ئێوەش بەماڵەوە دەچنە ئەرجنتین، لەوێ باوکت لەگەڵ بازرگانێکی ئەوێندەرێ لە (بیونس ئایرس) دەبێتە شەریک، بەڵام باوکت لە بازرگانیەکەی زەرردەکات و پارەی نامینێت و لەساڵی 1956 باوکت لەخەفەتا دەمرێت، شەش مانگ پاش مردنەکەی ئەو دایکیشت دەمرێت، تۆش لەگەڵ مامێکت کار لە نووسینگەیەکی گەشتوگوزار دەکەیت، لەو کارە سەردەکەویت و پارەیەکی زۆرت دەستدەکەوێت).

بەو شێوەو بەو بەرنامەیە ئەفسەرەکە قسەکانی تەواودەکات و پێیدەڵێت:

(ئێستا دەتوانی بچیت بەلای کاری خۆتەوەو ئێمەش هەموو پێویستیە رەسمیەکانت بۆ ئامادەو سازدەکەین، بەیانیش پەیوەندییمان پێوەدەگریت).

لەودەمانە ئەفسەرەکە بەناوە نوێیەکەی بانگی دەکات و پێیدەڵێت:
(کامل...!).

ئەویش لەبەرئەوەی دەرسەکانی باش وەرگرتبوو، بۆیە یەکسەر ئاوڕی لێ دەداتەوە، ئەفسەرەکە ئافەرینی لێدەکات و پێیدەڵێت، بەراستی وەک عەرەبێک جولایتەوە، ئەوەی ماوە تۆ سمێڵێکی گەورەش بۆ خۆت پەروەردە بکە. لەورۆژەوە موخابەراتی ئیسرائیلی بە رێگای نوێنەرێکیان لە ئەرجنتین بەردەوام چاودێری کۆهینیان دەکردو دیمانەیان دەبوو، ئەو کە گەیشتبووە ئەوێندەرێ هەمووشتیان بۆ سازکردبوو، لە بانک پارەیان بۆ دانابوو، بە ناوی (کامل ئەمین سابت) شوقەیەکیان لەگەڕەکی (کۆلی) لەناو سەنتەری شاری بوینس ئایرس بۆ گرتبوو، مامۆستایەکیان لە یانەی عەرەبە موسلمانەکان بۆ گرتبوو دەرسی زمانی ئەسپانی پێ دەووتەوە، خەڵکی زۆریش لە عەرەبە پەناهەندەکان سەردانی ئەو یانەیان دەکرد، لەوێ بایەخی زۆری بە (جورجیت) کیژە گچکەکەی (هوار)ی ناودار دەدا، کە لەکۆمپانیای (اسو)ی پترۆڵی بەرپرسی لقە ناوخۆییەکانی بوو. ناوی کامل سابت لە ناو خێزانە سوورییەکان بە باشە زوو بڵاودەبێتەوە، ژمارەیەکی زۆر یش ئەویان ناسی، وەک گەنجێکی خۆش ناوی دەهات، بە تایبەتی لە ناو مێینەکان، هێدی هێدی گەیشتە ناو دەستەی کەسە ناودارەکان، هەفتانە سێ جار سەردانی یانەکەی دەکرد، لەوێ خۆی وەک کەسێکی نەیارو دوژمنی سەرسەختی زایونیزم دەردەخست، ماوەماوەش لەناو رۆژنامەی (الوطن العربي) کە دەستەیەک لە رۆشنبیرانی یانەکە بە زمانی عەرەبی دەریاندەکرد، ریکلامی بڵاودەکردەوە، بۆیە خاوەنی رۆژنامەکە (عبداللطیف حسان) دەبێتە هاوڕێی نزیکی ئەو، لەگەڵ ئەو دەچێتە داوەتێکی رەسمی سەفارەتی سوری، لەوێش

هاوسەری مولحە قی بازرگانی سە فارەت یادی رۆژی بوونیشی سازدە کرد، حسان بە کامل دەڵێت:

(هاوڕێم دەزانی ژنەکەی مولحەقی بازرگانی زۆر بە کەسایەتی تۆ سەرسام بوو، دیارە باش سەرنجی ئەوت بۆ لای خۆت راکێشابوو!).

بەڵام ئەو بە هاورێیەکەی دەڵێ، نەخێر ئەفسەرەکە سەرنجی منی راکێشابوو، ئەو پیاوە تەمەن سە رووی حە فتا ساڵانە کەسایەتیەکی بە رچاوی هە بوو، بۆیە حسان دە ستی کامل دەگرێت دەیباتە لای ئەفسەرەکەو بە ئەفسەرەکە دەڵێت:

(جەنابی لیوا (ئەمین حافیز )، ئە و کوڕە شەریفە سوریەت پێدە ناسێنم، بە راستی کەسێکی وڵاتپارێزەو هەتا بڵێت کەسێکی چاکە).

بۆیەش کامل تە ماشای حسان دە کات و دە ڵێت، بە راستی ئەوە لیوا ئە مین حافیزی مولحەقی سەربازی سەفارەتە.! لیوا حافیز کەسێکی کەمدوو بوو، حەزی لە ئاخاوتن نەبوو، بەڵام ئەو توانی بیدوێنێت و پێیبڵێت، من لە و رۆژانە هەستدەکەم لەناو خەڵکی لە سوریا نیگەرانی و دڵەراوکێ لەسەر رەوشی سیاسی لەئارادایە، حافیزیش لە وەڵامدا وتبووی:

(بەڵێ ..! دیارە کەوا جەمال عبدالناسر رەوشەکەی بۆ بەرژەوەندی و سیاسە تی خۆی قۆرخکردووە، سیاسەتەکە بەو ئاراستە یە بڕوات سوریا داگیردە کات و جلە وی هە مووشتە کان دەخاتە بندەستی خۆی، ئە گەر شتە کان لەبندەستی من بێت و دە ستم لە وڵات بڕوات، ئە و یەکبوونمان لەگەڵ میسر دەرووخێنم و عبدالناسرو ئیسرائیلیش بەیەکەوە لەناو دەبەم).

کامیلیش دەپرسێت:

(تۆ وادەزانی سوریا بەتەنها دەتوانێت ئەوە بکات؟).

لیوا حافیز وەڵامی دەداتەوەو دەڵێت:

(من ئیمانم بەوە هەیە، بەڵام دەبێ سەرەتا رژێمی سیاسی وڵاتەکەمان بگۆڕین، ئەوانە بە دروشمەکانی عبدالناسر باش هەڵخەڵەتاون).

کامیلش لەوەڵامی لیوا تووڕەکەدا دەڵێ:

(گەورەم ... ئەگەر لەناو سوریا چەند کەسێکی وەک تۆ هەبووایە، رەوشەکە دەگۆڕاو گۆڕانی سیاسی لە بەرژەوەندی وڵاتەکەمان روویدەدا. ئێستا چارەنووسی سوریا لە ئاقارێکیتر دەبوو، ئەوەش تەنها بەسەرکردەیەکی بەتواناو بەئەزموونی وەک تۆ دەکرێت).

کامیل بە و قسانەی جوان مە بەستەکانی دەپێکا، لەبەرئەوەی لیوا حافیز لە ودەمانەدا پەیوەندی بە دەستەیەکی سەربازی لەناو وڵات بۆ رووخانی رژێمەکە بە کودەتایەکی سەربازی هەبوو، بۆیە دۆستایەتی و پە یوەندەییەکانی ئە و دووکە سە زۆر پتە ودەبێت. لەودەمانەدا موخابەراتی ئیسرائیلی داوای کۆهین دەکاتەوەو ئاگاداری دەکاتەوە، کاتی ئەوە هاتووە تۆ بچیتە ناو سوریا، تا لە ناو سوریا بە باشی کارەکانت راپەرێنێت، هەموو کەرەستەو پێویستیەکانیان بۆ دابینکردوویت، دە زگاکانی گە یاندنیان بۆ دا بینکردوویت. تا بچیتە ناو سوریا ، ئەو بەدەریا گەیشتووە ناو شاری بەیروت، لەوێ بازرگانێکی سوری دە ناسێت، ئەو کارمەندانی گومرگ و سنووری سوریای دە ناسێ و بە بەخشینی پارە یەکی زۆر بازرگانە سوریەکە توانیبووی کەلوپەلەکانی کامیل بە بێ تەماشاکردن دەربازبکات. ئەو وەک بازرگانێکی سوری گە یشتە ناو دمشق، لە گەرەکی (ابو رمانة ) لەبەرامبەر بینایە ی سە رکردایەتی سوپای سوریی ڤیلایە کی بەکرێگرتبوو، ڤیلاکەی ئەو لەنزیک دیوەخانەی گەورە بەرپرسانی حکومەتی سوری بوو، خاوەن موڵکەکە داوای کرێی پێشینەی یەک ساڵی لێدەکات، ئەویش بێ بیرکردنەوەو دوودڵی 1300 پاوەندی لەدەستی دەکات، کابراکە بەزووترین کات هەواڵی کرێچییەکی دەوڵەمەندی خۆی بە هاوسێیەکانی دەگەیێنێت، کە هاتنی هاوسێیە دەوڵەمەندەکە لە دەڤەرەکە بڵاودەبێتەوە، هەموویان هەڵپەی ئەوە دەکەن سەردانی بکەن.

****

لەورۆژانەی کامیل گە یشتبووە دمشق چەند هە فتەیەک بوو یە کبوونەکەی میسرو سوریا هە ڵوەشابۆوە، بۆیە ش موخابە راتی ئیسرائیلی داوایکردبوو ئە و بە زووترین کات بگاتە سوریا، هەموولایەک وایاندەزانی هەوادارانی یەکبوونەکە کودەتایەکی سەربازی دەکەن و تۆڵەی هەڵوەشانەوەکە دەکەنەوە، بۆیە ش ئەودەمانە حکومەتی سوری سە رقاڵی بە رنامەو کاریتربوون، نەدەپرژانە سەر هاتن و کارکردنی ئیسرائیلی یەکان، بیریان لە وە نەدەکردە ئەو بێدەنگی و غافڵگیرییە دەبێتە مەرگ و گۆڕستانی هەموولایەکیان. کۆهین خۆی ئارەزووی کاری جاسووسی لەناو ئیسرائیل هە بوو، نە ک لە سوریا، ئە و لە خوێندگاکانی ئەسکەندریە فێربووەو زاراوە ی میسری چاک زانیووە، ئەوەو ئەو دەیویست تۆڵەی هەرەسهێنانی چالاکییەی سۆزاناش بکاتە وە،

کە لەلایەن ئیسرائیلییەکان بەناوی شەرمەزارییەکەی لافۆن دەناسرا. هۆکارەکانی سووربوونی ئیسرائیل بۆ چوونی کۆهین بۆ سوریا نەک میسر، ئەوەش بوو کەوا میسرییەکان دەروازەکانیان توندوتۆڵترەو بەرنامەی موخابەراتیان باشترە، بەتایبەتی ئەوانەی لەدەرەوە دەگەنە ناو میسر، ئاشکرایە موخابەراتی میسری لە هەموو موخابەراتەکانی تری وڵاتانی عەرەبی چالاکترو شایستەتربوو، ئەوەو لەورۆژانەو پاش هەرەسی یەکبوونەکە سوریا باشترین پێگەیەبوو بۆ لێدانی میسرییەکان و کەسایەتی جەمال عبدالناسرو سووککرنی کەسایەتی عەرەب، بەوەش ئیسرائیل کاریدەکرد جارێکیتر ئەو دووولاتە هەرگیز لەدوارۆژ بیر لە یەکبوون و هەڤاڵبەندی نەکەنەوە، بۆیەش ئیلی کۆهین، یان کامیل ئەمین سابت بووە ترسناکترین جاسووسی کارکەر بۆ ئیسرائیل.

ئیلی کۆهین کە وبووە ناو جەرگەی شاری دمشق، لە دوای ئەوەی ئەو ماوەیەکی کورت لە دمشق دەمینێتەوە، زوو دەبێتە جێگەی سەرنجی بەشێکی زۆری کۆمەڵگەی سوری. وەک چۆن موخابەراتی ئیسرائیلی دەیویست، ئەو وا هەڵسوکەوتی دەکرد، ئەو بەوەش ناسرا کەوا ئەو ملیۆنێرێکی سورییەو لە تاراوگە ژیاوەو پیاوێکی وڵاتپارێزەو زۆریش رقی لە ئیسرائیلە، بەردەوام داواکارە عەرەب شەڕی ئیسرائیل بکەن، بە هیچ شێوەیەک سەرکردایەتی میسرییان قبوول نییە، کە داخوازە دەسەڵات لەسەر وڵاتانی عەرەبی بچەسپێنێت، ئەوەش خەونی کەسایەتی ئەو بووە. دەزگاکانی موخابەرات تا بەکرێگیراوەکانیان ئاشکرا نەبن، تا پلانەکانیان نەدۆزرێتەوە، داوایان لێدەکرێت رۆژانە زۆر سادەو نۆرمال ژیان بەرێبکەن، کۆشش بکەن کەس گومانیان لێ نەکات، زۆرجار وا روویداوە کەسێکیان بۆ ماوەی 15 ساڵ و 20 ساڵ چاندووە، ئینجا لە رۆژێک و لەکاتێکی گونجاو کاری پێدەکەن، بەڵام لە کێسی ئەو مۆساد بەجۆرێکی تر هەڵسوکەوتی کردووە، چونکە هەستیدەکرد کاتەکان لەبەرژەوەندی ئەواندا نییە، چونکە زۆر دوورنییە پەیوەندی میسرو سوریا بگەڕێتەوە رەوشی ئاسایی جارانیان، ئەگەر دووبارە یەکبوونەکە نوێ ببێتەوەو ئەو دوو وڵاتە یەکبگرنەوە دووبارە جەمال عبدالناسر دەبێتە پاڵەوانی ناوچەکەو بڕیارو پلانەکان هەموو دەگەڕێتەوە بن دەستی ئەو.

****

موخابەراتی ئیسرائیلی هەموو شێوازەکانی خۆشگوزەرانی بۆ ئەو فەراهەمکردبوو، ئەویش وەک ملیونێرێکی سوری دە جولایەوەو پارە یەکی زۆری بۆ چالاکییەکانی حزبی بەعسی دەسەڵاتدار لە سوریا سەرفدەکرد، پارە زۆرەکەش بە بانکێکی ئەمریکی لە دمشق دەگەیشتە دەستی ئەو. پیاوەکە وەک کەسێکی شیاوو بۆ پۆست و شوێنی شیاو کاریدەکرد، بۆیەش هەموو دەروازە باڵاکانی کۆمەڵگەی سوری بۆ ئە و لەسەرپشت بووە، دەفتەری شێکەکانی ئەو پیاوە هەموو کارەکانی ئاساندەکرد، بەدیاری گرانەکانی وەک پاڵتۆو بۆن و دیارییە نازدارەکانی بازارەکانی پاریس توانیبووی ژنی بەرپرسەکانیان باش رازی بکات، هەموولایەک گەیشتبوونە

ئەو قەناعەتەی ئەو پیاوە سورییە کارەکانی لەبەرژەوەندییە باڵاکانی سوریادایە. رۆژێکیان (سالم سیف) بەرێوەبەری ئیستگەی سوری داوایەکی زۆر هاندەرو چاوەروانەکراوی بۆ پێشنیاردەکات، داوادەکات بە رنامەیەکی راستە وخۆ بۆ سورییە کانی ئە مریکای لاتینی بۆ ساز بکات، بە پێێ ئەزموونەکەی خۆی لە ژیانی تاراوگە کارئاسانیەک بکات پە یامێکی کاریگە ر بگە یێنێت ئەو سوریایانەی لە و وڵاتانە دا دە ژین، کە کۆششێک بێت ئینتیمایان بە وڵات ببە ستێتەوە. کامیل یەکسەر بە کامەرانییەوە ئەو هە ڵە دەقۆزێتەوە، پاش ئە وەی ماوە یەک لە بەرنامەکانی لە و ئاراستەوە کاردەکات، بۆی ئاشکرا دە بێت بەرێوەبەری ئیستگەکە سالم سیفیش بۆ بە رژەوەندی مۆساد کارکەربوو. لەسەردانە بەردەوامەکانی ئەو بۆ ئیستگەکە نووسەرو کارمەندەکانی میدیای سوری ناسدە کات، لە بەرئەوەی ئە و لە ناو ئیستگە کەوە بەرنامەکانی پە خشدەکرد، بۆیە ئەو بەئاسانی بە ئامێرە رادیۆییەکانی ئە وانیشەوە شوفرە نهێنیەکانی دە گەیاندە موخابەراتی ئیسرائیلیەوە.! ئەو نامە گەورەکانیشی لەناو گەنجینە هونەرییەکان دەشاردەوەو بە ئەدرێسێکی دیاری ناو پاریس رە وانەی دەرەوەی دەکرد، ئە و وە ک کە سێکی بازرگان و سە رمایەدارێک چالاکی کردووە، بۆیەش بواری بۆ سازدەبوو کۆنتاکت و بۆندی نائاساییش مۆربکات، ئەو بە دوو شێوە نامەکانی دەگەیاند، یەکەمیان لە ماڵە گەورەکەی خۆی ئامیرێکی بێتە ڵی پێشکەوتووی دانابوو، لەبەرئەوەی ماڵەکەی لە شوێنێکی زۆر لاچە پ و نزیک بوو لە دەزگا سەربازییەکان بۆیە گومانی لەسەربوو، لە ئیستگەکەی سورییش بەئاسانی نامە نهێنیەکانی بە شوفرەکانی دەنارد.

****

## رەش و سپی

ئیسرائیل لەکۆنەوە دەراسەتی عەقلیەتی کەسایەتی عەرەبی کردبوو، کەوا ئەوان تەنها رەنگی رەش و سپی د ەبینن، ئەوان هەست بە بوونی رەنگی تری نێوانیان ناکە ن، سورییەکان بەئاسانی بڕوایان بە کەسایەتی ئیلی کۆهین کردبوو، کە وا ئە و دە وڵەمەندێکی سورییە و لە تاراوگە گەڕاوەتەوەو پارە ی زۆرەو زۆریش چاوتێرە و بە ردەوام میوانی زۆرە و زۆریش رقی لە ئیسرائیلەو بە عسییەکی توندڕەوەو دڵسۆزی وڵاتی سوریایە و رقی زۆریشی لە سەرۆک جەمال عبدالناسرە، ئەوان هیچ گومانی پێچە وانەو کەسایەتیەکی تریان لەو پیاوە نەدەکرد. موخابەراتی ئیسرائیلی بۆ گفتوگۆو وە رگرتنی زۆرترین زانیاری کۆهینیان داواکردبوو، ئەویش لە لای برادەرەکانی وتبووی، من لە بەر کاری بیزنیس دە بێ بچمە دەرەوەو چەند رۆژێک لە ئەورووپا دەمینێمەوە، بۆیە لەسەردانەکەی بۆ دە رەوە گەیشتووتەوە ئیسرائیل، لە وێ فە رمان و کاری زۆرتریان بۆ داناوە و پارە ی زۆریشیان بۆ ناردووە ، ئە وانیش هە موو مە بەستەکانیان نە هێشتنی

رێکەوتنی میسری سوری بوو، کە بەوەیان ئەو بتوانێت بچێتە ناو بازنە تەسکەکانی حکومەت و حزبەکەیان.

لەو سەفەرەدا داوایانکردبوو ئەو بچێتە بەرەکانی جۆلان و سەنگەرەکان ببینێت و زانیاریان بۆ بنرێت. پاش گەڕانەوەی وەک جاسووسێک ئەرکی زۆرتربوو، بڕواشی زۆرتر بوو کەوا سالم سیف سەر بە مۆسادە، بۆیەش بەیەکەوە ئاهەنگ و داوەتی گەورەیان بۆ کەسایەتیی دەسەڵاتدارەکان سازدەکرد، لەو دانیشتنانەدا زۆریش باسی بڕیارو بەرنامەی حکومەتیش دەکرا، لەو شەوانەدا زانیاری زۆر ترسناکی دەستدەکەوت، گەورە ئەفسەرە مەستەکان زۆر نهێنییان ئاشکرادەکرد، براژنەکەی سالم سیف سووربوو لەسەرئەوەی کامیل وەک کەسێکی خۆشەویست دەبێ لەو دانیشتنانەدا ئامادەبێت، ئەو ژنە چاوئەفسوناوییە توانی لەیەکێک لە داوەتەکانی ئەفسەرێکی پلەداری سوپا لەوێ داوەت بکات، ژنەکە بەکامیلی وتبوو:

(ئەو ئەفسەرە حەزدەکات تۆ بناسێت، ئەویش کەسێکی زۆر وڵاتپارێزە و دژایەتی ئیسرائیل و میسر دەکات و سوورە لەسەر ئەوەی سوریا شەڕی ئیسرائیل بکات!).

ئەفسەرەکە ناوی (سالم حاطوم)بوو، کە یەکتریان ناسیبوو، کامیل پاش دوورۆژ لە ماڵەکەی خۆی داوەتی کردبوو، ئەفسەرە عەقیدەکە بەشانازییەوە داوەتەکەی قبوول دەکات، لەو داوەتەدا کامیل زانیاری سەربازی زۆر کۆدەکاتەوە، لەوێ ئەفسەرەکە ئاشکرادەکات کەوا دەستە ئەفسەرێک سەرقاڵی کودەتایەکی سەربازیین، بێزارن لەو رەوشەی وڵات و لەو نزیکانەدا کودەتا سەبازییەکە دەکەن.

****

**ئەو دەستی دەگاتە ناو ریزەکانی سوپای سوری**

جاسووسەکە میوانەکەی بە ڕێکردووەو لەماڵەوە چاوەروانی کاتی بێتە لەکەی بوو، لەورۆژەوە ئەو زانیاری سەربازی گرینگی دەگەیاندە ئیسرائیل، پاش دوو رۆژیتر ئەو لە ڤیلاکەی خۆی ئاهە نگێکی گە ورەی سازکردبوو، زۆر کە سی داوە تکردبوو، لە وانە عقید حاطومیش ئامادەببوو، لەبەرئەوەی میوانەکان زۆریان ئەفسەری پلەداری سوپابوون، بۆیە وەزارەتی بەرگری سوری بۆ خزمە تکردنی میوانەکانی کامیل دە ستەیەک کیژۆلەی بۆ بە ردەستی و خزمە تکردن ناردبوو خزمەت ئەو، ئاهەنگەکەشی بەناوی رۆژی لەدایکبوونی خۆی سازکردبوو، لەوێ حاطوم بە کامیلی وتبوو:

(من ئەو شەوەو لەو ئاهەنگەدا هەناسەیەک بۆ پشوودان هەڵدەمژم، من ماندووم، لە سەنگەرەکانی پێشە وەی بە رەکانی سە رسنووری فە لەستینەوە هاتووم، شە وانە لەناو کون و ژێرزەمینەکانی سە رسنوورەکان بە نارەحەتی رۆژانە مان بە ڕێدەکەین، با ئیمشە و بۆ خۆمان بژین.!).

دیارە کامیل بە ئوسلوبی تایبە تی خۆی ئە فسەرەکە رازیدەکات بیباتە سەرسنوورو سەنگەرەکانی کە بەرووی ئیسرائیل لێدراون نیشانی بدات، ئە فسەرەکەش ئامادە یی نیشاندەدات، کەوا کەسێکی وڵاتپارێزی وە ک ئە و بباتە سەنگەرەکان و رە زامەندی سەرکردایەتی بەرەکەش مسۆگەردەکات. کامیل سەردانی سنوورەکەی کردبوو، کە زانیاری بە مۆساد دابوو، کەوا ئەو سەنگەرەکانی دیوە، بەپەلە داوای لێدەکەن، کۆشش بکات جارێکیتریش بچێتەوە ئەو ناوچەیەو زانیاری زۆرترو وردتریان بۆ پەیدا بکات، پێیانوتبوو:

ئێمە زانیاریمان لە سەر کە رتی سێیە می بە رەی سورییە کە کەم و دە گمەنە. بۆیە ئەویش بە ناردن و بە خشینی دیاری گرانبە های زۆر، توانای دۆستایە تی پتە ویش لە گەڵ سەرکردەی کەرتەکەش پەیدابکات، لەهەموو مۆڵەتەکانیدا لە دمشق دیمانەو دانیشتنیان دەبوو، سەردانی زۆریان هە بوو، تا رۆژێکیان لە کاتی ناردنی بروسکە ی تایبە تی بۆ تە لئەبیب لە سەر سەریشی ئامادە دەبێت. پاش ماوەیەک کارکردن لەو بازنەیە کامیل بەپەلە داوادەکرێت بگاتە

ئیسرائیل، لەوێ دەیانەوێ پرسی بوون و پلانی کودە تایەک لە سوریای لێ بکەن، چونکە ئەو پرسیارانە بەبروسکەو بە بێتەڵ نە دەبوون، بۆیە ئەویش دەچێتە ئەرجنتین و لە وێشەوە بەرەو تەلئەبیب دە فرێت، لە وێ پێیدە ڵێن، ئێمە هەستدەکەین، ئە مین حافیزی مولحە قی سە ربازی پێشووی سە فارەتی سوری لە ئەرجنتین، کودەتایەک دەکات و دەبێتە کەسی یەکەمی وڵات و پۆستی سەرۆکایەتی کۆمارو هێزەکانی سوریا وەردەگرێت.

کە کامیل گەڕاوەتەوە لە 8ی مارسی 1963 کودەتایە سەربازییەکە قەوماو سەرۆکی وڵاتەکە کەوتە دەست کۆنە برادەرەکەی ئەرجنتینی، ئەوەی خۆی و ژنەکەی بەدیاری و داوەتی زۆر خەنی و تێرکردبوو. لەبەرئەوەی ئیلی کۆهین کۆنە برادەری سەرۆک بوو، بۆیە ئەویش لە ئاهەنگی وەرگرتنی پۆستی سەرۆکایەتی داوەتدەکرێت، لەوێ ئامادەبووان ئەو وەک دۆستێک و دڵسۆزێکی حکومەت و سە رۆکایەتی دە ناسن، سە رۆک لیوا ئە مین حافیزو ژنە کەی کە ئەو فەروە گرانبەهای لە سەرشان بوو، کە لەکاتی خۆی ئە و پێشکە شی کردبوو، پێشوازی لە میوانەکانیان دە کەن. لەو ئاهە نگەدا کامیل بە لێندەرێکی سوری دە ناسێت کە پرۆژەیەکی گەورەی لەبندەست بوو، بۆ گۆڕینی ڕێڕە وەی ئاوی رووباری بانیاس بۆ سوریا، دیارە کەوا ئەو پرۆژەیە بۆ سوریاو جیهانی عە رەبی بایەخی زۆری هە بوو. حکومەتی سوری داوای لە کامیل کردبوو، کار بۆ ئە وە بکات سە رمایەدارە سوورییەکانی تاراوگە پارەکانیان بهێنە وە ناو سوریاو سەرمایەگوزاری تێدا بکە ن، داواشی کردبوو ئە گەر لە و پلان و پرۆژانە ش کە دەتانەوێ سەربازی و بە رگریش بێت، ئە وا لە پاراستنی نهێنیە کانی دڵنیابن. لەوماوەیە کامیل زانیاری سەربازی زۆری دەدایە ئیسرائیل، نەخشە تۆبۆگرافییەکانی دەگەیاند، رادیۆی سوریاشی بۆ ئە و مەبەستە بەکاردەهێنا، لە ئاهەنگ و داوەتەکانی ماڵەکەی خۆشیدا وێنە ی زۆری میوانە کانی لە ڕەوشی ناشایستە ش دە گرت، پاشان وێنە کانی وە ک هە ڕەشەش بە کاردەهێناو زانیاری ترسناکیشی بەو شێوەیە دەستدەکەوت.

*****

## وەزیرە جاسووسەکە

لەبەرئەوەی کامیل لە سەرۆک زۆر نزیک بوو، بۆیە زۆر ناوی دە هات بکرێتە وەزیرێکی دەسەڵاتداریش، واتە وەزارەتێکی کاریگەریش وەرگرێت، فریق (علي عامر) سەرۆکی دەستەی ئە رکانی شە ری سوپای میسری بۆ بە سەرکردنەوەی سەنگەرەکانی سوریاو وە ستان لەسەر کەموکوڕییەکانی ئەو سوپایەو باسکردنی لە ئەگەری شەڕێک بەرووی ئیسرائیلی دوژمن، بریاربوو سە ردانی سوریا بکات، ئە و وە ک نوێنەرە ی سە رکردایەتی یە کگرتووی عە رەبەکان دەهات، کە تازە ئەو نوێنەرایەتیە لەلایەن کۆمکاری عەرەبی و لەبەر ڕێنماییەکانی سەرۆکەکەی (عبدالخالق حسونة) دانرابوو، کە فریق عامر گەیشتبووە بەرەکەو لە سەردانەکانیدا بەردەوام بوو،

ئەفسەرە هاوڕێیەکانی کامیل حەزیان کردبوو، ئەویش لەو مەراسیمەدا جێگای دیاربێت، بۆیە سووربوون لەسەرئەوەی ئەویش لە پێشوازییەکان و بەرنامەکان ئاگاداربێت، بەڵام ئەو زۆر حەزی نەکردبوو، بەڵام لەبەرئەوەی دەنگۆی ئەوە هەبوو ئەو دەبێتە وەزیرو پۆستێکی باڵا وەردەگرێت، ئەویش وەک کەسایەتیەکی ناوداریش ناکرێ خۆی لەو میوانداریە دوور راگرێت. لەودەمانە ئەمین حافیز بەنهێنی بۆ چارەسەری لە دەرەوەبوو، کە لە سەردانەکەی گەڕاوەتەوە وڵات لەگەڵ ئەندامانی باڵای حکومەت و حزب کۆبوونەوەی کردبوو، پاش چەند سەعاتێک چەند بەشی بەرنامەو کارنامەی دیمانەکەی لە رادیۆی ئیسرائیل دەقاودەق دەبیستێتەوە، ئەوەیان سەرۆکی زۆر نیگەران و تەنگاوکردبوو. بۆیە زۆر بیری لەوە کردیتەوە، دەبێ کێ بێت ئەو قسانە بباتە دەرەوە، ئەو کارنامەیە چۆن وا زوو و بە دروستی دەگاتە ئیسرائیل، دیارە یەکێکی زۆر نزیک لە خۆمانە، یەکێک لە ئەندامانی سەرکردایەتی و کەسێک پەیوەندی هەیە، بەڵام ئەو گومانی لە کەسایەتی کامیل سابت نەبوو، لە مێژە ئەو ناسدەکات و وەک کەسایەتیەکی سوری و وڵاتپارێزێک ناسراوە بۆیە پەنجەی گومان ئاراستەی ئەو نەدەکرا.

لە کۆبوونەوەی داهاتووش هەمان سیناریۆ دووبار دەبێتەوە، کۆبوونەوەکە لەناو بازنەیەکی سەرۆکایەتی داخراویش گیرابوو، ئینجا لە رادیۆی ئیسرائیل باسکرا کە وا سوریا بەنیازە ئاراستەو رێڕەوی ئاوی رووباری بانیاس بگۆڕێت، پلانە سەربازییەکانی بەرەکانیان ئاشکرا دەکرد، بڕیارەکانیان دەزانن، هەموولایەک کاریان بۆ ئەوە دەکرد کە سەگومانلێکراوەکە بدۆزنەوە، بەڵام هیچیان دەستنەکەوت، چونکە سەرۆک و سەرکردایەتی تەنها لە کامیل گومانیان نەبوو، لەولاشەوە موخابەراتی میسری کاری لەسەر ئەو وێنانە کردبوو کە لە سەردانەکەی رفیق علي عامر بۆ سوریا گیرابوون، گومانیان لەسەر کەسایەتی کامیل کردبوو، یەکێک لە ئەفسەرە میسرییەکان یەکسەر ئیلی کۆهینی ناسیەوەتەوە، وتبووی، ئەو پیاوە بەسمێلە دەناسمەوە، ئەو پیاوەی لە وێنەکان بەجلی سەربازی لەپشت فریق عامر وەستاوە، ئەو پیاوە جوولەکەیە کە لەئەنجامی سەرنەکەوتنی لە چالاکییەکەی سۆزانا لە میسر رایکردو دوورکەوتەوە، بەڵام لەبەر ئاڵۆزی پەیوەندەییەکانی ئەو دوو وڵاتە نەدەکرا سەرکردایەتی سوری بەوە رازی بکەن، کە وا کامیل سابت، پیاوێکی جوولەکەیەو ناوی ئیلی کۆهینەوە لە میسر رایکردووە.

****

کە سەرۆک جەمال عبدالناسر دۆسیەی تەواوی ئیلی کۆهینی جاسووسی دیبوو، کە بەناوی کامیل سابت لە دمشق ژیان بەسەردەبات دڵنیادەبێت ئەوە ئەو کەسەیە کە لەرابردوو لە میسربووەو پیاوێکی جاسووسە . ئەودەمانەش پەیوەندییەکانی حکومەتی میسری بە حزبی بەعس لە سوریا ئاڵۆزو شپرزەبوو، نەیارەکانی یەکبوونەکە پاش هەڵوەشانەوەی پرۆژەکە، کەوتنە قسە هەڵبەستن و دارشتنی پلان بۆ زۆرتر دروستکردنی ناکۆکی لە نێوان ئەو دوو وڵاتە ،

دەیانووت، عبدالناسر زۆرتر مەبەستی ئەوەبووە کەوا وڵاتی سوریا کۆنترۆڵ بکات، ئەو دروشمی نەتەوەیی عە رەبی بە فێڵ بە رزکردیتەوە، ئە و چاوی لە دەسەڵاتی تە واوی ناوچە کەیە، ئە و ماوەیەش کە بەیەکەوە یەکێتیەکەیان کردبوو ساڵانی زوڵم و داپڵۆسین و ئە شکەنجەبووە، دەزگای موخابەراتی میسری لەسەر هەموو بوارەکانی کارکردن باڵادەست بووە، بۆیە زۆر نهێنی ترسناکیان ئاشکراکردووە.

یەکێک لەوانە توقیعی لەسەر بەیانی هەڵوەشانەوەی یەکێتیەکە کردبوو (صلاح الدين البيطار)بوو، ئە گەرچی تا ئە ودەمانەش جە مال عبدالناسر ئە وەی بە کەسێکی دڵسۆزو کارای هزری یە کبوونی عە رەبی دە زانی، بۆیە بڕواکردن بە یەکتری نە بوو، رە وشەکەی ناوچە کەو سوریان بە رگەی ئە وەی نە دەکرد دۆسیە یەکی وا نیشانبدرێت، بە ڵام عبدالناسر بڕیاریدا دوو دانە لەو دۆسیە رەوانەی سوریا بکات، یە کێکیان بگاتە دەست سە رۆک ئەمین حافیز، دانە ی دووەمیش بگاتە دەست عقید (ئەحمەد ئە لسویدانی) سەرۆکی یە کەی قە ڵاچۆکردنی جاسووسیەت لە موخابەراتی سوری . دۆسیەکە چەندین بە ڵگەی روونی تێدابوو، مە بەستی میسرییەکان ئەوەبوو ئەوان باش لەو مەسەلە تێبگەن و چارەسەری بکەن، بەڵام سەرۆک حافیز چۆن بڕوادە کات برادە رێکی سە ردەمی رۆژانەی ئە و لە سەفارەتی ئە رجنتین ئەو جۆرە کارانە بکات.! ئەو کارە لەو کۆنە برادەرەی ئەو ناوەشێتەوە، ئەو لە و رۆژانە هەستیکردووە، ئەو پیاوە بازرگانە دەوڵەمەندە، ئە و کە سەی هاوکاری زۆری حزبە کەیان بووە ، ئە وەی زۆر بە ئاشکرا دژایەتی ئیسرائیلی پێوە دیاربوو، بۆیە ئەوەی لێکدابۆوە کەوا میسرییەکان نیازیانە حزبی بەعس بروخێنن، بۆیەش دەیانەوێ ناوو دۆسیەی بەگومانی بۆ بدۆزنەوە. بەو جۆرە کامیل بێ گومان و دوور لە چاوی چاودێری لە دمشق مایەوە، بەڵام حافیز دە یزانی کەسێکی نزیک لە خۆی بۆ بەرژەوەندی ئیسرائیل جاسووسی لە سەردەکات، گومان لە و هە موو کە سە نزیکەکانی خۆی هەبوو تەنها کامیل سابت نە بێت، نەیدەزانی جاسووسەکە ئەوەو لە ژووری نووستنەکەی خۆیدا بێتەڵی داناوە و بە شوفرە نامە ئاراستەی مۆساددە کات، لە ولاشەوە کامیل دڵنیابوو دە زگا موخابەراتەکانی سوریا سستن، بۆیە بێ گۆڕان و جوولەکردن بە ئامێرو شوفرەکانی کاریکردووە، چونکە ئەودەمانە هەموو سورياییە کان ئە وەندەی سە رقاڵی جە مال عبدالناسربوون، ئە وەندە بیریان لە ئیسرائیل نەدەکردەوە.

****

کلمیل سابت لە ئوکتۆبەری ساڵی 1964 نامەیەکی شفرەداری دەگاتە دەست تێدا داوادەکەن، بەزووترین کات بگاتە تەلئەبیب، ئەویش پلیتی فڕۆکەی زیورخ لە سویسرا دەبڕێت و لەوێشەوە بۆ ئەرجنتین، لەوێشەوە دەگەڕێتەوە ئەوروپاو سواردەبێت بەرەو ئیسرائیل دەفڕێت، بەو شێوەیە مۆساد چاک سە ر لە چاودێرکردنی ئەو دەشێوێنێت. لە 13ی نۆڤمبەری ساڵی 1964هێزەکانی ئیسرائیل سنووره کانی سوریا دە برن و رێڕە وی ئاوە کەی ئوردن دە شکێنن و

هەموو کەرەستەی پرۆژەکەش خاپووردەکەن، بەو هێرشە لەناکاوە بەرنامەو نەخشە دزینی ئاوی رووباری ئوردن لە لایەن سوریا هە ڵدەوەشێتەوە. لەو رۆژە سورییەکان بە و هێرشە زۆر وردو پێکانە زۆر وریایانە ی ئیسرائیلییە کان شۆک دە بن، دە رکەوت هە موو بە رەکەو سە نگەرەکان بەرووی ئیسرائیل رووت بووە ، دیارە هەموو خاڵە کان باش و ورد دە راسەتکراون، بۆیە هەموولایەک گومانیان لە چاوو گوێیەکی زۆر ئاگادار هەبوو، پرسیاردەکرا دەبێ ئەو بەکرێگیراوە کێ بێت ...!؟ کامیل پاش ئە و زە برە کوشندەیەی ئیسرائیل کە لە سوریای وە شاندی، ئە و گەڕاوەتەوە سوریاو بە حەماسەوە وتوویەتی:

ناکرێ ئێمە لەو هێرشە ی ئیسرائیل بێدە نگ بین، کاتی ئە وە هاتووە سنوورێک بۆ دەستدرێژییەکانی دابنێین، چونکە ئەوانە دوژمنی سە رسەخت و پیسی نە تەوەی عە رەبیمانە، جەمال عبدالناسریش لە قاهیرە وەک کە سێکی ترسنۆک و بێدە سەڵات سە یری ئە و دوژمنە دەکات، دە بێ ئێمە لەو هێرشە دەستپێشخەربین، هە موو وڵاتانی عە رەبی بۆ ئە و شە رە پیرۆزە راکێشین.

ئەگەرچی ئە و بە و شێوە و بە و زمانە ش قسە ی دە کرد، بە ڵام هە ستی دە کرد، وە ک جاران پێشوازی ناکرێت، دە رگای ماڵی بە رپرسەکانی بە روودا ناکرێتە وە، بە ڵام ئە و گومانی نەبوو، ئە وان درکیان بە هیچ نە کردووە، وایدە زانی ئە وەشیان تە نها پارێزێکە ئاسایشی سوری رەچاوی دە کات و بە س ئە گینا هیچی تر لە ئارادا نییە. رۆژێکیان سالم سیفی بە رێوەبەرەکەی ئێستگەی دمشق دڵسۆزانە ئامۆژگاری هاوڕێیە کەی کردبوو، پێیوتبوو، من هە ستدەکەم لە ناو سەرکردایەتی گومانێک و هوشیارییە ک هەیە، جوولەیە کی نائاسایی هە یە، بۆیە حەزدەکەم زۆر وریابە، ئاگاداری خۆت بە . دیارە موخابەراتی ئیسرائیلی ئیلی کۆهینی لە سالم سیف دڵنیاکردبۆوە، ئە وەی جاسووسێکی خۆمانە و ترست لە و نە بێت. بەڵام ئە و بە سادەیی وە ڵامی سیفی داوە تەوە، کە وا تر سی ناوێ، ئە و نیگە رانییەی سە رکردایەتی سوریی کاتییە و دە ڕوات، چونکە ئەوان زۆرتر بیریان لە لای جە مال عبدالناسرە، نە ک ئیسرائیل، لە بەر دژایە تی ئە وو میسر ئاگایان لە دوژمنە سەرەکییەکەی خۆیان نە ماوە. سەرکردایەتی مۆساد هە ستی بە مەترسی لە ژیان و مانە وەی ئیلی کۆهین کردبوو، بە ڵام چاویان لە زۆرترین زانیاری بوو، دەیانویست زۆرتر سەنگەرەکانی (جۆلان)یان بۆ بدۆزێتەوەو نەخشەی زۆرتریان دەویست، مائیر ئامیتی سە رۆکی مۆساد دە یزانی کۆهین زۆرتری پێدە کرێت، بۆیە نەدەکرا دە ستبەرداری بن، دەیویست زۆرتر زانیاری لە سەر دامەزراوە ئابووریی و سە ربازییەکانی وڵاتانی عەرەبی تریشیان دەسکەوێت، مۆساد پارەیەکی زۆریان لەو جاسووسە سەرفکردبوو، بۆیە نەدەکرا، وا بەئاسانی ئەو لەو گۆڕەپانەکە بکێشێتەوە، بۆ گە ڕانەوەو دەربازبوونیشی لە سوریاو گە یشتنەوەی بە ئەرجنتین بەرنامەیەکی وریای دەویست.

****

## تەڵەکەو گیرانەکە

---

شەوێکی درەنگ لە گەڵ لێدانی دە رگای ڤیلاکە ی بە ئاگاهاتبوو، کە دەرگا دە کاتەوە عقید سالم حاطومی هاوڕێی دەبینی، لە بەرەکانی پێشەوەی جۆلانەوە هاتبوو، بەو شەوە درەنگەو بەو ڕێگا دوورە تەنها بۆ رابوردن و شە وچەرەیەک نە هاتبوو، هاتبوو چە ند زانیاری ترسناک بگەیێنێت، هاتبوو بڵێت، لەسەرانسەری بەرەکەمان ئەفسەرەکانمان هەست بە هەڵچوون دەکەن، هەموو دەنگیان هەڵبڕیوەو دەیانەوێ چەند دەستە کەماندۆیەک رەوانەی ناو ئیسرائیل بکە ن، ئەفسەرەکە لەبەرخۆییەوە وتبووی:

(ئەو ئەفسەرانە راناوەستن رەوشەکە ترسناکە).

بەیانی زوو حاطوم لە ماڵەکەی کامیل دە ڕوات و ئە ویش ئامێرە بێتەڵەکەی لە بن سیسەمەکە دەردەهێنێت و زوو ئە و زانیارییە نوێیە دەکاتە بروسکەیەک بۆ ئیسرائیل . لەو بەیانیەدا هەموو دمشقییەکان لە شیرینە خەودا بوون، بەڵام کامیل خە ریکی ناردنی بروسکەو زانیاری بوو، لەودەمانە ئەو کە سەربەرزدەکاتەوە، دەبینی پیاوێک لەسەر سەری وەستاوە، بەڵام کە باش لە چواردەورەکەی دە ڕوانی دە بینی دە ستەیەک ئە فسەری موخابە راتی سوری بە سەرۆکایەتی عقید ئەحمەد ئەلسویدانی ژوورەکەیان گەمارۆداوە. سەرۆکی موخابەراتەکە دەستی لەسەر شان دادەنێت و دەڵێت:

(مەترسە نامەکە تەواو کە، ئەگەر زانیاری زۆرتریشت دەوێت بۆت تەواو دەکەین.!).

سێ رۆژ کامیل سابت لە رۆژەکەی دەمینێتەوەو لەوێش ناوەکەی دەگۆڕن و بە ناوە کۆنەکەی بانگی دە کەن، ئە ویش بە چاودێری موخابە راتی سوری نامە رەوانەی ئیسرائیل دەکات، بە ڵام ئە مجارە نامەی درۆو ساختە ی پێدە نووسن و بروسکە کانی پێ رە وان دە کەن. بەڵام ئە و بە ناردنی لەسەرخۆی نامە کان بەرپرسەکانی خۆی تێدە گەیێنت کە وا ئە و گیراوە و تۆڕەکەی دۆزراوە تەوە، چونکە زووتر ئە و شوفرە یان لە نێواندا هە بووە، ئە گەر بروسکە ی لەسەرخۆی بۆ ناردن واتە ئەو گیراوەو ئاگاداری خۆتان بن.

موخابەراتی سوری ئیلی کۆهین ناچاردە کات ئە و بروسکە ی خوارە وە بگەیێنێتە ئیسرائیل:

(بۆ سەرۆک وەزیران لیفی ئاشکۆل و سەرۆکی مۆساد لە تەلئەبیب، لەو رۆژەوە ئیلی کۆهین و هاورێیەکانی لە دمشق میوانن، ئێمە هەستدەکەین هەموو هاورێیەکانی دەگەنە لامان، لە دوارۆژیش ئێوە چارەنووسی ئەو کەسە دەبیستن).

سەرۆکایەتی سوری هەواڵی گرتنی کۆهینیان بڵاونە کردەوە، ئەو هەواڵە بۆ سەرۆک ئەمین حافیزو ژنەکەی و هەندێ لە برادەرەکانی زۆر کوشندەبوو، لە رووی بەڵگەکانیش هیچیان لەدەست نە دەهات. لەودەمانە ئەلسویدانی بە سەرۆک دە ڵێت، گە ورەم ئە گەر زوو بە راپۆرتەکەی سەرۆکی میسری جەمال عبدالناسر بڕوامان کردبووایە، ئەو زیانە ئەستوورەشمان پێنەدەکەوت، سەرۆک قسەکانی سەرۆکی موخابەراتی بە هەند وەرگرتبوو، بەڵام بۆ زۆرتر دڵنیابوو، خۆی لە زیندانا قسەی لەگەڵ هاورێیە جاسووسەکەی کردبوو!

بۆیەش پاش سەردانەکەی لە ژوورەکەی خۆیدا هاواری کردبوو و وتبووی:

(ئەی خودای مەزن ئەوە چی روو دە دا، چی دەرچوو، ئەوە پیاوە موسلمانیش نەبوو، من بە چەند وشەو رستەی ئیسلامەتی ئیقناع بووم).

سەرۆکی موخابەراتیش بە سەرۆک دەڵێت:

(گەورەم ئەوە چاک دەزانی ئەو بۆ پۆستێکی باڵای وەزارییش کاندیدکرابوو).

لەپاش لێکۆڵینەوەی ورد دەرچوو 60 گەورە ئەفسەرانی سوری دەستیان لەگەڵ کامیل سابت هەبووە، هەموویان زانیاری زۆر ترسناکیان گە یاندبوو، لەوانە 17 کەسیان بە تاوانی ئاشکراکردنی نهێنییەکانی دەوڵەت و زیان گە یاندن بە پاراستنی نە تەوەیی لە سێدارەدران. سەرۆکایەتی سیاسی سوری دادگاکە ی کۆهینی لە پرۆسەیەکی زۆر نهێنی جێبە جێکرد، بەڵام هەموو دانیشتنەکانیان بە کامیرا تۆمارکردبوو، سەرۆک حافیز ئەوەی کردبوو تا سەرۆکی میسری هەموو شتەکان نەزانێت و میللەتی سوری رق و تووڕەییان لە رووی ئەودا دەرنەبڕن. حکومەتی ئیسرائیلیش بۆ ئازادکردنی ئیلی کۆهین لەسەرئاستی نهینی و بە ئاشکراش چەندین هەنگاوی نابوو، یەکێک لە پێناوەکانی ئازادکردنی جاسووسەکە وتبووی:

(ئیسرائیل ئامادەیە ژمارەیەکی زۆری شۆفل و لۆری و کەرەستەی تەندروستی بداتە سوریا، ئامادەیە لەبەرامبەر ئەو پیاوە دە جاسووسی سوری رزگاربکات، ئامادەیە یەک ملیۆن دۆلاریش بدات).

بەڵام سوریا ئامادەنەبوو بەهیچ شێوەیەک سازش لەسەر سێدارەدانی ئەو بکات، بۆیە ئیسرائیل بەچەندین شێوە ویستبووی رای گشتی وا حاڵی بکات کەوا ئەو پیاوە لە دوورو نزیک

**پەیوەندی بە مۆساد نەبوو، حکومەتی سوری لەبەرنامەی بەردەوامی خۆی بۆ دژایەتی سامییەت پیاوێکی بێتاوانی جوولە کە بە ناوی جاسووسیە ت دە کوژێت. ئیسرائیل بە چەندین شێوەو لەرێگای رێکخراوە کانی مافی مرۆڤ و شاژن ئیلیزابێتی دووە م و فاتیکان و 22 ئەندامی ئەنجومەنی عمومی بریتانی و سە رۆک وە زیرانی پێشووی کە نداو دوو سە رۆکی پێشووی فەرەنسی و سەرۆکی لێبووردنی گشتی و وەزیری دەرەوەی ئەرجنتینیان راسپاردبوو کەوا کۆهین ئازادبکەن و حکومە تی سوری بە هەر چ شێوە یەک بێت ئە و رادە ستی حکومەتی ئیسرائیلی بکاتەوە، بێجگە لەوانە ئیسرائیل دوو پارێزی فە رەنسیشی بە ناوی ژن و منالّە کانی بۆ گرتبوو، بەلاّم حکومە تی سوری بۆ ئە و دوو پارێزە هیچ ئاسانکارییە کی نە کردبوو، رۆژانە و رێورە سمی دادگاییە کەش لە دمشق بە ئاسایی بە رێوەچوو، ئە و لە ینایری سالّی 1965 گیراو لە 19ی مارسدا دادگاییە کەی کۆتایی پێهێنابوو و سەرۆکی سوریش ئیمزای لەسێدارەدانەکەی کردبوو و لە 18ی مایوی هەمان سالّ بڕیارەکە جێبەجێکرا.**

---

**لە رۆژنامەی (الجریدة)ی کویتی لەرۆژانی 9و10و11ی سپتەمبەری سالّی 2008 بلاّوکراوەتەوە.**

# رآفت الهجان ... ئەوەی ئیسرائیلی هەڵخەڵەتاند.!

له ژمارەی 3195 ی گۆڤاری (المصور)ی میسری رۆژی 3ی ینایری ساڵی 1986 ئەلقەی یه کەمی رۆمانی (رآفت الهجان )ی رۆماننووسی میسری کۆچکردوو (صالح مرسي ) بڵاوکردەوە، رووداوی رۆمانه کە سەرنجی هەموولایەکی راکێشا، بەردەوامیش چاوەروانی ژمارەو ئەلقەی نوێی رۆمانە کەیان دە کرد، کە سایەتی رووداوە کەش کە لەچیرۆکی راستە قینەی دۆسیەکانی موخابەرات وەرگیرابوو. چیرۆکەکە لەساڵی 1987 کرا بەزنجیرەیەکی تەلەڤزیۆنی کە تێدا ئەکتەری نادوار (محمود عبدالعزیز) پاڵەوانیەتیەکەی دەبینی. رووداوەکانی له هەموو وڵاتانی عەرەبی بەتایبەتی له ئیسرائیلیش ببووە جێگەی هەواڵ و مەبەست و سەدان رۆژنامە زانیاری تازەیان له سەر جاسووسەکە بڵاودەکردەوە. کە ئەو جاسووسە زانیاری زۆری بە میسرو وڵاتانی عەرەبی گەیاندبوو، کەوا توانیبووی بگاتە زۆربەی گۆشەکانی کۆمەڵگای ئیسرائیلی و دەزگاکانی ئەو وڵاتە ، کە لەو کارەدا 18 ساڵی تەواوی خایاندبوو، بێ ئەوەی تۆڕەکەی ئاشکرابێت. بۆیە ئیسرائیلییەکان وتبوویان، ئەوەی له رۆمانەکەو تەمسیلەکان بڵاوکراوەتەوە تەنها خەیاڵی هەڵبەستراون، دیارە کەوا موخابەراتی میسری زیرەکەو دەکارێت ئەو جۆرە چیرۆکانە دروست بکات، بەڵام میدیای ئازادی ئیسرائیلی سەرۆکی مۆسادی پێشووتر (عیزرا هارئیل)ی ناچارکرد دان بەوەدا بنێت، کەوا ئەوان هەستیان کردووە موخابەرات گەیشتوونەتە ناو دەزگاکانیان و لەناو ئاسایشی ئەواندا دەستیان هەبووە، بۆیە ئەو وتبووی:

(ئێمە گومانمان لەوەدا نییە کەوا (جاک بیتون) کە ناوی ئیسرائیلی الهجان بوو).

له ساڵی 1988ەوە موخابەراتی ئیسرائیل پەرۆشی هەواڵ و زانیاری بوو له سەر ئەو کەسە، رۆژنامەی (جیروزلیم پۆست) راستی بوونی کە سێک بەناوی جاک بیتون یان رآفت الهجانی راگەیاندبوو، کەوا ئەو کەسە بوونی هەبووەو ئەو لەساڵی 1919 له شاری (المنصورة)ی میسری لەدایکبووەو لەساڵی 1955 گەیشتووتە ئیسرائیل، دووبارە لەساڵی 1973 گەڕاوەتەوە، کە توانیبووی بگاتە دەسەڵاتدارەکان و لەوانە (گۆلدا مائیر)و (مۆشی دایان)ی وەزیری بەرگری ئیسرائیل. لەمانگی فبرایری ساڵی 1987 نووسەری کۆچکردوو صالح مرسي سە ربردەی

دۆزینەوەی ئە و رووداوە ی ئاشکردووە ، کە چۆن چالاکی رآفت الهجانی دۆزیوە تەوە، چۆن بەرێکەوت لە دانیشتنێکی تایبە تی لە گەڵ دە ستەیەک لە ئەفسەرانی موخابە راتی میسری دیداری دەبێت، ئەوان بەکورتی رووداوەکەی (الهجان)یان بۆ گێڕاوەتەوە.

ئەفسەرەکان نووسە رەکە هاندەدەن دووبارە ئەو رووداوانە بنووسێتەوەو خوێنە رانی خۆی دووبارە بەو شێوەیە ئەدەبیە سەرسام و پە رۆش بکاتەوە، بۆیە بڕیاردەدات دۆسیەکەی الهجان لە موخابەراتەوە لەبن هە نگڵی بنێت و بیباتە وە ماڵەوەو شەوەکەی کە دەیخوێنێتەوە، لەویێ بە کەسایەتی ئەو جاسووسە میسرییە سەرسام دەبێت و بڕیاردەدات کاری نووسینەوەی لەسەربکات، بۆ زۆرتر دە وڵەمەندکردنی بابەتەکەو نووسینەکەی دیمانەی لەگەڵ ئەو ئەفسەرە سازدەکات، کە لەسەرەتاوە چۆن الهجان مەشقدراوەو گەیاندوویەتی ئەو ئاستە، لەو دیمانەیەدا (محسن ممتاز) وردەکاری زۆرتری لەسەر کەسەکەو چالاکییەکانی دەداتێ، ئەوەش زۆرتر ئەو هاندەدات لەسەر نووسینەوەکە گەرمتربێت. پاش نووسینەوەکە ئەو بەسەرهاتی وردی 18 ساڵەی چالاکییەکان بۆ ئە و هونەرمەندە دەگێڕێتەوە کە پاشان رۆڵی سە رەکی لە زەنجیرەکە دیبوو.

***

### کورتەیەک لە ژیانی الهجان

رفعت علي سليمان الهجان لەشاری (دمياط)ی میسری لە 15 یولیۆی ساڵی 1927 لەدایکبووە، باوکی بازرگا نی بە خەڵووزکردووە، دایکی لە بنەماڵەیەکی ناوداری ناوچە کەبووە، هەردوو زمانی ئینگلیزی و فە رەنسی باش زانیووە ، دوو خوشک و برای بە ناوی (لبيب)و (نزيهة)و زڕبرایە کیشی بەناوی (سامي) هەبووە، لەساڵی 1936 باوکی کۆچی دواییکردووە ، لەبەرئەوەی سرامي مامۆستای زمانی ئینگلیزی شاژن (فريدة)بووە. ئەو پێگە دیارەش وایکردووە ئەو برایان ببێتە پیاوی ماڵەکەیان و چاودێری خوشک و براکانی بکات، پاشان لە و شارە دەگوازنەوە قاهیرە.

رفعت منالێکی لاساربووە. بە هیچ شێوەیەک حەزی لە خوێندن و مە کتەب نەبووە، هەرچەند براکەکەی کۆشش دەکات کوڕەکە ئارەزووی ناکەوێتە سەر خوێندن، رەوشتی ئارام و رێگای راست ناگرێتەبەر، سەرەتا دەردەکەوێت ئەو حەزی زۆری لە گەمەو شانۆو سینەمابووە، ئەو توانیویەتی بەهرەکەی خۆی بەرووی هونەرمەندی گەورە (بشارة واكيم) دەربخات و لەگەڵ ئەودا رۆڵی سێ فیلم ببینێت. براکانی داوای لێدەکەن بچێتە بەر خوێندنی بازرگانی، بەڵام خۆی

ئارەزووی ئەو جۆرە خوێندنەی نەبووە، بەڵام ئەو توانی زمانی ئینگلیزی بەزاراوەی بریتانی باش فێرببێت و هاوشانی ئەو زمانە زمانی فرنیسیش بەزاراوەی پاریسیش چاک فێردەبێت. لە ساڵی 1943 (نزیهة)ی خوشکی شوو بە کوڕێکی ئەفسەری پلە یەک دە کات، دایکیشی ماڵە کەی دەگوازێتەوە شاری (دکرنس)ی نزیک المنصورة، لەوێ سامی برای کیژی محرم فهیمی نە قیبی پارێزەران لەقاهیرە دەهێنێت، بۆیە رفعت بەناچاری لەگەڵ لبیبی برای دە ژیت کە ژمێریاربووە لە بانکی بارکلیز، هە ردووکیان بە یەکەوە لەو شوقە یە دەژین کە سامی برای لە مەیدانی (الظوغلي) بۆی گرتبوون، رفعت لەساڵی 1945 لەگەڵ بشارة واکیمی ئەکتەر یەکتری دەناسن، لەیەکێک لە فیلمەکان رۆلێکی گچکە و کورتی دە داتێ، بەوەش ئەو سەراپای ژیانی دە گۆڕێت، ئەگەرچی رۆلە کەی لە فیلمەکە زۆرکورت بوو، بە لام ئە و بە و کارو دە رکەوتنە زۆر دلی خۆشدەبێت، بۆیە هاوڕێیەکانی بە چاوێکی گە ورەو ئە کتەرێکی گە ورە ناوی دە بەن، زۆریش بەرێزەوە قسەی لە گەڵدا دەکەن، بۆیە ش ئە و زۆرتر بڕوای بە خۆی پە یدادەکات، لە خوێندنەکەی بە ردەوام دە بێت، لە ودەمانە کیژێکی سە ماکەر دە ناسێت و لە بیرەوەرییەکانیدا دەڵێت:

(من سە ماکەرێکی سە رشێتی هە رزەکارم بە ناوی (کیتی) ناسی، کە پاشان دەستی لەگەڵ تۆڕێکی جاسووسی تێکەڵکردووە لە میسر رایکردو ناوی نەما).

رفعت لە گەڵ سە ماکەرەکە دەژیت و لە شوقەکەی ئە ویش دە مینێتەوە، بۆیە لبیبی برای زۆر لێی تووڕەدەبێت، بۆ دوورکەوتنەوە لە کێشەکانی لەگەڵ ماڵەوەیان واز لەو سەماکەرە دەهێنێت و لە کاری سینەماش دووردەکەوێتەوەو لە کۆمپانیایەکی پترۆڵی بێگانە لەسەرکەناری دەریای سوور کاردەکات، لەبەرئەوەی هەردوو زمانی فەرەنسی و ئینگلیزی باش زانیووە بۆیە لە کارەکەی زۆر سە رکەوتوودەبێت، لە بەرئەوەی شوێنی کارە کەی دووسە د کیلۆمە تر لە قاهیرە دووربوو، بۆیە ئارەزووی کارکردنی نامینێت و ئە گەرچی کۆمپانیاکە ئەو دە گوازێتەوە ناو قاهیرەش بەڵام ئەو واز لەو کارە دەهێنێت.

رفعت لە گەڵ سە رمایەدارێکی ئەسکندریە کارێک دەدۆزێتەوەو لەوێ دەژیت و بۆ یەکەمجار هە ست بە ئارامی ژیان دە کات و ئیسراحە ت دە کات، لە رۆژانی کارە کردنیدا هەستدەکات کابرای خاوەنکار، لەبەرئەوەی منالی نە بوو، بۆیە بە چاوی کوڕی خۆی تە ماشای ئەو دە کات، بۆیە ئە ویش لەسەر ئە و کارە دەگیرسێتەوەو کاردە کات و گەشە دەکات و بەبەختیاری ژن دە هێنێت. ئەو بۆ کارە کانی کۆمپانیاکە یان دە چێتە قاهیرە لەوێ بە رێوەبەرە ناپەسندەکە بە تاوانی دزی و ساختە رفعت تاوانباردەکات، بەڵام خاوەن کارە ئەسکەندرانییەکە چاک دەزانێت رفعت کاری وا ناکات و ئە و ناشایستەیە لەو ناوەشێتەوە، بەڵام ناچاردەبێت لە کارەکەی دەریدەکات، بەڵام یارمەتی دەدات وەک ژمێریارێک دامەزرێت لەسەر پاپۆڕی باری

(حورس)، بۆیە رفعت بۆ یەکەمجار لەساڵی 1946 دەریا دەبڕێت و چەندین وڵات و بەنداوی ئەوروپی دەکات، هەر لە ناپۆلییەوە تا مارسیلیاو برشلۆنە و تەنجەو لە کۆتاییدا لە بەنداوی لیڤرپۆلی ئینگلیزی دەمینێتەوە، کە بڕیاربوو بە پاپۆڕەکە بچێتە شاری بۆمبای هیندستان.

****

## ژیانێکی ئاڵۆز

لەئەنجامی کارەکەی لە بەنداوی لیڤرپۆل رفعت شەیدای جوانی (جودی موریس) دەبێت و لەبەر رۆشنایی چاوانی ئەو، کۆنە دۆستە سەماکەرەکەی بەبیردێتەوە، کیژەکە فێری دەکات لەکاتی دەرچوون و بەرێکردنی پاپۆڕەکە بڵێت ژانە سگمەو هەستەکەم ریخۆلە کوێرەم دەتەقێت، بەو فێلە لەگەڵ پاپۆڕەکە دەرناچیت و لەبەنداوەکە دەمینێتەوە. بەوەش ئەو لەو شارە دەمینێتەوەو لەمانگی مارسی ساڵی 1950 دەگەڕێتەوە میسر، لەوێ دووبارە لەسەر پاپۆڕێکی تری بارهەڵگر کاردەکاتەوەو دەگاتە مرسیلیا، لەبەرئەوەی زمانی فەرەنسی چاک زانیوە، بۆیە ژنانی سۆزانی زۆر دەناسێت و خەریکی مێبازی دەبێت، لەبەرئەوەی کارتی مانەوەو ژیانی لەوێ نەبوو، بۆیە سەرهەڵدەگرێت بەرەو بریتانیا دەڕوات، لەوێ بەبیانۆی نەشتەرگەری ریخۆلە کوێرە دەمینێتەوەو لە وەکالەتێکی گەشتوگوزار کاردەکات. کە لەو بوارەو لە کارەکەی سەردەکەوێت روو لە لەندەن دەکات، لەوێ ئیقامەی رەسمی وەردەگرێت و دەبێتە یەکێک لە شارەزاو پسپۆرانی ئەو بوارە، لە کۆمپانیایەکی ئەمریکی گەورە لە نیویۆرک پێشنیاری بۆندی کاری بۆ دەکەن، ئەویش زوو پێشنیارە کە قبوول دەکات و سەفەری ئەمریکا دەکات. لە ئەمریکا دەمینێتەوەو بەقاچاغی ژیان بەسەردەبات و رەچاوی بوونی کارتی سەوز ناکات، بۆیە بەناچاری ژیانی بێ یاسایی بە قاچاغ بەسەردەبات، بەو شێوەیە لە ئەمریکا دەژیت و لە وێیەوە ژیانی جاسووسیەت دەدۆزێتەوەو ناوی دەکەوێتەوە ناو لیستی رەش، بەناچاری لەوێشەوە بەرەو کەندا رادەکات و پاشان دەپەڕێتەوە ئەوروپاو بەرەو فرانکفۆرت دە ربازی دەبێت، لە ئەڵمانیا رەزامەندی ترانزێت وەردەگرێت و دەگاتە وڵاتی نەمسا، لەبەرئەوەی شەوێکیان لەگەڵ ژنێک دەمێنێتەوەو بۆ بەیانی بێ پارەو بێ پاسپۆرت بەئاگادێت.

لەودەمانە کۆنە نازییەکان لە ئەڵمانیا رادەکەن و بۆ دەربازبوونیان بەناچاری پاسپۆرتی بێگانەکان دەکڕن، بۆیە پۆلیس تاوانباری دەکەن کەوا ئەو پاسپۆرتەکەی بەپارە بە نازییەکان فرۆشتووە، لەئاکامدا هیچ پسولەی سەفەری نوێی نادەنێ، بۆ ماوەیەک پۆلیسی ئەڵمانی دەیگرن و بەزۆری و بەیەکەم فڕۆکە بەرەو میسر دووریدەخەنەوە. رفعت کە گەڕاوەتەوە میسر بێکار ماوەتەوە، پاسپۆرتەکەشیان لێوە رگریتەوە، تروسکاییەک هیوای لە هیچ سەرچاوەیەک بەدی نەدەکرد، بەڵام کە لە کۆمپانیای کەنداوی سویس کاری دەستدەکەوێت، دەتوانی بە بەهرەی زانینی زۆرترین زمان زوو بێتە پێشەوە، بەڵام ئەو بەڵگەو پێویستییەکانی دامەزراندنی نەبوو،

بۆیە بەناچاری دادە بەزێتە خوارەوەو لە گەڵ ساختە کارەکان دە ست تێکە ڵدەکات و ئە وانیش پاسپۆرتێکی قەڵبی ساختەی بەناوی (علي مصطفى) بەوێنەی خۆی بۆ سازدەکەن.

ئەو بەو ناوە نوێیەوە لە کۆمپانیاکە دادەمەزرێت. لەو رۆژەوە ئەو هەستدەکات بەرەو ئارامی و حەسانەوە دەچێت. پاش شۆرشەکەی یولیۆی ساڵی 1952 بریتانییەکان هەستدەکەن میسرییەکان لەگەڵ رژێمە نوێیەکە هاوکارو هاوسۆزن، بۆیە لە کۆمپانیا فەرەنسییە بریتانییەکە دەستدەکەن بە پێداچوونەوە بە ناوو پسولەی کارمەندانی کۆمپانیاکەیان، دیارە ئەویش ناوەکەو پسولە رەسمییەکانی هە موو ساختە بوون، بۆیە کارەکەی لە دەستدەچێت و کۆمپانیاکە جێدەهێڵێت. لەهەمان سەرچاوەی ساختەکاری پێشوو ، پاسپۆرتێکی سویسری بە ناوی ژوورنالیستێک دروست دەکاتەوە، بەڵام ئەمجارە ناوەکەی دەبێتە (شارلز دینون)، چەند رۆژێک لە یەکێک لە هوتێلە ستار بەرزەکان دەمینێتەوە، بێ ئە وەی کەس هە ستی بکات، ئەو ریک وەک ژوورنالیستێک دەجوولێتەوە، دەتوانێ هەمووﻻیەک ئیقناع بکات، کەوا ئەو ژوورنالیستەو لە بانکیش 12 هەزار دۆلاریشی هە یە، لەوەش دەردەکەوێت ئەو چەند بەهرەداربووەو بە زمانە بێگانەکان کە زۆر چاک قسەی پێکردوون هەموومان هەڵدەخەڵەتێنێت. ئەو لەگەڵ گۆرانەکان و پێداچوونەوە بە ناوو پاسپۆرتی بێگانە کان لە هوتێلەکە دووردەکەوێتەوەو خۆی بزردە کاتەوە، بۆیەش دووبارە ناوو پاسپۆرتەکەی دەگۆرێت، بەڵام ئەمجارە دەبێتە کەسێکی بریتانی و ناو لەخۆ دەنێت (دانیال کالدویل)، بە شێوەی ئۆتوستۆپی ئۆتومبێلە کان روو لە سنووری لیبیا دە کات، لەورۆژە بیر لەوە دەکاتەوە بەیەکجاری لەمیسر دووربکەوێتەوە، لەوێ لەسەر خاڵی سنوورە کە، بە زاراوەی بریتانی قسە لەگەڵ ئە فسەرە بریتانیاکە دەکات، بە ڵام ئە مجارە کارەکەی مەیسەرنابێت، لەودەمانە سەدان سەربازی بریتانی لەناو میسرو بە و رێگایە رادەکەن، هەر لەو دەروازەدا جوولەکەش سامانەکانیان دەربازدەکرد، لەکاتی پشکنینە ئاساییەکەدا گیرفانەکەی پێ رووتدەکەنەوە، لە گەڵ پسولە کان دە فتەرەکەی لە گەڵ ناوە کەی یە ک نە بوو، لە وێ یە کەمین هەلەی گە ورە لە ژیانیدا دە کات، لە سەر دە فتەرەکە ناوە ئەسلییەکەی خۆیە تی و لە پاسپۆرتەکەشی ناوە بریتانیاکەیەتی، بۆیە ئەفسەرە بریتانیاکە دەستگیری دەکات، بەبەندکراوەیی رەوانەی قاهیرە دەکرێتەوەو گومانی ئە وەی لێدە کرێت ئەو پیاوە نە میسرییەو نە بریتانیشە، گومان دەکەن رەنگە ئەو (داڤید ئارنسۆن)ی ئەفسەری جوولەکەبێت، کە رۆژانێک راوێژکاری سەرکردەی تورکی (جەمال پاشا)بوو لە دمشق، کە لە تۆرێکی جاسووسی کاریکردووە، کە ئەو بنەماڵەیە لەناو وڵاتانی عوسمانی دابەشبببوون، لەبەرئەوەی دەسەڵاتدارانی میسر ئەوەندە کارامەو لێزان نەبوون لەو جۆرە کارانە، بۆیە زوو ئەویان وەک کەسێکی جوولەکە ناسی، رفعت بە وە تاوانبارکرا کەوا ئەو ئەفسەرە جوولەکەکەیە، کە بە میسریش قسەیان لەگەڵ دەکات کێشەکە زۆرتر ئاڵۆزدەکات، بۆیە رەوانەی قاهیرەی دەکەن.

****

جاک بیتون و جوولەکەکانی ناو میسر

لە قاهیرەو لە بەشی میسری نوێدا، دووبارە لێپرسینەوە لە رفعت ئەلجەمال دەکرێتەوە، هەموولایەک بە سەربردەکەی ئەو سەرسام و شۆک دەبن، بەشێک لە ئەفسەرو سەربازەکان، هەتا هەندێک لە گیراوەکانیش گومانیان هەبوو کەوا ئەو جوولەکەیەکی میسرییە، لەودەمانەو لەناکاو کەسێکی نادیارو نە ناسراو لەناو زیندانەکەیدا سەردانی کردووە، وەک چۆن رفعت دەگێرێتەوە لەودەمانە، ئەوەیان وەچەرخانێک بوو لە ژیانی ئەودا، ئەو سەردانە هەموو کاروان و بەرنامەی ژیانی دەگۆرێت و دوارۆژی ژیانی بەرەو ئاراستەیەکی تر دەبات. رفعت ئەلجەمال لە بیرەوەرییەکانییدا نووسیویەتی:

(کابرایەکی باڵابەرزی چوارشانەیان هێنایە بەرامبەرم، دیاربوو کابرایەکی چالاک بوو، جلی مەدەنی لەبەردابوو، کە لەسەرخۆو بەنەرمی قسەی دەکرد، زۆر بە رێزەوە فەرمانەکانی دەردەکرد، بە پاسەوانەکەی پشتەوەی منی وت:

تۆ برۆ دەرەوەو تەنها بەجێمان بهێلە!

ئەو رووی لە من کردو وتی، دانیشە ، منیش بەترسەوە بەرامبەری دانیشتم، زۆر نیگەران بووم، هەستم بە مەزاجێکی کەللە رەقی و بێزاریی دەکرد، نەمدەزانی چی دەقەومێت، ئەو لەسەر مێزەکەی دانیشتبوو، دەست بەجگەرەوە لە منی دەروانی، بەبزەیەکی سادەو ناسک رووی لەمن دەکرد، ئەو خۆی بە من ناساندو وتی:

(من ناوم (حسن حسنی)یە، من لە پۆلیسی سیاسی کاردەکەم).

لەودەمانە پرسیارو گومان گەیشتە نیوچەوانم، من لە خۆمم پرسی، من حەق و پەیوەندیم چییە بە پۆلیسی سیاسی، دەبووایە مباحسی کەتن لە من بپرسێتەوە، بەگوێرەی ئەو تاوانانەی ئاراستەم کراوە، دەبێ بەشی کەتن لەدادگا لێکۆڵینەوەم لەگەڵدا بکات، پیاوەکەی پێشم بەبزەوە وتی:

من نەکارم بە ناوی خۆت بانگت بکەم، من ناوی سییانەی تۆ نازانم، دۆسیە و کێسەکەت زۆر زەحمەتە، تۆ دەزانی شۆرشەکەمان ساوایەو هەمووشتمان دەستناکەوێت، ئێمە نەکارین پێناسەو ناسنامەی هەموو کەس بدۆزینەوە، تۆ تا ئەودەمەش هیچت لەسەر نییە، تۆ بەگومانەوە گیراویت، بۆیە ناکرێ لە دوورۆژ زۆرتر لەلای ئێمە بمینییتەوە، دەبێ دۆسیەکەت

ڕەوانەی لای قازییەک بکرێت، ئەو دەتوانی ئازادت بکات یان بتگرێت، ئێمە تا ئەودەمانەش لە حاڵەتی شۆرش داین، ناتوانین بەرگەی هەلەو بڕیارێک بگرین.

من بەجوانی و لەسەرخۆ گوێم لە قسەکانی ئەو رادەگرت، ئەو کە وتی:

من حەزدەکەم دۆزەکەت دابخەم لەوەی کە پاسپۆرتێکی بریتانیت بەناوی (دانییل کالدویل) دزیبوو، بەلام دۆزەکەت بەوەی کە تۆ کەسێکی جوولەکەی بەناوی (دیڤید ئارنسۆن)، ئەوەیان سەری لێشێواندووم، دەزانم شێکی گەشتوگوزاریت نەدزیوە، من ئێستا ئازادت دەکەم، تەنها لەوە تێبگەم راستی تۆ چییە، تۆ کێیت؟

منیش لە کابرام پرسی، دەمەوێ بزانم تۆ بۆ بایەخ بە دۆزەکەم دەدیت، من چاک دەزانم بۆیە من لێرە ماومەتەوە دیارە کاریکتان بە من هەیە، ئەگینا هەمووتان دەزانن من بێتاوانم، ئەویش لە وەلامدا وبتووی:

(من زۆر بە تۆ سەرسامم، وەلامەکانت زۆر خێران).

****

رفعت لەوە گومانی هەبوو، ئەو کابرایە کە لە پۆلیسی سیاسییە، بۆچی ناوەکەی خۆی بەو وتبوو، ئەوان بەشیکن لە موخابەرات، ئەوان وتبوویان، ئێمە بەلگەو ئەرشێفمان نییە، هیچمان بۆ نادۆزرێتەوە. ئەو وتبووی من زۆر بایەخ بە دۆزەکەی تۆ دەدەم، من ئەوە باش دەزانم تۆ کەسێکی زۆر زیرەکی، تۆ لە یەک کاتدا وەک کەسێکی ئینگلیزو جوولەکەو میسری وێنەت هەیە، ئێمە یەکێک لە پیاوەکانمان ناردبووە لای تۆ، تا لە زیندانا چاودێریت بکات، ئەو وتبووی هەموو جوولەکەکانی ناو زیندانەکە تۆیان وەک جوولەکەیەک ناسیبوو، دەبێ هەمووومان وریابین، دوژمنانی شۆرشەکەمان زۆرەو دەیانەوێت وڵاتەکەمان دووبارە ببەنەوە باوەشی بێگانەو چەپۆکی داگیرکەران و گەورە ئاغاکانی کشتوکاڵ و زەویدارەکان، تۆش وەک کەسێکی ئینگلیز ئەوەیان بۆ تۆ بایەخدار نییە، بەلام من دڵنیام تۆ رقت لە میللەتی میسری نییە.

کە ئەفسەرەکە قسەکانی تەواوکردبوو، رفعت زۆر بە توورەییەوە هاواری کردبوو، من شەرم دەکەم، من هەستدەکەم رەزیلم دەکەن، من تاکێکی ئەو وڵاتەم، من وەک ئێوە میسرییم، من دڵسۆزو خەمخۆری ئەو خاک و ئاوەم، میللەتەکەی خۆم خۆشدەوێت. ئەفسەرەکە هەستی کردبوو کە وا گیراوەکە زۆر تووڕەبووە، بۆیە جگەرەیەکی بۆ دادەگیرسێنێت و بە پێکەنینەوە سەرکەوتنی خۆی لەو مەیدانە دەردەبڕێت، بۆیە بەشانازییەوە بە گیراوەکە دەڵێت:

(من تێگەیشتم تۆ بە رەچەڵەک میسرییت، بەڵام من دەمەوێ تێبگەم تۆ چۆن توانیت وا لەو جوولەکانە بکەیت ئەوان تۆ وەک کەسێکی جوولەکە بناسن؟).

رفعت وەڵامی دەداتەوەو دەڵێت:

(ئەوەیان چیرۆکێکی دوورە، من دەزانم تۆ تاقەتت نییە گوێم بۆ شل بکەیت).

ئەفسەرەکە وتبووی:

(دەی قسە بکە، من کاتم زۆرە!).

ئەویش پرسیبووی، باشە، بۆ تۆ بایەخ بەو مەسەلەیە دەدیت؟
ئەویش لەسەرخۆ وتبووی:

(من زۆر کارم بەو ئیشەیە، من پێشنیارێکم هەیە، قسەیەکم هەیە پێی دەڵێم).

رفعت وتبووی، من چاوەروانی ئەو قسەیەم دەکردو تێگەیشتم من زۆرم درۆکردووە، زۆرم خەڵک هەڵخەلەتاندووە، با ئەو جارە لەوەیان دڵشادبم، من پێویستم بەوە هەیە، با راستییەکان بدرکێنم!

****

جەمال قسە دەکات و دەڵێت:

بەو شێوەیە سەربردەی خۆم بۆ حسن حسنی گێڕایەوە، لەسەرەتاوە من چۆن لە ستۆدیۆی سینەماکان خەڵکی جوولەکەم زۆر ناسیوە، من باش لاسایی ئەوانم کردیتەوە، باش چوومەتە ناو قاڵبی کەسایەتی ئەوان، باسی رۆژانەی خۆمم لە ئینگلتراو فەرەنساو ئەمریکا بۆ ئەو کرد، چۆن لەو دوایانەدا لە میسر ژیاوم، هەموو شتەکانم بەراستی گێڕایەوە، کە لە قسەکانم بوومەوە ئەو بەجوانی بەرووم پێکەنی و وتی:

(تۆ کەسێکی زۆر سەیری، تۆ لە ماوەیەکی کورتدا ئەزموونێکی درێژو دەوڵەمەندت هەبووە، بەسەرهاتەکانت زۆر زۆرتر لە چاو تەمەنت، رووداوی نامۆو سەیرت دیوەو شارەزایی زۆرت لە ژیان پەیداکردووە، من بەپەرۆشەوە لە کەسێکی وەک تۆ دەگەڕام، دەکرێ زۆر سوود لە ئەزموونەکەت وەرگرین، دەکرێ تۆ ببیتە سەرمایەکی باش بۆ ئێمە).

رفعت وتوویەتی:

(منیش لەودەمەدا لێم پرسی، تۆ چییت لە من دەوێت.؟).

ئەویش وەڵامی داوەتەوەو وتوویەتی:

(وەک من زووتر وتم، ئێمە لە میسر قەیرانی زۆرمان هەیە، لە دەرەوە جۆرەها فشارمان لەسەرە، ئاشکرایە کەوا سەرمایەکی زۆر لە وڵاتەکەمان دەچێتە دەرەوە، ئەوانەی پارەکانیان دەبنە دەرەوە جوولەکەکانن، ئەوان بە ساختەو فرتوفێل پارەکانیان رەوانەی دەرەوە دەکەن، ئەوان دەتوانن برێک پارە بەشێوەی یاسایی ببەنە دەرەوە، ئەوە تەنها 5 ساڵە دەوڵەتی ئیسرائیل دامەزراوە، لە وماوەیە کورتەدا سەرمایەکی زۆری بۆ دەچێت، ئێمە ش بە ئاسانی دەکارین فێڵەکانی پارە ناردنەکانیان بدۆزینەوە، ئێمە باش دەتوانین کەسانێکی زۆریان لە ناویاندا بچێنین، دەکرێ کەسانی وا دەستنیشان بکەین، کە ئەوان بڕوایان پێبکەن و بتوانن پشتیوانیەکانیان بدۆزنەوە، تۆش بۆ ئەو کارە شیاویت، دەبێ ئەو کەسە جوولەکەیە بێت، دیارە کە تۆ توانیووت، بەوان بسەلمێنیت کە تۆ کەسێکی جوولەکەیت، ئێمە دەزانین ئەو کارە بە تۆ دەکرێت، ئێستا چییت وت! رای تۆمان لەو چالاکییە پێ گرنگە).

سەرەتا رەفعت وایدەزانی گاڵتەی لەگەڵدا دەکەن، ترسی هەبوو، دەترسا گۆبەندێکی تری بۆ بنێنەوە، دووبارە لەگەڵ جوولەکەکانی ئەسکەندریە ئاوێتەی دەکەنەوەو تووشی سەرئێشەی دەکەن، بۆیە پرسیای کردبوو:

(من چ بکەم، ئێوە چیم بۆ دەکەن..؟).

ئەفسەرەکەش لەوەڵامدا وتبووی:

(خەمی هیچت نەبێت، ئێمە هەموو رابردووەکانت بۆ رەشدەکەینەوە، هەموو دۆزەکانی دادگات بۆ دەسڕینەوە، کێشەکانی پاسپۆرتە ساختەکانی لەسەر لادەبەین، ئەوەی بە ناوی علي مصطفی و شارلز دیتون و دانیل کالدویل دۆزت لە دادگا بۆ کراوە تەوە هەمووت بۆ چارەدەکەین، ئەگەر ناوو کێشەی تریشت هەبێت هەمووت بۆ چارەسەردەکەین، بەهای شێکەکانی گەشتوگوزارەکان بۆ دادەنێینەوە، چیت دەوێ، کام سەفقەت بە دڵە، بە کام ناوو لە کێندەرێ هەمووت بۆ ئاسان دەکەین).
ئەویش پرسیبووی:

(من دەتوانم بژاریَ بکەم، من دەکارم دەستنیشانی بکەم).

ئەویش لە وەڵامدا وتبووی:

(وەک بڕیارو پرێنسیپ هەموو بژارەکانی تۆمان قبووڵە، ئەگەر تۆش ئەوانە قبوول نەکەیت، ئەوا دووبارە لەسەر دۆزەکانت دەگەڕێتەوە زیندان، دیارە تۆش کێشەی زۆرت لەسەرە، بەوانەش ماوەیەکی باش و زۆریش دە گیرێیت. بۆیە ئەو زوو وەڵامی داوە تەوەو وتوویەتی، کەواتە چۆن دەست پێبکەین، لە کێندەرێیەوە من ئامادەم.!).

ئەفسەرەکە وتبووی:

(لەو ساتەی پێشنیارەکەی ئێمەت قبووڵە، ئێمە مەشق بە تۆ دەکەین، مەشقەکانمان کات و شێوە و بەرنامەی زۆر چڕە، لەورۆژەوە کەسایەتیەکی نوێت دە بێت، لەودەمانە ناوت دەگۆڕێت، پێشەی نویَ دەبێت، دەبێ رابردووت لەبیربکەیت، لەودەمانەوە تۆ خۆت بەرپرسی خۆت نیت، دەبێ خۆت کارەکانت چارەسەربکەیت، ئەگەر زانیمان کێشەکانت ئاڵۆزبوون، ئەوا دەستت دەگرین، لە رەوشە ترسناکەکان دەگەینە فریات).

پاش ئەوەی گیراوەکە قسەکانی بیستبوو لە سوچێکدا بڕیاردەدا بیری لێ بکاتەوە، کە زانیبووی هیچ چارە ی نییە ، یان دووبارە بگەڕێتەوە زیندانەکەی، یان دە ستی لە ناو دە ستی ئەفسەرەکە بنێت و بە مەرجەکانیان رازی بێت، یەکسەر داوای کردبوو با بەیەکەوە کاربکەین، با دەست پێبکەین، ئەفسەرەکەش بەبزەوە وتبووی:

(من دڵشادم بەو بڕیارەی لەتۆم بیست، شادومانم).

****

پاش ئە وەی کابرا بە مەرج و پێشنیارە کانی ئە و رازی ببوو، مە شقەکان دە ستی پێکردبوو، لە ویَ بە رنامەکانی شۆرشە کەیان بۆ شرۆڤە کردبوو، لقە کانی زانستی ئابووریيان بۆ باسکردبوو، لە ویَ فێریان کردبوو، کۆمپانیاکان چۆن سە ردەکەون و بێگانەکان چۆن قازانج دەکەن، ئەوانە بە چ شێوەیەک خۆیان لە باجەکان دەشارنەوە، چۆن سامانە زۆرەکانیان رەوانەی دەرەوە دەکەن، لە ویَ فێریان کردبوو جوولە کەکان چۆن دە ژین، هەڵسوکەوتیان چۆنە، چەند کۆرسێکی زمانی عبرییان پێدابوو، مێژووی جوولەکەیان باش پێ خوێندبوو، ئەوان چۆن لە میسر

ژیاون، فێریان کردبوو، چۆن جوولەکەی ئەشکیازو سفاردیم و شارید بناسێتەوە، هەموو سرووتە جوولەکانی باش و زیرەکانە لەبەرکردبوو، جوولەکە کەی پشوودەدەن، هەموو ئەوانەی بەردەوام دەوتەوەو شە وانەش لە کاتی نووستنیدا د ووبارەی دە کردنەوە، ئەوان فێریان کردبوو چۆن بەردەوام بژیت، چۆن خۆی لە گەڵ ژیان رابهێنێت، چۆن لە کاتی پێویستدا خۆی بشارێتە وە، پۆلیسی نهێنی باش ناسیبوو، ئەوان چۆن مامە لە دەکەن، ئە وانە چۆن کاردە کەن، ئەو بەو مەشقانە کەسایەتییەکی نوێی وەرگرتبوو.

****

جاک بیتون

لەو رۆژەوە ناوەکەی ئەو گۆڕا بە جاک بیتون و رۆژی لە دایکبوونەکەشی کرا بە رۆژی 23ی ئۆگسستی ساڵی 1919ی شاری المنصورة، بەڵام لە باوکێکی فەرەنسی و دایکێکی ئیتالی، ئەوەشیان بۆ هەڵبەستا کەوا ماڵباتەکەیان لە میسر باریانکردووە، ئێستا لە فەرەنسا دەژین، وەزعی ئابووری ماڵەوەشیان زۆر باشەو ئایینەکەشیان جوولەکەی ئەشکنازییە. بەو ناوو پێناسەو بەرواره نوێیەوە بەڵگەنامەو پسولە کانی وە رگرت، بەو شێوەیە رفعت الجمال رۆژانە ی خۆی گێڕاوەتەوە. ناوەکۆنەکەو کەسایەتیەکەی جارانی نەماوە، بەرەسمی بووە بە جاک بیتون، بۆ ژیان و کارو بە رنامەکانی گە یشتووە شاری ئە سکەندریەو لە گەڕەکێکی جوولە کەنشینیش ماڵی داناوەو وەزیفەیەکی شایستە شی لە کۆمپانیایەکی تە ئمین وە رگرتووە، هێدی هێدی بڕوای بە و کەسایەتییە بەرزو شیاوە دەبوو، لە گەڵ جوولە کەکانی دەڤەرەکی ئاشنا یەتی دەبوو، لە وێ کۆنە هاوڕێیەکی زیندانی دۆز یوەتەوە کە بەیەکەوە لەسەرسنووری لیبی بۆ دە ربازبوون رۆیشتبوون، لەگەڵ (لیڤی سلامة ) ماوەماوە یەکتریان دە بینی. رفعت ئە وەی لە بیرەوەرییەکانی باسیان لێوەدەکات لە زنجیرە تەلەڤزیۆنەکە باسی نەکردووە، لەوێ نووسیویەتی:

(کەوا ئەو لە ئەسکەندریە گەیشتووتە ناو یەکەی جوولەکەی ژمارە 131 کە لەلایەن کۆلۆنیلی جوولەکە (ئافراهام دار) بۆ بەرژەوەندی ئیسرائیل دامە رزرابوو، کاریان بۆ موخابە راتی جەنگی ئیسرائیل دەکرد، ئە ندامەکانی ئە و گرووپە کاری تێکدە رانەیان دە کردو دە زگاکانی ئەمریکی و بێگانە کانیان دە تەقاندەوە، لە ناو میسریش وا دە ناسرا کەوا ئە و چالاکیانە لەلایەن رێکخراوە نهێنییە میسرییەکانەوە ئەنجامدراوە، بە ڵام دوایی بە شەرمەزارییەکەی لافۆن ناسرا، ناوەکەش لە ناوی (ئیسحاق لافۆن)ی سەرۆک وەزیرانی ئیسرائیلی ئەو کاتەوە هاتووە.

لەناو یەکە جوولەکەکە جاک بیتون چەند جوولەکەیەکی ناسیبوو، پاشان ئەوانە بوونە کەسایەتی ترسناک و ناودار لە جیهانی موخابەرات و جاسووسیەت، وەک مارسیل نینوو ماکس

بینیت و ئیلی کۆهین، ئەوەی دوایی لە سوریا گەیشتبوو پلەیەکی ناسک و بڵەدار لە سوریاو لە زۆر لە نووسینەکانی جاسووسیەتی ئیسرائیل ناوی وەک جاسووسێکی ترسناک هاتووە).

***

بەرەو گۆڕان

لەو بە شەی بیرە وەرییەکانیدا رفعت سە رسامی و شۆکی پێوە یە، دیارە ئەوانەی نووسراوە لە هیچ بەڵگەنامەو بڵاوکراوە کاندا ئاماژ ەیان بە و شێوە یە پێنەدراوە، ئە و بە تەواوی بەشێوەیەکی تر باس لە چالاکییەکەی سۆزانا دە کات، یان وە ک ناسراوە بەشەرمەزارییەکی لافۆن، ئەو دەڵێ هەموو رووداوە کان لەژێر کۆنترۆلی دە زگای قەڵاچۆکردنی جاسووسیەت بوو، زوو ئەفسەرە هاوڕێیەکەی حسن حسنی و پاشان علي غالي چاویان لە رفعت بووە، پاش ئە و رووداوە هەموو چالاکییەکانی یەکەی 131 چاودێری دەکرا، ئەو لەناو جەرگەی رووداوە کان و لەناو گەرمی زانیارییەکان زانیاری دەگەیاندە ئەفسەرە بەرپرسە میسرییەکانی، بۆیەش زۆر لە چالاکییەکانی ئە و یە کەیە سەری نە دەگرت و زۆریش دە گیران، کە یەکێکیان لە پێش سینەماکەی ریو لە ئەسکەندریە گیرا، رێکەوت نەبوو، چونکە لەو شانەیەدا رفعت کاریدە کرد، دەزگا ئەمنییەکان رفعت و ئیلی کۆهینیان وە ک ئەندامێکی ئە و یە کەیە گرتبوو، بەڵام زوو هەردووکیان لەبەرئەوەی هیچیان لە سەر ئاشکرا نە ببوو ئازادکرابوون. کۆهین پاش ئازادبوونی وڵات جێدەهێڵیت و جاک بتۆنیش لەسەر کارەکانی بەردەوام دەبێت، گومان لەوەدا نەبوو کەوا ئیسرائیل دەستی هەبووە لەو رووداوەو ئەوانیش یەکەی 131یان بەو تاوانبارکردبوو، چونکە بۆل فرانکیان پاش گە ڕانەوەی بۆ ئیسرائیل بە و تاوانە بە 12 ساڵ زیندانی کرابوو . رفعت لە بیرەوەرییەکانیدا جەختی لەسەر ئەوە کردیتەوە، کەوا ئەو لەناو جوولەکەکانی ئەسکەندریە کاری زۆری کردووە ، پاش ئە و رووداوە رفعت دە چێتە قاهیرەو لە وێ دیمانە ی لە گەڵ ئە فسەرە نوێیەکە (علي غالي) دەبێت، ئەویش دەستخۆشی گەرمی لێدەکات، بۆیە داوای لێدەکات لەو رۆژانە دووبارە ئەو بە رنامەی نوێی بۆ دادە رێژێت، بەپێی ئەو کار و بە رنامەیە ئەو رەوانەی درەوەی میسر دەکرێت، چونکە ئەو وە ک ئە ندامێکی کارای یە کەی131 وەک پاڵە وانێک لەلایەن ئاژانسە کانی جوولە کە ناوی دە هات. سەبارەت بە و گۆڕان و بە و بە سەرهاتە نوێیانە رفعت، بەو شێوەیە باسی بیرەوەرییەکانی خۆی کە وەک جاک بیتۆن نووسیویەتی:

(بیرم ئەو رۆڵە بۆ من زۆر ترسناک بوو، من ئێستاش هە ستدەکەم، ئەوانەی ژیانی منیان کڕیوەتەوە زۆر قەرزاریانم، کارکردن لە گەڵ ئە و دە زگایە موخابەراتی زۆر ناسک و مەترسیدارە، کە بریارمداوە بچمە ناو جەرگەی مەیدانەکە واتە دڵی لانەی شێرەکە، جەرگی دەوێت، ئەوەم باش دە زانی خۆشاردنەوە لەناو ئیسرائیل ئاسان نییە ، ئەگەر ئاشکرابوومایە

یەکسەر دەکوژرام، بواری دەربازبوونم نەبوو، ئیسرائیل هەموو جاسووسەکانی پاش لێکۆڵینەوە کوشتووە، بێگانەکانی زوو کوشتووە، من لەودەمانە وەک لە فیلمێک ڕۆڵ دەگێرم، بەو شێوەیە پێیەکانم لەسەر زەوی گیرکرد، وام لێهات ناوو کارەکەم بە ناوی جاک بیتۆن خۆش دەویست، حەزم زۆر چووە گەمەکە، ئەمجارە شانۆکەم بە ڕیزتربوو، گەیشتمە ڕووبەرێکی بەرین لە و جیهانە، بابەتی شانۆکەمان جاسووسەتی دەوڵی بوو، زۆر چێژم لە و ڕۆڵە دەبینی، حەزمکرد ئەو گیانبازییە بکەم، چاک بیرو بە رنامەم بۆی دارشت، دوو ڕێگام لە پێش بوو، یان دەگیرێم، یان دەربازم دەبێت، باشم دەزانی بگیرابوومایە یەکسەر دەکوژرام، من لە و ڕۆڵە حەقی خەلاتی ئوسکارم هەیە، من ئەوەم باش دەزانی کە وا من بۆ میسرو میللەتەکەم کاردەکەم، بۆیە ئەودەمانە بە غالي ئەفسەرە بەرپرسەکەم وت:

تۆ دڵنیایت من ئەو چالاکییەو ئەو ئەرکە قورسەم پێدەکرێت. پاش ئەو پرسیارە دوو پرسیارم ترم لە غالي کرد، باشە چۆن دەست پێبکەین، کەی و چۆن...؟).

ئەویش لە وەڵامدا وبتووی:

(ئێمە لەسەر دۆزو مەسەلە دەوڵیەکان مەشقت پێدەکەین، دەبێ گەمەکە باش لەناو خوێنت بگەڕێت، تۆ دەرهێنەری شانۆنامەکەی، یان لە دەرهێنانەکە سەردەکەویت، یان بەیەکجاری لەناودەچیت. منیش قسەکانی ئەوم باش وەرگرت. ئەوان چەند کۆرس و ڕاهێنانی چڕیان بۆم کردەوە، مێژووی جوولەکە ئەوروپاییەکانیان پێ خوێندمەوە، مێژووی زایۆنیزمیان فێرکردم، زانیم جوولەکە چۆن و کەی گەیشتوونەتە فەلەستین).

بەو جۆرە ئەو لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو و بە منی وت:

لەو ماوەیەدا مێژووی هەموو سیاسییەکانی ناو ئیسرائیلم خوێند، سەندیکاکانم ناسی، یەکێتی کرێکاران یان هستدرۆتم ناسی . تا زۆر باش بتوانم کارەکانم راپەڕێنم ئابووری و جوگرافیاو تۆبۆگرافیاو پێکهاتەی کۆمەڵگەی ئیسرائیلم خوێند، ناوی کەسایەتیە ناودارەکانیان لە بواری سیاسەت و سوپاو ئابوورییان فێربووم، بە چەندین فیلمی هەواڵەکان و هەفتەنامەکان ئەو دەرسانەیان پێدەدام. بەکامیرای زۆر وردو بە لگەنامەیی حاڵەتی شەڕو هێرش و دەربازبوون و خۆشاردنەوەیان نیشاندام، فێریان کردم چۆن فیلمی فۆتۆگرافی بشۆمەوە، چۆن بێتەلەکان بەکاربهێنم، چۆن بە حبری سپی نامەی نهێنی بنووسم، دەبوایە بەکارهێنانی رادیۆش باش بزانم، هەموو پلەو پۆستی دەزگاکانی موخابەراتم ناسی، چەکە قورسەکان و وردە چەکەکان و نارنجۆکەکان و قونبلەی دەستی و دانانەوەیان فێرکردم. زۆر بایەخم بە ئایینی موساییداو خەریکی فێربوونی زمانی عیبری بووم، ڕۆژانە چەند سەعاتێک گوێم لە رادیۆی ئیسرائیل

دەگرت، کۆششم کرد زاراوە میسرییەکەم زۆر باش زمانی عبری دەربیم، چونکە من لە میسر لە دایکبووم، پاش ئەوەی مەشقە چڕوپڕەکانم تەواوکرد، دەبووایە کارێکم بۆ بدۆزنەوەو ناوو کارم دیاربێت، منیان کردە وەکیلی گەشتوگوزارو نووسینگەیەکم بۆ دانرا، بەوەش دەکرا بەئاسانی و زۆریش بچمە ناو ئیسرائیل، کارو بەرنامەکەم وا بوو، من زۆر دەمینێمەوەو بەئاسانی تەواونابم، چالاکییەکانم درێژخایەن دەبن، بۆ ماوەیەکی کورت و دیاریکراو نییە، بڕاری ئەوەشم هەبوو هەر کە هەستم بە مەترسیکرد، دەکرد، زوو و یەکسەر وازبهێنم و بکشێمەوە، وتیان دەتوانی بگەڕێیتەوەو میسرو بەرنامەی ئاسایی ژیانی خۆت بەیتەسەر، هەردەمێ ویستت دەستبەردارت دەبین. یەکەمجار 300 دۆلاری ئەمریکیم وەرگرت و چوومە ناو ئیسرائیل، لە مانگی یونیۆی ساڵی 1956 سواری پاپۆربووم بەرەو ناپۆلی بەرێکەوتم، مەبەست و بەرنامەشم گەیشتن بوو بە خاکی میعاد، رۆیشتم و هەمدەزانی دوارۆژم دەگاتە کێندەرێ.

ئەو لەو کاروانەدا گەیشتە ناپۆلی، لەوێ ئاژانسی جوولەکەکان ئەوێندەرێ دۆزیەوە. ئەوان کۆششی زۆریان کرد تا ئەو رازی بکەن سەفەری ئیسرائیل بکات، ئەویش وەک جوولەکەکانی تر بچێتە خاکی میعاد، بەڵام زیرەکی و لێهاتوویی ئەو لەوەدابوو وایدەردەخست حەز بەو سەفەرە ناکات، نایەوێ بەرەو ئیسرائیل کۆچ بکات، بەڵام ئەوان زۆر خەریکی دەبن، زۆر کۆششدەکەن بۆیە بەو سەفەرە رازی دەبێت و ئەوانیش بۆ ناو پاپۆرە کە بەرەو ئیسرائیل پاڵی پێوەدەنێن، لەوێ پیاوێکی سەر بە موخابەرات بەناوی (شواب) بەگەرمی پێشوازی دەکات، کەمێ پرسیارو لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکەن، دەرئەنجام ماوەی مانەوەو پاسپۆرتێکی ئیسرائیلی دەدەنێ، بۆیەش موخابەراتی میسری دەزانی پیاوەکەیان هەنگاوەکانی باش بڕیوە و توانیویەتی مەودایەکی باش بچێتە پێشەوە. رفعت لە بیرەوەرییەکانیدا بەو شێوەیە باس لەو رۆژانە دەکات و نووسیویەتی:

(من توانیم لە شەقامی برینر 2 لەجەرگەی شاری تەلئەبیب نووسینگەیەکی گەشتوگوزار بەناوی (سی تورز) دامەزرێنم، توانیم دۆستایەتی لەگەڵ (مۆشی دیان) پەیدابکەم، شواب بەردەوام خەریکم بوو، کۆششی دەکرد من دەستەمۆبکات، تا رۆژێکیان ژنێکی زۆر نازداری بەناوی (راکیل ئابشتین)ی نارده لام، کە بڕوای تەواوی شواب و عیزراو ئایزمانم بەدەست هێنا، بەگەرمی و بە ترسناکییەوە چوومە ناو گەمەکە، پێش هێرشە سێ قۆڵییەکەی سەر میسر من ئاگاداربووم، لەودەمانەدا سەفەری رۆماو میلانۆم کردبوو، لەوێ هەموو رووداوو زانیارییەکانم دەگەیاندە بەرپرسەکانم، من ماوەیەکی زۆر قسە و هەواڵم بۆ دەهێنان، بەرپرسە میسرییەکانم کەسیان بڕوایان نەدەکرد، لە ساڵی 1957 لەناکاو کۆنە هاوڕێیەکەی یەکەی 131 ئیلی کۆهین سەردانی کردم، من زوو زانیم ئەو پیاوە لە سوریا کاردەکات، لەوێ دەیەوێ زانیاری بۆ ئیسرائیل پەیدا بکات، هەر بە نووسینگەکەم توانیم پردی نەپساوەی زانیاری لەگەڵ بەیروت سازو گەشە بکەم، جوولەکەی بەیروتم دەگەیاندە ئیسرائیل، بۆیەش ئیسرائیلیەکان لەسەر ئاستی بەرز بڕوایان پێمکرد، لە هاوێنی ساڵی 1958 بەنهێنی سەرم لە میسردا، نیازی

سەفەرەکەشم ناونابوو پیرۆزبایی کردنی لەپرۆسەی هاوسەرگیری ئیلی کۆهین و هاوسەرەکەی).

ئەو لە بیرەوەرییەکانیدا باسی پەیوەندییەکانی بە (دیان)و (ئایزمان)و (شواب)کردووە، کە ئەو کەسانەی ناسیووە گەیشتبووە (بن گوریون)، توانیبووی ببێتە یەکێک لەو گەنجانەی بەردەوام هاوڕێیەتی ئەویان کردووە، هەمووشیان بڕوای زۆریان بەو کردووە، گۆلدا مائیری بە ژنە دلۆڤانەکە ناوهێناوەو وتوویەتی:

(ئەو ژنە زۆر منی خۆشویستوەو رووی زۆر دەدامێ. من زۆریش لەوە دەترسام ئەگەر رۆژێک ئەو ژنە راستیەکەم بزانێت، چیم لێدەکات و وەڵامی چ دەبێت.!).

****

داوای کۆتایپهێنان

ساڵانی 1959 تا 1963 گۆڕان و بەسەرهاتی شیاوی باسی تێدا نەبووە، بەڵام لەناکاو زانیاری کوشندە و سە رسورهێنەر بە میسر دە گەێنێت، بە میسرییەکان رادە گەێنێت کەوا ئیسرائیل خەریکی بەرنامەی چەکی ناوەکییەو چەکی نوێی زۆر سازکردووە ، ئەو قسانەشی بە سەرۆکەکەی علي غالي گە یاندبوو، کە لە شاری میلانۆ دیمانە یان بووە، لەوێ یەکەمین و دوایەمین داواشی لێ دەکات پێیدەڵێت:

(گەورەم علي غالي من دەمەوێ دەست لەو کارە بکێشمەوەو بگەڕێمەوە میسرو بەیەکجاری کەسایەتی جاک بیتۆن بنێژم و ئەو ناوەو ئەو کەسایەتیەی لەکۆڵ خۆم بکەمەوە).

ئەو لە یونیۆی ساڵی 1963 هەستی بە ماندبوون و بێزاری لەو کارە کردبوو، بۆیە بەکڵۆفەوە داوای کردبوو، کۆتایی بە کارەکەی بهێنێت، شە یدای ئەوەبوو ناوەکەی جارانی وەرگرێتەوەو کەسایەتی رفعت ببینێت و بگەڕێتەوە سەر ئایینی ئیسلام و ناسنامەی میسریبوونی خۆی وەرگرێتەوە، بەڵام ئەو وەک هەستیدەکرد، ئەوەیان وا ئاسان نەبوو، نەدەکرا وا بەئاسانی وا بەخێرایی کەسایەتی و ناوی جاک بیتۆن لەسەر خۆی بسڕێتەوەو، ناکرێ وا ئاسان لە ناو دڵی ئیسرائیل دابڕێت، دووبارە وەک رفعت بگەڕێتەوە شارەکەی خۆی و لە قاهیرە سەربەستانە بسوڕێتەوە. رفعت ئەوەی چاک دەزانی وازهێنان لەبازنەی جاسووسیەت وا ئاسان نییە، بۆیە بیرۆکەی دەست لە کارکێشانەوەکەی دواخست، دڵی خۆی بە وە خۆشکرد کە بۆ ماوەیەکی

تریش با کە سایەتی جاک بیتۆنی لە بەردابێت، بەڵام بیری لە وە کردەوە ئەگەر لە ئیسرائیل دووربکەوێتەوەو لە ولاتی سێیە م بژیت، ژیانی خۆشتردە بێت، بە وە رەنگە مۆساد ئە ویان لەبیردەچێت و دوورکەوتنەکەی لە کارەکەی ساردی دە کاتەوە. لە بەشی بیرەوەرییەکانیدا کە ئەو بۆ ژنە ئەڵمانەکەی نووسیوە، دەڵێت:

(کە لەینایری ساڵی 1964 گەڕامەوە ئیسرائیل کە تۆم بە گۆلدا مائیر ناساندو ئەویش زۆر تۆی کە وتبووە بەردڵان، پاشان بە یەکەوە چووینە لای گۆریون لە کیبوتزە تایبەتیەکەی خۆی، لە و گەشتەماندا (دیان)یش لەگەڵمان هات، ئە و پیرەمێردە زۆر بەگەرمی پێشوازی لە تۆ کرد، کە من لەگەڵ ئەوو دیان کارو بە رنامەمان هەبوو، ئە و بە تۆی وت، دەتوانی لە کیبوتزەکە بۆ خۆت پیاسەیەک بکەیت. لەو دیمانەیەدا من و ئەو شتێکی گرینگمان باس نەکرد، تەنها ئەوەبوو دەبووایە لە رووداوەکانی رۆژگارا ئاگاداربین).

ئەو لەگەڵ ژنە ئەڵمانییەکەی لە ئوکتۆبەری ساڵی 1963 یەکتریان خۆشویست و بوونەتە هاوسەر. رفعت بەو جۆرە لە گەورە دەسەڵاتدارانی ئیسرائیل نزیک بوو. ئەگەرچی ئەو ماوەیەکی زۆر لە ئیسرائیل و لە دەرەوە ژیابوو، بەڵام خوێنە میسرییەکەی هەر تێدامابوو، کە ژنەکەی لە ئیسرائیل ئاووس بوو، حە زی نە کرد مناڵە کەیان لە وێ ببێت، تا مناڵە کەیان لە ئیسرائیل لەدایکی نە بێت و رە گەزنامەی ئیسرائیل وە رنە گرێت، سە فەری ئە ڵمانیای کرد بوو، بەوەش ژنەکەی لە وێ بزێت و مناڵە کەیان رە گەزنامەی ئە ڵمانی هە بێت، نە ک رەگەزنامەی ئیسرائیلی. ئەو هێدی هێدی کارە کانی کەم دەکردەوە پەیوەندییەکانی لە ئیسرائیل لاوازدەکرد، بەڵام لە ئەڵمانیا پە یوەندییە کانی زۆرترو فراوانتر دە کرد، ماوە یەکی باش خە ریکی پترۆڵ بوو، بابەتی هە مەجۆری لە سەر پترۆڵ دە خوێندەوە، بڕیاریدابوو ئە و کارە و ئە و بە رنامەیە بکاتە سەرچاوەی ژیانی نوێی خۆی، کە داوای رە گەزنامەی ئە ڵمانیشی کرد ، زۆرتر کە وتە بواری کارکردن، ئە و باشی دە زانی ئە گەر رە گەزنامەی ئە ڵمانی هە بێت، زۆرترو ئازادانە تر دە توانێ سەفەربکات، بە تایبەتی بۆ میسر، ئە و وە ک خاوەنکارێک و وە ک بازرگانێکی گە ورەی جیهان بوارو بازار پترۆڵ دەیتوانی سە فەری هەمووی لایە ک بکات. رفعت بە پەیوەندیە زۆرەکانی ناو ئیسرائیل زانیبووی لە یونیۆی ساڵی 1967 ئیسرائیل هێرش دە کاتە سەر میسر، ئە وەشی بەرروونی بە دەسەڵاتدارانی ناو میسر وتبوو، بە ڵام کە سیان قسە کانی ئە ویان بە جدی وەرنەگرتبوو، بایەخیان بە زانیارییەکانی ئەو نەدابوو، چونکە ئەوان زۆرتر بیریان لەوە دەکردەوە کەوا ئیسرائیل زۆرتر مە بەستیان سورڕیایە نەک میسر ، بۆیە زانیارییەکانی ئە ویان پشتگوێ خستبوو.!

لە ساڵی 1967 نسکۆکە روویداو شکانەکە گەورەبوو، ئەگەرچی شکانەکەو رووخانەکە دژوارو مە ترسیداربوو، ئەو پە یوەندییەکانی بە موخابەراتی میسری هێشتووتە وەو هە موو زانیارییەکانی بەردەوام دەگەیاندە میسرییەکان، تا رۆژێکیان هەواڵ و زانیارییە کی زۆر ترسناک

و لەناکاوی گەیاندە میسرییەکان، ئەوانیش بڕوایان پێکردو شەڕەکەی ساڵی 1973 قەوما.

****

مردنی جەمال عبدالناسر:

مردنی سەرۆک جەمال عبدالناسر کاریگەری زۆری لە سەر رفعت هە بوو، ئەو بە مردنەکەی ئەو زۆر شلەژا، شەوەکەی حەزی دەکرد زۆر بگریێت، بەڵام بۆی نەکرا بگریێت، بەناچاری ژانەکەی دڵی دەخواتەوەو بەو بۆنەیەش ئەو وتوویەتی:

(کە من باوکم لە رۆژی 28ی سپتەمبەری ساڵی 1970 مرد، هەستم بە مردنەکەی ئەو نەکرد، جەمال عبدالناسر لە جێگەی باوکم بوو).

رفعت دەڵێ، کە من پاش نسکۆکەی ساڵی 1967 سەردانی میسرم کرد، زانیم چەند پێویستە من بۆ وڵاتەکەم کاربکەم، تێگەیشتم ئەو شەڕە چەند دژواربوو، ئەرکەکەی سەرشانم چەند پیرۆزە کە لەناو وڵات و لە ئیسرائیل و لە ناوچەکە کۆشش بکەم. ئاگری گەرمی رووداوەکان رفعتی باش دە کوڵاند، بۆیە ئەرکەکانی بەباشترین شێوە رادەپەراند، تا کۆتایی شەڕەکەو سەرکەوتنی سوپای میسری لە بەشێکی بەرەکە ئەو بڕیاردەداو داوا دەکات بگەڕێتەوە وڵاتەکەی، بەڵام موخابەراتی میسری هەرگیز قبوول ناکات ئەو بە ناوە کۆنەکەی بگەڕێتەوەو هەموو بزانن ئەو کێ بووە ، چونکە پاراستنی ئەویش ئاسایی نە بوو، بۆیە ئەو وەک کەسێکی ئیسرائیلی و سەرمایەدارێک و خاوەن کارێکی ئەڵمانی هاتەوە میسرو لە ساڵی 1977 مافی پشکنینی پترۆڵی میسری دە ستکەوت، تا نە خۆشی کانسەر لە ساڵی 1981هیلاکی کرد کاریکردووە، پاشان لە بیرەوەرییەکانی ئاشکرابوو ئەو کەسە کێ بوو و چی بۆ میسرکردبوو، ئینجا ژنە ئەڵمانیەکەی (فلتراود)و کوڕەکەی دانیال و کیژە بەناوکراوەکەی (ئەندریا) راستی باوکیان زانی، لە رۆژی مردنەکەشی برازاکەی محمد سامي ئەلجەمال، بەو هەواڵەو کۆششەکانی مامی شۆک گرتبووی . ژنەکەشی باس لە پەیوەندییەکەی بە هونەرمەند ئیهاب نافیع و شووکردنەکەی بەو هونەرمەندە دەکات، لەوێ باس لەوە دەکات چۆن مێردە کۆچکردووەکەی پەیوەندی بە موخابەراتی میسری کردووە، کە مێردەکەشی ئەو کارانەی کردووەو ئەو ئاگاداری هیچ نە بووە، بەڵام بەردەوام دەیویست لە راستییەکان تێبگات. موخابەراتی میسری توانی بۆ ماوەی 18 ساڵ، ئیسرائیلییەکان بەهۆی رفعت الجمال هەڵخەڵەتێنێت، ئەو ببێتە یەکێک لە زیرەکترین جاسووسی جیهان.

---

لەرۆژنامەی (الجريدة)ی کویتی رۆژانی21و22و23ی سپتەمبەری ساڵی 2008 بڵاوکراوەتەوە.

# لیون تۆماس جاسووسی ناو کۆشکی کۆماری

لەکۆتایی پەنجاکان میسرو سوریا بەرنامەی یەکێتی و یەکگرتنەوەیان هەبوو، دەهوایە ئیسرائیل لەو رەوشەدا بەوردی چاودێری رەوشەکەی کردبووایە، بۆ وەرگرتنی باشترین زانیاری لەسەر ئەو دوو وڵاتە دەهوایە ئیسرائیل چەندین جاسووسێکی هە بێت تا بتوانن زۆرترین و هەستیارترین بەڵگەنامە بدۆزنەوە، لەوانە ئیسرائیل کەسێکی ئەرمنی بەناوی (جان لیون تۆماس) پەیداکرد، کە توانی تۆڕێکی جاسووسی بە هێز لە ناو میسر پە یدابکات، ئەو توانی جاسووسێکی سامناک بەناوی (ئیلی کۆهین) بدۆزێتەوە کە بەزیرەکی و چالاکییەکانی سەری هەموو لایەکی شێواندبوو.

لەسەردەمی داگیرکەری بەریتانی کەمینەی ئەرمنی لە میسر زۆربوون، ژمارەیان لە هەزارەها کەسیان تێدەپەڕاند، ئەوانە لەناو کۆمەڵگەکە ئاوێتەببوون، زوو بە ژن و ژنخوازی و بەخوێن باش لەگەڵ میسرییەکانی تر تێکەڵبهوون، بەڵام لەگەڵ یەک و لەناو ئەرمنیەکان زمان و کولتووری خۆیان پار استبوو، بۆ زمان و دابونە ریتی خۆیان دڵسۆزبوون، تۆماس یە کێک بوو لەوانەی کاری بازرگانی دە کرد، بە چەند ساڵێک توانی سە رمایەکی باش کۆبکاتە وە، کە ژنە ئەڵمانیەکەی هێناوە توانیویەتی زۆرترو باشتر بچێتە ناو خەڵکەکەو (کیتی دورث)ی ژنی رۆڵی زۆری هەبووە تۆماس بەو خەڵکە نوێیە بناسێنێت.

****

لە ناو تەڵەکەدا

بۆ راپەڕاندنی کارە بازرگانیەکانی تۆماس سەفەری زۆری ئەڵمانیای خۆرئاوایەکرد، لەوێ جاسووسی زۆر کارامە و وریا خۆیان پێناساندووە ، ئەوانە هەستیانکردووە، ئەو پیاوە خاڵی لاوازی زۆری تێدایە و دە توانن لە و خاڵانە سوودی لێوەرگرن و بە کاریبهێنن، کە لەو نزیک دەبنەوەو تێدەگەن ئەو کەسێکی ناسراوەو پەیوەندی زۆری لەناو میسردا هەیە، زۆرتر لە دەوری دەسووڕێتەوە، بە سیماو بەبەرگی پیاوانی بازار ئە فسەرانی موخابە راتی ئیسرائیلی لە و نزیک دەبنەوە، ئە فسەرەکان ئەوەی تێدا دە دۆزنەوە کەوا ئەو حە ز لە لاقەی منالان دە کات، یان هەندێ جار نەخۆشی دەروونی دەیگرێت و مەزاجی دەشێوێنێت، زۆریش تووڕەبوونەکانی لە ژنە جوانەکەی دە ردەهێنێت، ژنەکە زۆر بیر لە وە دەکاتەوە بۆچی کیژە خزمەتکارە ساواکان لەو دووردەکەنەوەو ناگە ڕێنەوە ماڵەکەی و بێ خزمە تکار دە مینێتەوە، دە یویست هۆکارە سەرەکییەکان بدۆزێتەوە.

یەکێک لە پیاوانی موخابە رات بیر لە وە دەکاتەوە کیژۆلەیەکی بێ سە رپەرشتاری جوولەکەی لێ نزیک دە کەنەوە، کیژە کە تەمەنی تەنها دە ساڵ دەبوو، رۆژێکیان ئە و کیژە لە فرانکفۆرت لە دەرگای شووقە کەی دە دات، پێش ئە وەی کیژە کە بچێتە شوقەکەی چە ندین کامیرای چاودێری و ئامێری نهێنی وە رگرتنی بۆ دادە نێن، لە شوقەکەی تەنیشتیەوە چاودێری هەڵسوکەوتی دە کەن، دە یانەوێ بز انن تۆماس چی لە و کیژە منالە دەکات، لە کامیراکەوە دیمەنێکی زۆر سەرسورهێنەر دەبینن، دەبینن کە چۆن تۆماسی گورگە برسییەکە چ لە منالە لاوازە بەستەزمانەکە دەکات، دەبینن چۆن کیژەکە بەگریان و ترسەوە لە گورگەکە دەپارێتەوە، ئەویش لە کیژەکە دەپارێتەوە تەسلیمی بێت و زۆر ئازاری نەدات، ئەو شەلالی ئارەقەی ڕەش و شینە، کیژەکە هاواردەکات، داوای دەربازبوون و دەرچوون دەکات، بەهەموو کۆشش و هێزییەوە کۆششی رزگاربوون دە کات، لە و هێرش بردنە و پە لاماردانەدا چە ند کە سێک دە رگای لە سەر دەکەنەوەو کیژەکەی لەبن دەستی دەردەهێنن، ئەویش لە پیاوەکان دەپارێتەوە تەسلیمی پۆلیسی نە کەن، ئەوانیش تا رادە ستی دادگاو لێپرسینە وەی توندی نە کەن پێشنیاردە کەن لە گەڵ مۆساد کاربکات و هاوکاریان بکات، ئە گەرنا بەتاوانی پەلاماردانی منالێک دووچاری گە ورەترین سزاو ئابرووبردنی دە بەن. ئەودەمانە تۆماس لە لوتکەی شە رمەزاری سە رشۆڕی بوو، بواری بیر کردنەوەو رامانی نە بوو، لە رەوشێکی وابوو هۆش و بیر کردنە وەی نە مابوو، لە ناو ئیرادە و بیر کردنەوەی بە کەسێکی تێ گۆڕا، زۆر بە ئاسانی تە سیلمی واقیعێکی تاڵ دەبێتەوەو، خۆی دایە دەست ئەفسەرانی مۆساد.

هەر لە ودەمانەدا دە ستکرا بە مەشقکردن و دە ستەمۆیانکرد، بە دەستی خۆی چە ند لاپەرەیەکی لەسەر رەوشی ئابووری میسرو باری گوزە رانی هاوولاتیان بۆ نووسین، شوێنەکەو گیرانەکەی ئە و ترسناک بوو، نە یدەتوانی دە ربازی بێت، هە ڕەشەی کوشتنی هە موو ئە ندامی خێزانەکەیان لێکرد، ئەگەر لە میسر لەو کارە ئاگاداری بەرپرسانی میسری بکاتەوە، مۆساد لەناو قاهیرە خەڵکێکی زۆر کاری بۆ دە کردن، ئەوان بەئاسانی دەستیان دەگەیشتە تۆماس، بەخێرایی دەرەقەتی کە سوکارە کەی دە هاتن، لە قاهیرە لەرۆژی بوونی کیژە کەی چە پکە گوڵی پیرۆزبایی بۆی نارد، کە تەلەفۆنی بۆ ماڵە وە کردبوو، کیژە کەی بۆ ناردنی چە پکە گوڵەکەو پیرۆزباییە گەرمەکە زۆر سوپاسی کردبوو، کە زانیبووی ئەوان گوڵەکەیان ناردووەو رۆژی بوونی کیژە کەو ئەدرێسەکەیان زانیوە، زۆر سە رسام بوو، بۆیە هاواردەکات و ناچاردە بێت تە سلیمیان بێت و کاریان بۆ بکات، تازە کار لە کار ترازاوە، بەیەکجاری کەوتووتە تۆڕەکەیان و دەربازبوونی نەبوو.

ئەو لەناو فڕۆکەبوو بیری لە حالەتی خۆی دەکردەوە، لە خۆی دەپرسی، دەبێ ئەمجارە دەربازم بێت؟

کە گەیشتەوە قاهیرە هەر ئەو رۆژە تەلەفۆنی لەگەڵ هاوڕێیەکی خۆی لە خوێندگای تۆپخانەی میسری کرد، کە لە پۆستێکی باڵای ئەو شوێنەبوو، پرسیاری زۆری لە هاوڕێیەکەی کردبوو، لە وی پرسیبوو چۆن دەزگای موخابە راتی میسری هاوولاتیە کی میسری لە ترس و هەڕەشەی مۆساد دەپارێزێت، ئەوانە چییان بۆ ئەو کەسە پێدەکرێت...!؟

محمد آحمد حسن لە وەڵامدا وتبووی:

(دڵنیابە دەزگای موخابەراتی میسری دەستی باش دە ڕوات، چاکسازیی زۆری لە ناو کراوە، یەکێکە لە دەزگا هەر چالاکەکانی جیهان، بە ردەوام کادیرەکانی مەشقیان پێدەکرێت، ئەگەر هەر کەسێک لە دەرەوە بکەوێتە داوی تۆڕی مۆسادو کە سەکە ئاگاداری میسرییەکان بکاتەوە، ئەوە کەسەکە لەلایەن موخابەراتەوە دەپارێزێت).

تۆماس بڕوای بە قسەی هاوڕێیەکەی ناکات، متمانەی لا دروست نابێت، وادە زانی پروپاگەندە بۆ بەرژەوەندی موخابەرات بڵاودەکاتەوە، بۆیە گوێی نەدایە قسەکانی ئەوو لە سەر خیانەتەکەی بەردەوام بوو، ئەگەرچی هاوڕێیەکەی زۆری ترساندبوو، بەڵام ئەو بەدیاری زۆرو پاداشتی گرانبەها زۆرتر کابرای زۆرتر لە خۆی نزیکی کردەوە، برادەرەکەشی رۆژێک نەیپرسی ئەو کەسە کێ بوو، کێ بوو مۆساد ویستبووی بۆ کارکردن و هاوکاری رایکێشێت، بابە تەکەی بەیەکجاری لەبیر خۆی دەباتەوە. تۆماس بەراستی کەوتە کارکردن، دەراسەتی کەسە نزیکەکانی خۆی دەکرد، یەکەمین کەس کە توانی دەستەمۆی بکات ئەفسەرەکەی تۆپخانەبوو، محمدی هاوڕێی بوو، پیاوە سەربازەکە بەئاسانی رۆڵە پیرۆزییەکەی خۆی لە پۆستی سەربازی لەبیرکرد، ئەودەمانە تەنها بیری لە خۆی دەکردەوە، ئەو بە دیارییەکان چاک هەڵخەڵەتابوو، لە مانگی ئوکتۆبەری ساڵی 1958 ویژدانی بە یەکجاری مردو هە ڵنەستایەوە، هەموو پیرۆزییە کانی رادەستی گیانبازییەک کردو کەوتە داوی خیانەتێکی شەرمەزارانە.

بیلتریشیا ژنە سەماکەرێکی ئەڵمانی بوو، ئەو لە قاهیرە دەژیا، ئەو یەکەم کەس بوو هەنگاوی بەرەو مردن بردو کەوتە ناو تۆڕەکە، پێش ژنهێنانی تۆماس ئەو کۆنە دۆستی ئەو بوو، بەڵام کە (کیتی) ببوە هاوسەری سەماکەرەکەی لەبیرنەمابوو، خەریکی کارو کاسبی و ژنەکەی بوو، بەڵام بۆ خزمەتی ئەو کارە نوێیەی دەبووایە ئەو ژنە بدۆزێتەوە، ئەفسەرەکەی تۆپخانە بەو ژنە دەگیرا، چونکە ئەو کەسێکی مێبازبوو. سەماکەرەکە بە هاتنەوەی کۆنە دۆستەکەی دڵی خۆش بوو، بە ئاسانی بڕوای بەبیانوی دوورکەوتنەوەی کرد بوو، لەشەوێکی سیحراوییدا محمد حسن زوو بە و ژنە سەرسام بوو، زۆر خە یاڵ و سۆزی بۆ جولا، هە ستیکرد ژنەکە ئارەزووی هەیەو ئەویش زۆری حەزی لە رابواردنە، بەڵام مووچەکەی کەمەو زۆر بە زەحمەتی بەشی خەرجی ماڵەوەی دەکرد، دیارە سەماکەرە نازدارەکەش بۆ هەوسەکانی پارەی باشی دەوێت، بەو پارەیە دەتوانێت شەوان لە باخەڵی بخەوێت. ئەوان زۆرجار بەیەکەوە دانیشتن، زۆرتر تامی لە ژنەکە وەرگرت، بۆیە نەدەکرا دەستبەرداری ژنەکە بێت، بۆ رازیکردنی سە ماکەرەکە محمد حسن کەوتە بن قەرزێکی زۆر، بۆیە بەناچاری رووی لە تۆماس کرد بوو یارمەتی بدات و قەرزەکانی بۆ بداتە وەو دە ستی بگرێت، تا زۆرتر هە وس بکات. تۆماس تێگە یشت کابرای ئەفسەری تۆپخانە ناچارەو ئامادەیە بکەوێتە ناو تۆڕەکەو هەموو کارێکی بۆ بکات، ئەگەر پارەی

بداتێ و قەرزەکانی لە کۆڵ بکاتەوە، بۆیە مووچەی مانگانەی 50 پاوندی بۆ بڕیوەتەوەو لەدڵی خۆیدا وتوویەتی، با بە ئیسراحەتی خۆی پارەکە لە شەوەکانی سەرف بکات و بەرامبەر ئەوەش زانیاری زۆرمان لەسەر خوێندگای تۆپخانەکەی بۆ ئامادەبکات، زانیاری بۆمان بنووسێت، وەک چەند خوێندکار لە و شوێنە سازو ئامادە دەکرێن، مامۆستاکانیان کێن، پلانی ستراتیژییان بۆ مەشقەکان چییە...؟! تۆماس کە لەو کارە سەرکەوت بەرنامەی تری بۆ هێنانی کە سانی تر دارشت.

یەکەم کەس کەوتە ناو تۆڕەکە وێنەگرێکی شارەزای ئەرمنی بوو، (جریس تانیلیان) ئەویش وەک محمد حسن بە ژنێکی سۆزانی گیرا، ژنە کە پارەی زۆری دە ویست مەسرەفی زۆربوو، (کامیلیا بازیان فارتمی) زیرەک بوو لە دەستەمۆکردنی ئەو پیاوە، هەموو پارەکانی پێ سەرەفکرد، ئەویش بەناچاری پارەی لە تۆماس قەرزکرد، کە تۆماس کارەکانی گەشەی کرد، بۆ راپەراندنی کارەکانی شوقەیەکی لە ناوچەی روکسی بەناوی محمد حسن بە کرێ دەگرێت، لەوێ ئاهە نگێک سازدەکات و خە ڵکێکی زۆریش داوە ت دەکات، لە وێ جۆرە ها زانیاری دەستدەکەوت، ئەو ژوورێکی شوقەکەی کرد بووە تاقیگەی شووشتنەوەی فیلمی فۆتۆگرافی و سازکردنی نەخشەکان، محمد حسن لە خوێندگاکەی خۆی جۆرەها نەخشەی بۆ دەهێناو پاش کۆپیکردنیان دەیگەڕاندەوە کۆگاکەی خۆی.

تۆماس بە ژنەکەی وتبوو، کە وا ئە و بۆ بە رژەوندی ئیسرائیل کا ردەکات، بۆیە ش بڕیاردەدا لە زۆر سەفەرەکانیدا هاوشانی بێت، بۆ وێنە گرتنی پێگە سەربازییەکان سەفەری سویس دەکات، لەوێشەوە بۆ پۆرسعید، ئەو محمد سعید رازی دە کات لەگەڵ ژنەکەی لەگەڵیاندا بێت، کە وێنەکان دەگرن، ئەو پێگە سەربازییەکانیان بۆ پێناسە بکات، ژنەکەی تۆماس ئوتومبێلەکەی لێدەخوڕی و ئەویش لە پەنجەرەکەوە وێنەی دەگرت و ئەفسەرەکەی تۆپخانەش شوێنەکانی بەوردی بۆ پێناسە دەکرد.

****

تۆڕەکە فراوانتر دەبێت

تۆماس برادە رێکی بازرگانی جلوبە رگی بە ناوی (جۆرج شفیق دهاقیان ) دەبێت، رۆژێکیان دەچێتە لای تۆماس، داوای لێدەکات یارمەتی بدات، پێیدەڵێت:

(لە بازاردا زیانی زۆری لێکەوتووەو باری ئابووری زۆر خراپ بووە).

کە ئەو داوای پارە ی لێدە کات. ئەویش بە مەرجی هاوکاری کردنی تۆڕە جاسووسییەکەو مۆساد ئامادەیی نیشاندەدات، زوو جۆرج رازی دە بێت، چونکە دەیزانی ئەو زانیاری ترسناکی لەلا نییە، ئەوەی ئەو دەیزانی زۆر گرینگ نییە، پارەکەی لە تۆماس بە رەهن

و پسولە وەردەگرێت، تۆماسیش دەیزانی ئەو پیاوە لەوددمانە زانیاری وا شیاوی لەلانییە، بەڵام تەماشای دوارۆژ دەکات، بۆ کارەکانی ئایندەی کاری بەو دەبێت، ئەو هێنانی جۆرجی بۆ ئەو ئەفسەرە گەورەیە بوو، کە لەسەر شوقەکەی ئەوان دەژیاو لەگەڵ ماڵی جۆرج زۆر دۆست و هاورێ بوون، بۆیەش لە ئایندە ئەو رۆلی زۆری بینی.

تۆماس برادەرێکی ئەرمنی زێرینگری هەبوو، ناوی (بولیدور باب زوغلو) خەونی بە کرینی فرۆشگایەکی گەورەی زێرو خشل لە سەنتەری قاهیرە دەبینی، کە تۆماس زانیبووی هاورێیەکەی خەونی لەو جۆرەی هەیە، ئامادەیی نیشاندەدات یارمەتی بدات و دەستی بگرێت، ئەگەرچی کابرا پارەیەکی زۆری دەویست، بەلام بە کرێگرتنی ئەو پیاوە بۆ تۆرە کە زۆر کاریگەردەبێت. بەو شێوەیە تۆماس کەوتە راوکردنی کەسانی نەفسنزم و قەرزدار، پارەی زۆری دەدانێ، هەمووڵایەک کەوتنە کۆکردنەوەی زانیاری زۆرترو دەمیان ئەوەندە چەورکرابوو ترسی گیران و سێدارەیان نەبوو، مۆسادیش بەدڵنیاییەوە بە جاسووسەکانی ناو میسری وتبوو کە وا لە موخابەراتی میسری ترستان نەبێت، ئەوان هەرگیز دەسەڵاتی ئەوەیان نابێت ئێوە بدۆزنەوە، ئێوە تۆرەکەتان لە بەرنامەو کارنامەی ئەوان بەهێزترو کارامەترە.

****

### لەناو کۆشکی کۆماریدا

لەرێگای گەرانەوەی لە ئەڵمانیا تۆماس وێنەی کەسێکی وەک جۆرج ئەستماتیوی بەبیردا هات، ئەو فەرمانبەربوو لە فرۆشگاکانی جروبی لە قاهیرەو سەرپەرشتی خوانی ئێوارانی سەرۆکایەتی کۆماری دەکرد، بەو پیاوە دەتوانی بگاتە ناو کۆشکی کۆماری و لە وێ هەواڵ و زانیاری و نهێنی دەستدەکەوێت، ئەوەو لە دوارۆژ کاری زۆرترو باشتری لا پە یدادەبێت. لە ژوورێکی شوقەکەیان بە هاوکاری وێنەگرەکەو بیاتریشیا فیلمێکیان لە سەر ئەستماتیو گرت و لەسەریان کردە ماڵ، بۆیە بەناچاری و زوو تەسلیمیان بوو، بەهۆی ئەو چەندین نهێنی کۆشکی کۆمارییان دەکەوتە دەست، تۆماس بۆ وەرگرتنی باشترین زانیاری ئامادەبوو هەموو بەهاکان و پیرۆزییەکانی بە بەرامبەرەکانی ببەخشێت، زۆرجاریش کیتی دورثی ژنەکەشی دەنارده باوەشی کەسە نزیکەکانی، کە محمد حسن چەند بەڵگەنامەی گرینگی بۆ تۆماس پەیداکردبوو، داوای نووستنی کردبوو لەگەڵ ژنەکەی، دیارە ئەویش بۆ وەرگرتنی زانیارییەکان ئامادەبوو داواکەی جێبەجێ بکات.

****

## کۆتایی

لەسەر داواو پێشنیاری تۆماس بازرگانە زێرینگەرەکەی زۆر هاتوچوی ماڵی ئەفسەرە گەورەکەی هاوسێیەکەیانی دەکرد، ئەدیب حنا کیرلسی هەستی کردبوو، کۆنە هاوسێیەکەیان بە بۆنەو بێ بۆنە لەدەرگای دەدان و میوانی دە کردن، زۆریش پرسیاری هە ستیاری سەربازیشی دەکردو زۆریش سۆراخی وەڵامەکانی دەکرد، بۆیە ئەفسەرەکە لە بازرگانەکەی هاوسێی کەوتە گومان و پرسیاریکرد سۆراخکردنی ئە و زانیاریانە بەخۆرایی نییەو ئەو بەردەوام بابەتی زۆر ناسک دەوروژێنێت، بۆیە ئاگاداری دەزگای موخابەراتی میسری کردەوە، بەوردی هەموو داوا و سۆراخەکانی هاوسێیەکەی پێراگەیاندن، موخابەراتیش چاودێری وردی خستە سەر دهاقیان و هاورێیەکانی، لە ئەنجامدا توانیان دەستەکە بدۆزێتەوەو توانیان چەند کەسێک بخزێنێتە ناو تۆڕەکە، لەئەنجامدا بۆیان روون بۆوە کەوا تۆڕەکە لە چەندین وڵاتدا ئەندام و بە کرێگیراویان هەیە، لە وڵاتانی سویسراو فەرەنساو سویسراو هۆڵنداو ئیتالیاش کەسی باوەڕپێکراوو کارمەندیان هەیە، ئەو تۆڕانە بەیەکەوە لەگەڵ تۆڕەکانی ناو قاهیرەو ئەسکەندریەو دمشق کاردەکەن.

لەرۆژی 6 ی ینایری ساڵی 1961 لەناو میسر تە واوی ئە ندامانی تۆڕە کەیان دەستگیرکرد، بە بڕیاری کۆماری ژمارە 71 ی ساڵی 1961 دادگایەکی ئەمنی دەوڵەتیان پێکهێنا، لەماوەی شەش مانگدا دادگاکە 83 دانیشتنی سازکرد، لەوماوەیەدا دادگا گوێی لە 95 شاهید راگرت، لەوانە کەسانی شارەزاو هونەرکارو پسپۆربوون، کەسە تاوانبارەکانیش ژمارەیان گەیشتە 11 کەس، لەوانە 6 کەسیان بێگانەبوون و 33 پارێزەریان هەبوو، دەستەیەکی زۆریش لە کەسانی شارە زا لە بەرژەوەندی ساختە کاری و شیکردنە وە لە تەندروستی شە رعی و شارەزایانی بواری بێتە ڵ و کاری ئە لکترۆنیات و چ ەند کە سانی تری شارە زا کە دادگا ئامادەبوونی ئەوانەی بە پێویست دەزانی، چەندین وەرگێری زمانانی بێگانەیان تێدابوو، ژمارەی لاپەرەی دۆسیەکە گەیشتە 6 هەزار لاپەرە، لە 25 ی ئوکتۆبەری ساڵی 1961 دادگا بڕیاریدا جان تۆماس لە سێدارە بدرێت و محمد حسنیش بە گوللە تیرباران بکرێت، ئەوانە تریش بە کاری قورسی هەتا هەتایی سزایان بۆ بڕایەوە.

---

لە رۆژنامەی (الجریدة)ی کویتی رۆژی 10 سپتەمبەری ساڵی 2008 بڵاوکراوەتەوە.

# عیزراو ژنەکەی لەناو بەغدا

عیزرا ناجی زلخا بە دژوارترین و زیرەکترین جاسوسی مۆسادی ناو بەغدا دەناسرا، ئەو یەکێک بوو لەوانەی مۆساد رایسپاردبوو کە فرۆکەوانێکی عێراقی رازی بکات فرۆکە یەکی مێک 21 ی سۆڤیەتی لە عێراق بفرێنێتە ناو ئیسرائیل، کە تازە وڵاتانی عێراق و میسرو سوریا لە سۆڤیەت وەریانگرتبوو، بەڵام کارەکە بەو نەکراو کەسانی تر ئەنجامیاندا.

عیزرا لە باکووری عێراق لە شاری موسڵ لەساڵی 1927 لەدایکبووە، لە بەرئەوەی تەنها ناوەندی تەواوکردبوو، بۆیە لە وەزارەتی بازرگانی وەک فەرمانبەرێکی ناو ئەرشیف کاریدەکرد، لە یەکێک لە پەرستگاکانی جوولەکە لەوێ خاتوونێکی مامۆستای جوولە کە بەناوی (ملاذ) دەناسێت، لە و رۆژە وە بەراستی خۆشیدە وێت بۆیە لە ساڵی 1952 پرۆسەی هاوسەرگیری بەیەکەوە دەکەن، ئەگەرچی ژیانیان خۆش و کامەران بوو، بەڵام نەخۆشی تیفۆ بواری نادات و پاش ساڵێک بە یەکەوەبوون ژنەکەی دەمرێت، بۆیە بەیادی ئەو و لەگەڵ یادگارەکانیدا بە سەڵتی دەژیت.

لەیەکێک لە جەژنەکانی جوولەکەدا بۆ بەسەرکردنەوەی گۆڕی ژنەکەی چەپکێ گوڵ لەگەڵ خۆیدا دەبات، لە سەرگۆڕەکەی دەستدەکات بە گریان، لە گەڵ بیرەوەرییەکانیدا زۆر دەگرێت، لە و گریانەدا هەستدەکات کابرایەک دەستی لە سەرشانی دادەنێت، کە سەر بەرزدەکاتەوە دەبینی پیاوێکی تەمەن 60 ساڵانەیە، ئەویش سەربردەی خۆی بۆ پیاوە سەرسپییەکە دەگێڕێتەوەو دڵی دەداتەوەو داوادەکات هێوربێتەوەو دوارۆژی باش بێت، ئەویش پێدەڵێت من ژنێکی زۆر نازدارو شۆخم هە بوو لە گەنجی و لە کاتی لە دایکبوونی کیژە تاقانەکەمان مرد، منیش لە گەڵ کیژە تاقانەکەم بەتەنها ماینەوەو ژیانی خۆم بۆ ئەو تەرخانکردووە.

پیاوە جوولەکە پیرەکە ناوی (بوشا)بوو، وەک بازرگانێکی دێوەرە گەڕاوەو لەناو گەڕەکە میللییەکانی بەغدا کاڵای بە قەرز بە ژنانی هەژار فرۆشتووە، بۆیە ش بازاری گەرم بووە، سەردانەکەی عیزرا بۆ بۆشا سەرەتای چیرۆکێکی پۆلیسی و جاسووسی بوو، ئە و بازرگانە پیرە لەمێژبوو دووچاری تۆڕێکی جاسووسی هاتبوو، ئەندامی یەکێک لە تۆڕەکانی مۆسادبوو کە بۆ بەرژەوەندی ئیسرائیل کاریکردووە، ئەو کاری ئەوەبوو زانیاری لەسەر جوولەکە هەژارەکانی ناو گەڕەکە میللییەکانی ناو بەغدا کۆبکاتەوە، لە ئاستی خوێندەوارییان بزانێت، سازیان بکات، پرسی کۆچی بەرەو ئیسرائیلیان لێ بکات، زۆر داماوەکانی سەر گۆڕەکانی ناو گۆڕستانەکانی بەسەردەکردەوەو بەو ئاراستەیە کاریکردووە، کیژە تاقانەکەشی هیچ زانیاری لەسەر ئەو کارەی باوکی نەبوو، باوکە کە مەبەستیشی نەبوو کیژەکەی بۆ کارە کە خۆی راپێچ بکات، عیزرا بەدڵنیاییەوە سەردانی هاوڕێیە نوێیەکی بۆشای کرد بوو، ئەویش زۆر بە گەرمی پێشوازی

لێکردبوو، لەو میواندارییەدا پێیوتبوو من زۆر سە رسامم بەو وەفاییەی تۆ بۆ ژنە مردووەکەت هەیە، لەو سەردانییدا کیژەکەشی ناسیوە، کە کیژێکی زێدەجوان بوو، کیژەکەی ناوی (روان)بوو، لەیەکەم دیمانە دا حە یرانی جوانیی کەی بوو، هە ستیکردبوو بەو نیگایە دووبارە ژیانی نوێ بویتەوە، هەناسەی هاتووچووەبەر، چونکە ئەو ماوەیەکی زۆربوو لەگەڵ مردووان دەژیا، دووربوو لە ژیان و هیوا.

لەیەکێک لەسەردانەکانیدا عیزرا داوای لە بوشاکردبوو کیژەکەی بداتێ، دیارە زۆری خۆشدەوێت، بەڵام پیرەمێردەکە پێکەنینی بەداواکەی ئەو هاتبوو، پێیوتبوو تۆ بۆ مارە ییەکەی چەند دینارت پێهە ڵدەستێت، عیزرای عاشقیش پێیوتبوو من دە توانم ئە و هە زار دینارە ی پاشکەوتم کردووە، هەمووی بکەمە مارەیی کیژەکەت، بۆ ئیشیش ئەوە لە دەزگایەکی حکومەت کارمەندم و خانووی خۆشم هەیە، بە مووچەکەمان دەتوانین کامەران و باش بژین، پیرەمێردەکە دووبارە بەو قسانە پێکەنینی هاتبوو، بەکابرای وتبوو، مارەیی کیژەکەم لە دە هەزار یەک دیناری کەم بێت من نایدە م. ئەویش تە نها ئە و پارە یەی هە بوو کە بەنیازبوو وە ک سولفە لەسەر مووچەکەی لە دائیرەکەی وەریگرێت، بۆیە عیزرا بەنائومێدی و دڵشکاویی گەڕاوەتەوە ماڵەکەی، چەند شەوو رۆژ بیری لەو کارە کردیتەوە. بەڵام ئەو نائومێدنابێت دووبارە دەستی کیژەکە داوا دەکاتەوەو بە باوکی دەڵێتەوە، من ئامادە م چە کی هە زار دیناری تریشت بۆ ئیمزابکە م، بەڵام باوکەکە دەڵێ من رازی دە بم چە کێکم بۆ ئیمزا بکە یت، بەڵام لە سەر هە زار دینار نە بێت، لەسەر هەشت هەزار دیناربێت، بەڵام من یەک مەرجیشم هەیە، کابرای عاشق زوو بە پیاوەکە دەڵێ، بڵێ مە رجەکەت چییە ؟ جوولە کە پیرەکە پێیدەڵێت، مەرجەکەم ئە وەیە کۆشش بکە جوولەکەکانی ناو بەغدا بەرەو ئیسرائیل کۆچ بکەن، ئەوانەی ئەو دەیانناسیت بەو کۆچە رازیان بکە، کەی هەستمکرد کارت بۆ ئەو مەسەلەیە کردووەو بەرهەمت جێگای دیارە، ئەوا من رۆژی ژنهێنانەکەت دیار یەکەم، عیر زای عاشق یە کسەرو بێ بـیرکردنەوە بەمەرجی باوکی دەستگیرانەکەی سەبارەت بە پارەکە رازی دەبێت، بۆ مە سەلەی هاندانی کۆچی جوولە کەش ئەوەی بە ئەرکی سەرشانی خۆی دەزانی و ئامادە ش بوو قوربانیشی بۆ بدات . ئەو بەسۆزەوە رۆژانە لە بەشە عەرەبیەکەی رادیۆیە کەی ئیسرائیل ئە وەی دە بیست کە وا هە موو جوولە کە حەقی ئەوەیان هەیە بگەڕێنەوە سەر خاکی میعادیان، شە وو رۆژ بانگهێشتی ئەوەیان دە کرد، بۆ ئەوەیان هیج زیانی لێناکە وێت و شۆخە کەی دەبێتە نەسیب و روان دە بێتە هاوسەری، ئەگەر تەنها مەرج ئیقناعکردنی جوولەکە بیت بەرەو ئیسرائیل کۆچ بکەن، ئەوە هەر ئاسانەو زەحمەت نییە، چونکە ئەو هەزارانەی ئەو رۆژانە دەیانبینێت زۆر بێزارن، ژیان و گوزە رانیان خراپەو لە خوایان دەوێت لەو تەنگژەو کۆڵەمەرگییە رزگاریان بێت.

لەو رۆژەی عیرزا ئەو ئەرکەی کەوتە سەرشان، پێشهاتێکی ناخۆش لە ناوچەکە روودا، لەسێ قۆڵەوە لەساڵی 1956 هێرشی کرایە سەر وڵاتی م یسر، لە و شە ڕەدا ئیسرائیل نیمچە دوورگەی سینای م یسری داگیرکرد، بە فشاری وڵایە تە یەکگرتووەکانی ئە مریکا سو پاکانی هێرشیان کردبووە سەر م‌یسر کشانە وە، بەڵام ئیسرائیل لە سینا هەر مایەوە، ئەوەش مانای

ئەوەبوو، وڵاتانی عەرەبی شەڕی دەکەن و لەو بەشە داگیرکراوەی خۆیان خۆش نابن، بەوەش شەڕی دژوار دەقەومێت، رەنگە ئیسرائیل دەرەقەتی ئەو هەموو وڵاتانە نەیەت، بۆیە ساردییەک و خاوبوونەوەیەک کەوتە ناو کۆچی جوولەکە عەرەبەکان، هزری سەفەریان لە مێشک و بەرنامەی خۆیان دەرهێنا، لەو ماوەیەداو لە نێوان هێرشەکەو کشانەوەی سوپاکان، عیزرا بە کۆششی خۆی توانیبووی 12 خێزانی جوولەکە رازی بکات بەرەو ئیسرائیل کۆچ بکەن، هەموویان بەناو خاکی ئێران گەیشتنە ناو ئیسرائیل، لەو کاروانەدا زۆر لە بەکرێگیراوانی کورد بۆ ئاودیوکردنیان بۆ ئێران رۆڵی سەرەکی و کاریگەریان هەبوو، خێزانەکان بە دۆڵ و شاخە سەختەکان لە سنوور پەڕینەوە، لەوێ لەسەر سنوورەکان ئەفسەرانی سوپای ئێرانی و مۆساد چاوەروانیان بوون. پاش کۆشش و کاری زۆر عیزرا دەستگیرانەکەی گواستەوە، بەخۆشی و بەکامەرانی ژیانیان بەڕێدەکرد، زۆری نەخایاند باوکی کیژەکە مرد، لەکاتی مەراسیمی ناشتنی مردووەکە، پیاوێک کە هەرگیز عیزرا نەیدیبوو بەچرپەیەک چەند وشەیەکی چرپاندبوو گوێی، بەڵام زوو لە بەرچاوان گووم ببوو، لە ماڵەوە زۆر بیری لە قسەکانی کابرایەکە دەکردەوەو بە قسەکان دڵتەنگ و نیگەران ببوو، کە روانی ژنی پرسیاری لە مێردەکەی کردبوو، بۆچی وا پەشێوکاوو خەمگینی، لە وەڵامدا پیاوەکە راشکاوانە بە ژنەکەی وتبوو، باوکت بەردەوام خەریکی ئاودیوکردنی جوولەکەبووە لە عێراقەوە بەرەو ئیسرائیل، منیش هاوکاری باوکت و بەرنامەکەی ئەوم کردووە. ژنەکەش دەستی لە ملی کردبوو، پێیوتبوو:

(کەواتە تۆ پاڵەوان بوویت، من بە چاوی سەرکەوتوو و نەبەرد ناوت دەبەم).

بە قسەی ژنەکەی پیاوەکە تووشی شۆک ببوو.

****

لە چایخانەیەکدا هەمان پیاوەکەی سەر گۆڕستانەکە 500 دینار دەداتە عیزراو پێیدەڵێت، پاش هەفتەیەکی تر لەهەمان شوێن و لەهەمان کاتدا دیمانەمان دەبێتەوە، ئەو کەسە جاسووسێکی مۆسادبوو، کاری ئەوەبوو ئەندامە نوێیەکانی تۆڕەکەیان مەشق پێبکات، ئەو هەمووی کۆدەکردنەوە، تۆڕەکانی لەیەکتری گرێدەدا، لەچەند شوێنی تری بەغدا دیمانەیان بوو، چەندین کۆرسی هونەرەکانی جاسووسیان بۆ کردەوە، بەو شێوەیە ئەویش بووە جاسووسێکی بڕواپێکراوی مۆساد. سەرەتا ئەو لە یارمەتیدانی کۆچی جوولەکە بەرەو ئیسرائیل کاریکردووە، لەماوەی دوو ساڵدا توانی 400 کەس لەناو بەغدا ئاودیو بکات، بە شێوەیەکی زۆر شەیتانانە کارەکانی ئەنجامدەدا، بۆیەش وەک جاسووسێکی لێزان و زیرەکترین جاسووس لە ناو بەغدا دەناسرا، لەودەمانەشدا ژنەکەی خەریکی لەبارچوونی سکەکەی بوو، لەبەرئەوەی زۆر پەرۆشی مناڵ بوو، بۆیە بەردەوام مێشکی سەرقاڵی ئەوەبوو، بەلام مێردەکەی لەبەر کارە ئاڵۆزەکانی

ئاگای لە خەمی ژنەکەی نەبوو، ژنەکەش بێجگە لەسەردانە بەردەوامی بۆ پزیشکەکان، هیوای بە قسەو داو و دەرمانی میللییەکانیش هەبوو، بەڵام هەموو کۆششەکانی سوودی نە بوو، بۆیە ژنەکە هەستیکردووە ژیانی لەناو عێراق تاریک و ناڵەبارە، بیری لەوە دەکردە لەگەڵ پیاوەکەی باس لە کۆچکردن بۆ ئیسرائیل بکاتەوە، هیوای وابوو لەوێ گرفتی سکەکەی بۆ چارەسەربکەن، سەرەتا پیاوەکە بیرۆکەکەی پەسند نەکردبوو، کە رازییش بوو، گەورەکانی لە مۆساد پێیانوتبوو جارێ چاوەروان بکە، خۆمان ئاگادارت دەکەینەوە. بەڵام ئاسان نەبوو مۆساد رازی بێت عیزرا لە بەغدا دە ربچێت، تازە لە کارەکەی باش شارە زابووە، کە سی وە ک ئە ویان بە دەست ناکەوێتەوە، دوورکەوتنەوەی هەر بەکرێگیراوێک چەندین لێکدانەوەی وردی دەوێت.

کە پلەیەکی سەربازیان لە سوپای ئیسرائیلی بەخشیووە مێردەکەی، روان خە می مانەوەو دەرنەچوونیان لە بەغدا کەم و سووک دەبێتەوە، بەو هەواڵە دڵخۆش و سەرفرازدەبێت، چونکە ئەو پلەیە مووچەیەکی باشی پێوەبوو، کە لەدوارۆژا گەیشتە ناو ئیسرائیل بەو مووچەیە باشترین ژیان دە ژین. عیزرا فێرکرا چۆن ئامێری بێتەڵ بەکاربهێنێت، چۆن نامە بنێرێت و وەرگرێت، کە لەو کارەی سەرکەوت ئامێری زۆر پێشکەوتوویان بۆ هیناوە، کە لە هەموو عێراق لەو کاتانە ئامێری گەیاندنی لەوجۆرە نەبوو.

عیزرا توانی لەنێوان بەغدا پەیوەندی بە گەورە لێپرسراوان پەیدابکات، ئەو راپۆرتانەی لەسەر ئابووری عێراق رە وانەی کردبوو، گە ورە بەرپرسەکانی مۆسادیشی سە رسام کردبوو، راپۆرتەکانی زۆر گرینگ و بە بایەخ بوون، هە موو راپۆرتە کانی لە جۆری (آ)بوون، هە موویان شایستەی بەخشیش و پاداشتی دارایی باش بوون، بەوەش گیرفانەکانی تەژی پارەبوون، پارەی ئەوەندە زۆربوو، بۆیە ژیانی زۆر خۆش بوو، بۆ رۆژانە ی ژیانی چاک بە رنامەرێژی کردبوو، لەودەمانەدا پێشنیاریکرد ژنە کەشی بێتە ئەو مە یدانەو لە کارەکانی بە شداری بکات، مۆساد پێویستی بە کارو هاوکاری ئە ویش دە بێت، بە وەش مە بەستی بوو، پارە ی باشترو زۆرتر لە سەرووی خۆیەوە وەرگرێت، یەکەم ئیشی ژنەکە لەو بوارەدا داوای لە و کردبوو، پیاوێکی گەورە لە وەزارەتی دەرەوە هەڵخەڵەتێنێت، ئەویش داواکەی قبوولکردبوو، ژنە کە زۆر بە ئاسانی فەرمانبەرێکی کریستیانی دەستنیشانکردبوو، پیاوەکە کەوتووە داوی خۆشەویستی ژنەکەو بڕوای پێکردبوو، لە رۆژانەی کارەکانیدا زۆر دڵشادو کامە ران بوو، کە ناوی ئیسرائیل و کۆچکردنیان لەلا دەهینا تووڕەدەبوو، تا پیاوەکە چاک تەسلیمی بێت، خۆی تەسلیمی پیاوەکە کردبوو، ئەویش بەجوانیەکەی و هە وەسە سێکسییەکانی شێت و هاری کردبوو، بۆیە پێیوتبوو، ئەگەر بچیتە وە ئیسرائیلیش من لە گەڵتا دێم، بۆیە ش هە موو داوای ژنە کەی قبوول دە کرد، لە ئەرشیفی وەزارەتەکە بەڵگە نهێنییەکانی بۆ دەردەهیناو رادەستی دەکرد، کە تەسلیمیشی دەکرد، بەگاڵتەوە دەیووت:

(فەرموو هەموو پارچە کاغەزە بێسوودانەت پێشکەش بێت).

ئەو نەیدەزانی بەو کارانە کەوتووتە ناو چلکاوی خیانەت و لە دوارۆژا دەربازبوونی نابێت. لەو رۆژانە عیزرا بە چاوی شەریک سەیری ژنەکەی دەکرد، لەبیری نەمابوو کەوا روان هاوسەریەتی، بۆیە رۆژێکیان داوای لێکردبوو ئەفسەرێکی فڕۆکەوانی بە پلەی ئەفسەری دوو نەجمە لە فڕۆکەخانەی بەغدای بۆ راو بکات . لەبەرامبەر ماڵەکەیان ئەفسەرێک بە جلی سەربازی و بە ئوتومبێلی حکومەت هاتوچۆی دەکرد، هەستیکرد راوکردنی ئاسانە و لە بن دەستانە، بۆیە بەئاسانی ئەفسەرەکە کەوتە داوی و شەیدای ژنەکەبوو، زۆری نەخایاند ئەفسەرەکە چەندین نهێنی سەربازی و باری سەربازی سۆڤیەتی و شیکی دەگەیاندە ژنەکە، چەندین نهێنی ناو فڕۆکەخانەکەی بۆ دەهێنا، رۆژانەی فڕینی فڕۆکەکانی سەرۆکایەتی لەبەردەستی دادەنا، بە هەوسە جنسییەکانی ئەفسەرەکە زۆر نهێنی سەربازی دەدایە ژنەکە، بەو کارانە روان پلەی ئەفسەری دوو نەجمەی لە سوپای بەرگری ئیسرائیلی وەرگرت. بۆ پاراستنی نهێنییەکان و دوورکەوتنەوە لە ئاشکرابوون عیزرا لە گەڕەکی الکاظمیة خانوویکی یەک نهۆمی کڕیبوو، خانووەکە حەوشەیەکی گەورەی هەبوو، حەوشەکە هەمووی داری گەورەو گیاو دڕک و داڵ بوو، دەرگایەکی پشتەوەی هەبوو دەیڕوانییە چۆڵەوانییەکی چڕی بەپووش و پەڵاش، لەو چۆڵەوانییەوە پێش ئەوەی لە ماڵەوە دەربچێت بە تەلەسکۆبێک چواردەورەی ناوچەکە دەپشکنی، بەهاتنی ئەندامێکی تۆڕەکەیان بەئاسانی ناوچەکەی دەپشکنی، ماڵەکەی کرابووە مۆڵگەی مەشق و ناسین دیمانەی زۆریان و ببووە ژوورێک بۆ عەملیات و چالاکییەکان، روان لەماوەی سێ ساڵی کارکردن لە مۆساد توانیبووی 13 فەرمانبەری پلە بەرزی شوێنی بایەخدار پەیدابکات، لەوانە چواریان ئەفسەری هەمەجۆری ناو سوپابوون، یەکێکیان ئەفسەربوو لە ئەمنی فڕۆکەخانە، بەوانە بەردەوام نهێنی عێراق دەگەیشتە ناو ئیسرائیل.

****

کوشتنی ئەفسەرێکی دکتۆر:

روان داوێکی بۆ دکتۆرێکی سەربازی بە پلەی نەقیب داناوەتەوە، ئەویش وەک ئەوانی پێش خۆی ، لەبەر نازو سیحری جنسییەکەی خۆی نەگرتووە، زووتەسلیم بووە، کە ژنەکە راستیەکی پێوتووە دکتۆرەکە بڕوای نەکردووە، کەوا ئەو کەوتووتە باوەشی مۆسادەوە، بۆیە نەقیبی پزیشک (حسين علي عبدالله) بڕوا ناکات و جلەکانی دەپێچێتەوەو هاوار دەکاتە سەری و هەڕەشەی ئەوەی لێ دەکات کە چارەنووسێکی تاریکی بۆ بکێشێت، ژنەکەش بە فیلمەکانی هەڕەشەی لێدەکات، بەڵام دکتۆرەکە بێ شەرمانە دەڵێت:

(ئەوانە بۆ منی پیاو شوورەیی نییە).

ژنەکە ئازایانە پێیدەڵێت:

(من باسی لایەنە سیاسیی و سەربازییەکانت دەکەم.!).

بەڵام ئەو تف لە دەموچاوی دەکات و دەڵێت:

(من تۆ بەگرتن دەدەم، پاشان خەڵاتیش دەکرێم، پلەشم بەرزدەکرێتەوە).

بۆیە ئەفسەرەکە هێرش دەکاتە سەری و دەیەوێت ژنەکە قۆلبەست بکات و لەگەڵ خۆییدا راپێچیشی بکات. بەڵام عیزرای مێردی دە سێت بە دەمانچە لەسەر سەری دەوەستێت. دکتۆرە ئەفسەرەکە لێرە بەهەلە جوولایەوە، دەبووایە لەلای ژنەکە هیچی نەدرکاندبووایە بە قسەی خۆش لە بن دەستی دەرچووبوایە، بەڵام ئەو هەستیکردبوو خۆیان بە تەنهان و کەسیان لەلا نییە، بۆیە مێردەکەی بە گوللەیەک کەللە سەری ئەفسەرە دکتۆرەکە بە دیواری ژوورەکەیان وە دەنووسێت. لەوشەوەدا ژن و مێردە کە گۆڕێک لە باخچەی پشتە وەیان هەڵدەکۆڵن، تەرمەکە شۆردەکەنەوەو خۆڵیشی بە سەردا دەکەنەوە، ئەو شەوە روان ناوێرێت لەباوەشی مێردە بکوژەکەی بخەوێت، ئەو شەوە لە دووری چەند هەنگاوێک دوور لە مردوویێک دەخەوێت. روان بە کوشتنی ئەفسەرەکە زۆر نارەحەت دەبێت، بەڵام مێردەکەی بەو کارەی شانازی دەکات و هەست بە لەخۆباییبوونی زۆریش دە کات. نۆ ساڵ ئەو پیاوە جاسووسێکی کارامەو ئەندامانی تۆرەکەی لەناو هەموو بەشەکانی عێراقدا چالاکیان هەبوو، لەناو هەموو دەزگا گەورەو هەستیارەکان کە سی زیندووی چاندبوو، بە ردەوام زانیاری زیندوو و کاریگەری دەگەیاندە ئیسرائیلییەکان.

****

فڕۆکەی مێک 21

ئەو لە رادیۆوە نامەیەکی بۆ هات کە وا بەهەر شێوەیەک بێت کار بۆ ئەوە بکەن، ئەفسەرێکی فڕۆکەوانی عێراقی پەیدابکەن، کە وا فڕۆکەیەکی مێک 21ی سۆڤیەتیان لە عێراقەوە بۆ بفڕێنێتە ئیسرائیل، بۆیە عیزرا لە ئەفسەرێکی فڕۆکەوانی خائین دەگەڕا، لەناو تۆرەکەیدا ئەفسەری زۆری هەبوو، لەناو ئەوانەدا دەستی بە پشکنینکرد، بە رێکەوت نقیبی فڕۆکەوان (شاکر محمود یوسف)ی ناسی، ئەو ئەفسەرە لە سەربازگاکانی مۆسکۆو لە لەندەن مەشق و راهێنانی کردبوو، ئەو مەشقانەی بۆ زۆرترین زانیاری بوو لە فڕین بەو مێکانە، ئەوەی بەراستی ئیسرائیلییەکانی ترساندبوو. لە ئاهەنگێکی خێزانیدا عیزراو روان رووبەڕووی ئەو فڕۆکەوانە بوونەوە، هەرچەندی ژنەکەی خۆی سازولووسدا بەڵام سوودی نەبوو، ئەو شەوە فڕۆکەوانەکە لەو نەهاتە پێش، روان بەنائومیدی و بێ دەستکەوت لە ئاهەنگەکە هاتەدەر، عیزرا

هەستیکرد چیتر کەسیان پێ دەستەمۆناکرێت، هەستی بە لاوازی و سستیکرد، بەلام ئەوەیان زۆری نەخایاند ئەفسەرەکە ئەو شەوە ژنەکەی خۆی لەگەڵ بووە، بۆیە نەیویستهو لە روان نزیک بێتەوەو بایەخی بەنازو چاوچاوانێیەکە نەدابوو، بەلام ئێوارەیەکیان ژنەکە لەگەڵ شاکری ئەفسەر دەست لەناودەست گەڕاتەوە ماڵەوەیان، پێناوەکەیان کاری بۆ ئەوە کردبوو کەوا شاکر لە ترسی ژنەکەی نەوێراوە لەو ژنە نازدارە نزیک بێتەوە، ئەگەرنا ئامادەیە، بۆیە پەیوەندی کردبوو، بەپێی خۆی هاتبووە ناو بازنەکە. روان خەریکی سازکردنی پەیوەندییەکەبوو شاکر بۆ مەشق و راهێنان سەفەری ئەمریکای کردبوو، لەوێ لە خولێکی سەرکردایەتی تەشکیلی لە تکساس بەشداربببوو، موخابەراتی مەرکزی چاودێرییان کردووە، بۆیە لە ولاتی نەمساوە ژنێکیان بۆی راسپاردبوو، ئەو ژنە لە نەخۆشخانەیەکی ئەمریکی لە ڤیینا کاریکردووە، (کرۆثر هلکر) زۆر بەپەلە سەفەری کردووەو خۆی گەیاندووتە ئەو ئەفسەرە فڕۆکەوانە عێراقییە، بەناوی چاودێر لە یانەی فڕۆکەوانە خۆرهەلاتیەکان لە بنکەی مەشقی ئاسمانی لە تکساس کاری بۆ دەدۆزنەوە، لەوێ کابرا لەبەر جوانی و شۆخی ژنە کە خۆی پێراناگیرێت، بە یەکەم نیگا دەوکەوێتە داوی، ئەو ژنەکەی بۆ کات بە سەربردن و رابواردنی شەوانەی دەویست، ژنەکە بەرنامەکەی وابوو شووی پێبکات، خۆی بکاتە ژنی چونکە بەوەیان بەرنامەکە باش سازدەبێت، بەلام شاکر وتبووی من ژنم هەیەو ژنەکەی خۆم زۆر خۆشدەویت، ئەو زۆری کۆشش لەگەڵ کردبوو، بەلام کابرا بەوەیان رازی نەبوو، دیارە مۆسادو دەزگای موخابەراتی ئەمریکی ئەوەیان نەدەزانی کەوا ئەفسەرانی عەرەب بۆیان نییە ژنی بێگانە بهێنن، ئەوەیان لێ قەدەغەکراوە.

پاش تەواوبوونی خولەکە، ئەفسەرەکە دەگەڕێتەوە عێراق، ژنەکە لەدوای ئەو دێتە بەغدا لەوێ لە هوتێلی بەغدای نێونەتەوەیی دادەبەزێت، لە هوتێلەوە پەیوەندی پێوە دەکات، ئەویش لەسەر رووباری دجلە شوقەیەکی بۆ بە کرێ دەگرێت، بەدزیش سەردانی کیژەکەی کردووەو بەیەکەوە خۆشیان رابواردووە، زۆریش کۆششدە کات ژنەکە رەوانەی ولاتەکەی بکاتەوەو پێیدەڵێت ئەگەر لەبەر من هاتووی، ئەوە من ژن و منالێکم هەیە، هەرگیز ئامادەش نیم ژیانی خۆی تاڵ بکەم، بەلام ئەو دەڵێ، من لە رێکخراوی ئاشتی کاردەکەم، بۆیە هاتوومەتە عێراق. ئەفسەرەکە زۆر هەولی لەگەڵ دەدات، دیارە کەوا قسەکانی ئەو سوودی نابێت، ژنەکە هەر باسی رێکخراوی ئاشتی جیهانی بۆ دەکات، ئەو رێکخراوەی کار بۆ ئاشتی لە جیهان دەکات، بەلام ئەفسەرەکە بەو قسانە توورەدەبێت و هاوار دەکاتە سەری، کەوا دەبێ بەزووترین کات بگەڕێتەوە ئەمریکا، ئەگەرنا لە دەزگاکانی موخابەراتی شکایەتی لێدەکات و بە جاسووس ناوی دەبات، بەوەش دوارۆژی ترسناک دەبێت، بۆیە ژنەکە بیر لە کوشتنی دەکاتەوە، ئەگەر ئەوە نەکات ئەوە کارەکەی ئاشکرادەبێت و بەرنامەکەی ئیسرائیلییەکان و ئەمریکا بۆ دۆزینەوەی بەکرێگیراوێکی فڕۆکەوانی عێراقی ئاشکرادەبێت، کە بەرنامەیان هەیە فڕۆکەوانیکی عێراقی رۆژێ لە رۆژان فڕۆکەیەکی مێکی 21 یان بۆ بفڕێنێت، ئەگەر ئەوەشیان لێ ئاشکرابوو، ئەوە حکومەتی عێراقی چیتر فڕۆکەوانەکانی بۆ مەشق و راهێنان رەوانەی دەرەوە ناکەن.

لە بەرپرسەکانەوە فەرمان بە عیزرا دەکرێ کەو ئەفسەرە بکوژن، ئەویش لە گەڵ کرۆثر بەرنامەریژی بۆ دەکەن. لەدوا سەردانەکەی بۆ شوقەی ژنەکە، ئەفسەرەکە وەک هەموو جارەکانی تری ئوتومبێلەکەی لەترسی هەر ئەگەرێک لە دووری دوو سێ کۆڵان رادە گرێت و بۆ چەند ساتێکی خۆشی دەچێتە لای دۆستەکەی، لەو ژووانەدا دەکەونە دەمەتەقێ گەرم، ژنەکە هەڕەشەی فیلمە رووتەکانی رۆژانی ئەمریکای لێدەکات، بەلام ئەو لەوانە ترسی نابێت، زۆر بێمنەت دەبێت، لەکۆتایی ژنەکە پێیدەڵێت:

(من لەبەرامبەر فرۆکەیەکی مێک 21 یەک ملیۆن دۆلارت دەدەمێ).

ئەفسەرە هەوسبازەکەش بە شەقە زللەیەک هەموو دەمی پڕ خوێن دەکات، لە ژوورەکەش دەچێتە دەرەوە تا لە دەزگا پەیوەندارەکان شکایەتی لێبکات، بەلام عیزرا بە دەمانچەیەکی بێدەنگ چارەسەری دەکات، بۆیە ئەو بە دەمانچەکەشی راناگات، لە رۆژی 6ی یولیۆی ساڵی 1965 کۆتایی بە ژیانی دەهێنن و پاش هەفتەیەک تەرمی ئەفسەرەکە دۆزرایەوە، لەودەمانە عیزرا هەستی بەترس و نیگەرانی دەکرد، چونکە پاش چەند رۆژێکی کەم لە رۆژنامە عێراقیەکان هەواڵی کوشتنی کروثر هلکری ئەمریکی لە یەکێک لە هوتێلەکانی لەندەن بلاوکرایەوە، لەوەیان ئەو زۆر ترسا بوو، چونکە کوشتنەکەی لە رووداوێکی نادیاربووە و دوو رۆژیش بوو ژنەکە لە بەغدا دەرچووبوو، کارمەندێکی ئاسایش وتبووی:

(جەستەی ژنەکەیان بە 30 لێدانی چەقۆ، کە دەکاتە ژمارەی ساڵەکانی تەمەنی شەق کردبوو).

بەو شێوەیە تەرمەکەیان دۆزیوەتەوە، بەو جۆرە دەزگای موخابەراتی ئەمریکی ئەو ژنەیان لەکۆڵ خۆیان کردیتەوە، بەوەش تەونی تاوان و پلانەکەیان بۆ هەتاهەتایی بزرکرد.

عیزرا کە ئەو هەواڵەی بیست ترسی گەیشتێ دەیزانی رۆژی ئەویش دێت، مۆساد ئەویش لەناودەبات، بە لەناوچوونەکەی زۆر نهێنی و رووداوەکان دەشاردرێتەوە، بە کوشتنی ئەو شانەکانی مۆسادی ناو شاری بەغدایان نادۆزرێتەوە، بۆیە جیهازە لاسلکییەکەی ماڵەوەی لەکاردەخات و دەنگی نەمێنێت، لەگەڵ ژنەکەی لە شوقەیەکی لاچەپ خۆیان دەشارنەوەو زۆر دەگمەن و ئەگەر بۆ کارێکی زۆر پێویست نەبوایە لە شوقەکەیان نەدەهاتنە دەرەوە.

لە رۆژانی ئاهەنگەکانی سەرە ساڵی 1966 تۆڕێکی جاسووسی نۆ کەسی لەلایەن کاربەدەستانی عێراقی ئاشکرابوو، ناوی عیزراو ژنەکەشی لە ناو ناوەکاندا بوو، بە شوێن هەردووکیان دەگەڕان، سەرەتا روان بە پێی خۆی چووە بەردەستیان، ئەویان گرت، لە مێردەکەیان پرسیبوو، ئەو لە وەلامدا بە موخابەراتی وتبوو:

**(پەلە مەکەن، ئەویش دەگاتە ناو دەستتان.!).**

**روان پێش ئەوەی هیچ ئازارو ئەشکەنجەی بدەن، لەخۆڕا دانی بەوەدا نابوو کەوا ئەو جاسووسی بۆ ئیسرائیل کردووە، باسی سوپایە جاسووسەکانی ناو عێراقی بۆ کردبوون، پێیوتبوون، ئێمە ئەوانەمان هەموو بە کارهێناوە، ئێمە ئەفسەرێکمان لە ماڵەکەی خۆمان کوشتووەو و گۆڕەکەشی لە باخچەکەی ماڵەکەیان نیشان دابوون، لە ماڵەکەیان ژوورە نهێنیەکەی پێ نیشان دابوون، لاسلکییەکەی نیشاندابوون، کامیرا نهێنییەکانی بۆ دەرهێنابوون، فیلمەکان، بەڵگەنامەکان. لەو رۆژەوە لە دوورەوە ئەفسەرانی موخابەراتی عێراقی سۆراخی ماڵەکەو ناوچەکەیان دەکرد تا پیاوەکەش بگرن، چاوە روانی مارە گەورەکەبوون، رۆژێکیان کە عیزرا گەڕاوەتەوە ماڵەکەی، لەیەکەم شەقاوی ناو ماڵەکەی گیرابوو، مارە گەورەکەش گیرا. لەدرێژەی لێکۆڵینەوەکاندا دانی بەوە دانابوو، کەوا ئەو ماوەی 10 ساڵ کاری بۆ مۆسادکردووە ، بە قسەکانی ئەو زۆر کەسی تریش گیران، زۆر شانەی نوێی مۆساد لەناو عێراق دۆزرانەوە، دادگاش بڕیاری ئیعدامی بۆ دەرکردو لەگەڵ ژنەکەی و لەگەڵ نۆ کەسی تر لە سێدارەدران، 5 کەسی پلەداری سەربازیش لەو تۆڕە گوللەبارانکران.**

---

**لەرۆژی 19092008 لەرۆژنامەی (الجريدة)ی کویتی بڵاوکراوەتەوە.**

# ئەو جاسووسەی لەناو کۆشکی کۆماری میسری مەساجی بە سەرۆک کردووە

جاسووسەکەی ئەو بەشەمان لە قاوەخانەو یانەکاندا گوێی لە هەواڵەکان نەگرتووە، تا بیکاتە راپۆرتێک و رەوانەی لای گەورەکانی خۆی بکات، ئە و جاسووسە لەسەر سەنگەرەکانی نەگەڕاوە بۆ زانینی پێگە و شوێنە سەربازییەکان، لە پەناکانەوە چاوی نەبڕیووەتە دامەزراوە سەربازییەکان و دامەزراوە ئابوورییەکان، ئەو گەیشتووتە پێگە دیارەکانی دەسەڵاتی دەوڵەت، ئەو زیرەکانە گەیشتووتە کۆشکی کۆماری، سەرچاوەی هەواڵ و زانیارییەکانی ئەو لە خودی سەرۆک کۆمارەوەبوو، ئەویش جاسووسە بەناوبانگەکە (علي العطفي)بوو، کە پشتی سەرۆک (إنور السادات )ی دەشێلاو ماوەی 7 ساڵ لە ناو کۆشکی کۆماری بۆ بە رژەوەندی مۆساد کاریکردووە، ئە و ماوە درێژە کاریکردووەو ئاشکرا نە بووەو چەندین بە سەرهاتی سەیرو سەرسوڕهێنەریشی هەبووە.

لەسەرەتای هەشتاکانی سەدەی رابردوو کتێبێک بە ناوی (علي العطفي ) لە میسر بڵاوکراوەتەوە، بەو کتێبە یەکەمجار ناوی ئەو پیاوە لە میسر زانراوەو ناسراوە، بۆیەش ناوی ئەو لەناو میسر دەنگۆیەکی گەورەی بڵاوکردەوە، لە کتێبەکەدا ئاماژە بەوە دراوە کەوا ئەو پیاوە جەمال عبدالناسری کووشتووە ، گوایە ئەو کە پشتی سەرۆکی شێلاوە کرێمێکی ژەهراوی کوشندەی بە کارهێناوەو سەرۆکی کووشتووە ، کرێمەکەی هێدی هێدی لە ناو پیستی ئە و دابەزیووەتە خوارەوەو کاریگەری کردووە، ئەوەش مانای ئەوەیە ئەو پیاوە لەلایەن موخابەراتی ئیسرائیلییەوە ئەو کارەی پێسپێردراوە و ئە و گەیشتووەتە سەر سیسەمەکەی ئەو سەرۆکی پێشووتری میسری جەمالی کووشتووە، ئەوەش ئاژاوەیەکی زۆری لە ناو میسر پەیداکرد، کە پێشەوای چینی (شواین لای) سەردانی میسری کردووە، لەو کاتەدا ئەو وتوویەتی:

(ئێوە سەرۆکێکی نەبەردو قارەمانتان هەبوو، بەڵام قەدرتان نەزانی و تا کوژرا).

ئەو لەپێش سەرۆکی وەفدە مسیرییەکە (حسین الشافعي) جێگری سەرۆک کۆماری میسری ئەو قسەیەی کردبوو، بۆیە ئەو لەبیرەوەرییەکانیدا کە پێش 20 ساڵ بڵاویکردووتەوە نووسیویەتی:

سەرۆکی چینی (لای) بە وەفدەکەی ئێمەی وتبوو:
(ئێوە پیاوێکتان هەبوو، بۆ ئێوە سامانێکی مەزن بوو، بەڵام قەدرتان نەزانی).

وەفدەکە بەو قسەیە لە سەرۆکە چینیەکە تێگەیشتبوون، کەوا ئەو مەبەستی ئەوەبوو، کەوا ئە وان لە کاتی خۆی چارە سەرکردنی نە خۆشیەکەی سە رۆک جە مالتان دابووە دەست سۆڤیەتییەکان، کە ماوەیەک لە کلینکێکی سۆڤیەتی لەساڵی 1966 چارەسەردەکرا، دەبێ ئەو دەمانە سۆڤیەتییەکان ژەهرخواردیان کردبێت، لە مەرهەمەکانی ژەهریان بۆی بە کارهێنابێت. کە ئەو کتێبە دەرچوو میسرییە کان ئە و کاتە ئەوەیان بە بیرداهات، رە نگە کاتی خۆی سەرۆکەکەیان کوژرابێت، بە ڵام بە دەستی مۆسا دو لە رێی (علي العطفي) بەکرێگیراوەکەیان نەک بە دەستی سۆڤیە تییەکان، ئەوەشیان بە بیرهاتەوە کە پاش مردنە کەی سەرۆک، نەزار قەبانی شاعیر قەسیدەیەکی بەو بۆنەیەوە دانابوو، کە تێدا وتبووی:

(دوا پێغمبەرشمان کووشت
ئێمە تۆشمان کووشت، ئەوە لە ئێمە دەوەشێتەوە،
ئەو کارە بۆ ئێمە نامۆ نییە.
ئەسەحابەکانمان کووشت،
چەند پێغمبەرمان کووشتووە.
ئێمە چەند ئیمامامان لەکاتی نوێژی عیشا سەربڕییووە).

لەودەمانە هەندێک قسەکەیان بڕوا دە کردو زۆریش بڕوایان نە دەکرد، تا ئە و کاتەی (سامي شرف) بەرپرسی نووسینگەی جەمال عبدالناسرو وەزیری کاروباری سە رۆکایەتی کۆمار لە رۆژنامەی الوفدی ژمارە 1085ی رۆژی 9ی دیسمبە ری ساڵی 2004 بە وەڵامێک مەسەلەکەی بڕاندووتەوە کە وتبووی:

(علي العطفي بە کرێگیراوی مۆساد بە هیچ جۆرێ نە لەدوورو نە لەنزیکەوە دەستی نەگەیشتووتە سەرۆک جە مال عبدالناسر، تە حدای هە موولایەکی دە کەم کە وا ئە و بە شێوەی راستەوخۆو ناراستەوخۆ لەو نزیک نەبووەو ناوی لە تۆماری سەردانەکانی کۆماری نەبووە).

کە کتێبەکەی العطفي کە لەزیندانەوە دەریکردبوو، چە ند نووسە ر وەڵامیان دایە وەو قسەکانیان بە درۆو بابەتی هەڵبەستراوو نووسەرێکی نەناسراو ناوبرد، لە وەڵامەکانیشدا وترابوو، گوایە ئەو کابرایە پاش مردنی سەرۆک جەمال لەلایەن ئیسرائیلەوە بەکرێگیراوە، نەک لەکاتی حکومڕانی ئەودا، لە دۆسیەکەی ئەودا لە ژمارە 4 ی ساڵی 1979ی پێوەیە بەهیچ شێوەیەک ناوی جە مال عبدالناسری تێدا نە هاتووە. کە علي جاسووس لە کاتی خۆیدا گیراوە بە فەرمانی سەرۆک السادات دادگاییکردنە کەی زۆر بە نهێنی کراوە، بوار نە دراوە دەزگاکانی راگە یاندنی میسری یەک دیمەنی دادگاییەکەش ببینن، بۆیە ئەو جۆرە پروپاگەندانە بڵاوبووینەوەو زەمینەی

بۆ رە خسا تا لە ناو خە ڵکەکە جۆرەها قسە و پروپاگە ندە دەربچێت، نە دەکرا بواربدرێت میسرییەکان بزانن کەوا مۆساد توانیوویەتی بچێتە ناو کۆشک وماڵی سەرۆک کۆمار...! السادات تاڵی و شە رمەزارییەکەی بە تەنها چێشتبوو، بە ڵام پاش مردنە کەی هەواڵەکەو شە رمەزارییەکە بڵاو کرایەوە.

لە پێناسەی ئە و جاسووسە دا تۆمارکراوە ، کە وا جاسووسە کە ناوی (علي خليل العطفي)بووەو لە ساڵی 1922 لە گەڕەکی (السيدة زينب )ی قاهیرە لەدایکبووە، خوێندنی ئامادەیی تە واو نە کردووە، لە منالّییەوە لەلای دوکاندارێک شاگردیی و بە ردەستی کردووە، کە گەورەتربووە لە فرنییەکی نان وە ک کرێکار کاریکردووە ، لە وێشەوە لە دەرمانخانەیەک کاریکردووە، تا لە پیشەی شێلان و مە ساج شارەزایی پەیدادەکات، ئەودەمانە ئەو پیشەیە لەناو میسر ئەوەندە باوو ناسراو نەبوو، تەنها ژمارەیەکی دەگمەن لە چینە ئورستقراتەکان کاریان بەو شێلانە هەبووە، پاش شۆرشی یولیۆ کە بێگانەکان لە وڵات دە رچوون ئە و پیشە یە کەمبووە، چونکە تەنها کەسانی بێگانە ئەو کارەیان کردووە، بۆیە ئەوانەی ئەو کارەیان زانیووە ژمارەیان دەگمەن بووە ، بۆیە کاریان زۆربووە هەموولایەک داوایانکردوون، ئە وانیش بۆ راپە ڕاندنی کارەکانیان و رازیکردنی مەعمیلەکانیان کاتیان داناوەو لەو ڤیلاوە بۆ ڤیلایەکی تر گەڕاون، ناوی پسپۆری چارەسەری سروشتیان لەخۆیان ناوە، ئەو زاراوەش لەناو میسرییەکان نوێ بوو.

کە پیشەکە گەشەی کردووە ، حکومە ت خولی فێربوونی بۆ مە ساج و شێلان کردیتەوەو لەئامۆژگاکانی سپۆرت ئەو دەرسانە خوێندراوەو بایەخیان پێداوەو کەسانی لێهاتوو و شارەزاکانی ئە و بوارە یان رە وانەی دە رەوەش دە کرد، لە ئەوروپاو ئە مریکاو یە کێتی سۆڤیە ت کۆرسیان وە رگرتووە، لە وانە بە بڕوانامەی دکتۆراش گە ڕاونەتەوە میسر. لەساڵی 1963علي العطفي خەون بەوە دەبینێت رەوانە ئەمریکا بکرێت و بڕوانامەی دکتۆرا لەو پیشەیە وەرگرێت، بەوەش ئەو دەگاتە پۆستی زۆر باڵا لە حکومەت، بەڵام ئەو تە نها بڕوانامەی ئامادەیی هەبووە، بەڵام وە ک خۆی لە کتێبەکەیدا نووسیویە تی، ئە و بە یارمەتی پیاوانی مۆساد لە سەفارەتی ئیسرائیل لە هۆلەندا توانی ئە و بڕوانامە یە وەرگرێت، پاش ئە وەی لە هۆلەندا ژن دە هێنێت و رەگەزنامەی هۆلە ندیش وە ردەگرێت، بە وەش بواری بۆ خۆش دە بێت لە ژێر ئە و ناوە و ئە و پەردەیە کاری جاسووسی بکات و چالاکییە کانی گەشە پێبدات و سە فەری زۆر وڵاتان بکات . کە لەهۆلەندا دکتۆرا ساختە کەی بۆ دە کەن، لە ئامۆژگای پە روەردەی وە رزشی وە ک مامۆستا کاردەکات و بە سەرۆکی یە کێتی پسپۆرانی چارە سەری سروشتیی میسری هە ڵدەبژێردرێت، پاشان ئە و کراوە بەیەکەم راگری ئامۆژگە ی باڵای چارە سەری سروشتی لە یەکەم ساڵی دامەزراندییەوە لەساڵی 1972 تا ئەودەمانەی لە 18 مارسی ساڵی 1978 بەتومەتی جاسووسی دەگیرێت.

العطفي توانی دۆستایە تی و پە یوەندییەکانی لەناو میسر لە گەڵ گە ورە دەسەڵاتدارانی وڵات پتە وبکات، لە وانە (كمال حسن علي ) ئەوەی ماوە یەک سە رۆکی دە زگای موخابە راتی

گشتی میسری بووەو سەرۆکایەتی وەزیران و بەرێز عوسمان ئەحمەد عوسمانی زاوای سەرۆک السادات و خاوەن گەورەترین کۆمپانایی بەڵێندەرایەتی لەکاتی خۆیدا.

ئەو بە هۆی برادە ری سە ردەمی منالّییە کەی کاپتن (عبده سالح الوحش ) ئەو پەیوەندییە دروستدەکات، کە ئەودەمانە ئەو ئە ستێرەی دیارو گە شاوەی یانە ی الاهلي و بەرێوبەری هونە ری هە ڵبژاردەی تۆپی پێی میسری بوو، ئە و توانیبووی العطفي بکاتە میوانی شەرەفی تیمە پزیشکەکەی یانەی الاهلي، بەوەش پەیوەندییە کانی زۆرببوون، تا گە یشتە ئەوەی لە ساڵی 1972ەوە ببێتە مەساجکەری تایبەتی سەرۆک کۆمار.

لەکاتی لێکۆڵینەوەکان لەگەڵ ئەودا، ئەو دانی بەوە دانابوو کەوا ئەو بەهۆی سەفارەتی ئیسرائیل لە هۆلەندا گەیشتووتە سەفارەتی میسری لەو وڵاتەدا، مۆساد هەستی بەوەکردووە، ئەو پیاوە بێجگە لە پارەو سامان هیچ برادەرو هاوڕێی دڵسۆزی نییە، هەستی بۆ نیشتیمانەکەی نییە، بڕواشی بە هیچ هەڵوێستێک نییە، لەسەر بیروباوەڕێکی نەگۆڕیش نییە، بۆیەو لەبەر رۆشنایی ئەو پێناسەیەو ئەو زانیاریانە ئەویان وەک بەکرێگیراوو جاسووسێک دەستەمۆکردووە.

کە ئەو لە قاهیرەوە دەکەوێتە ناو تۆڕی جاسووسیە تییەوە، مۆساد داوای لێدە کات بەخێرایی سە ردانی هۆلە ندا بکات، ئە و چوار رۆژ بوو لە هۆلەندابوو نە یدەزانی ئە ویان بۆ چ مەبەستێک بانگکردووە، بەنیازن چ کارێکی پێراسپێرن، تا رۆژێکیان لەوێ لەناو باخچە جوانەکان پیاسەی دە کرد، رووی بە کیژێکی ناسک و جوان دە تەقێتەوەو رووبە روو بە یەک دە کەون، کیژەکە دەیەوێت بە ربێتەوە سەر زە وی، کە پیاوەکە دەستی دە گرێت و بە رزی دە کاتەوە، کیژەکە بەناوی خۆی بانگی دە کات و پێیدە ڵێت، نامە یەکم خستە ناو گیرفانی پاڵتۆکە ت، ئە و نامەیە بخوێنەوە، بەڵام ئە و هە ستی بە هیچ نە کردبوو، بڕواشی نە کردبوو کەوا ئەو دە ستی بۆ گیرفانی بردووە، لە ناکاو کیژەکە وەک چۆن بە خێرایی پە یدابوو، بەو شێوە یە لەبەرچاوانی زۆر بەخێرایی دیار نامینێت، لە پارچە پسولەکەی گیرفانی ئە درێسێک دەخوێنێتەوە، ئە و دە بووایە پاش چەند سەعاتێکی تر لەو شوێنە بێت، کە دەچێتە نزیک شوێنەکە لە دوورەوە ئۆتومبێلێکی رەش راوە ستابوو، شوفێرە کە بە علي دە ڵێت، زوو و بە خێرایی سواربە ، کە سواردەبێت و ئۆتومبێلەکە خێرا بۆی دەردەچێت، دەبینی کیژەکەی نامەکەی لە گیرفانی پاڵتۆکەی ئاخنی بوو، لە تەنیشتی دانیشتووە. ئۆتومبێلەکە لەپێش باڵەخانەیەک دەوستێت، لەگەڵ کیژەکە دادەبەزێت و ئەویش دەوکەتە شوێن پێی کیژەکەو دەڕوات، دەرگای ژوورێکی لێ دە کرێتەوە کە چەندین ئامێری تایبەتی تێدا ریزکراوە، لەوێ پیاوێکی ئاکار میسری پێشوازی لێدەکات و پێیدەڵێت:

(من ناوم (ئیلی برگمان)ە، لە میسر لە دایکبووم لەوێش گەورەبووم، هەرزەکارییم لە قاهیرە بەسەر بردووە، پاشان بەرەو ئیسرائیل کۆچم کردووە).

بەیەکەوە قسەدەکەن، لەسەر بە رنامەی کارە کانیان دانوستان دە کەن، ئە فسەرەکەی مۆساد پێرادە گەینێت، کەوا ئە و چە ند خول و مە شقی چڕ دە بینێت، ئەویش بە مەرجەکان و

بەکرێیەکەی رازی دە بێت، پێش ئە وەی مە شق و کارە جاسووسییەکانی پێراسپێرن، لە سەر ئامێرو بە مەشقی دۆزینەوەو زانینی درۆکانی چەندین پروڤی تایبەتی بۆ دەکەن.

****

نەبەردییە موستەحیلەکە

ئەو بە رنامەی لە کاری دوارۆژی جاسووسی بۆ العطفي دا نرابوو، ئەوەبوو کەوا ئەو بچێتە ناو توێژی تە ندروستی و ئە کادیمیەکانی میسر، فێریان کرد چۆن شوفرە بەکاربهێنێت، چۆن بێتە ڵ بە کاربهێنێت، وێنە گرتن بە کامیرای زۆر هە ستیاریان فێرکرد، حبری سپی بۆ نووسینی نهێنییان فێرکرد، دە بووایە ئەو وە ک کە سێکی ترو بە بەرنامەیەکی تر بۆ ژیان و تێکەڵبوون بە کۆمەڵگە بۆ میسر بەڕێ بکرێتەوە، بۆیە مەشقەکانیان بەو ئاراستە پێکردو رێگای بەرنامەی نوێی ئە تکێتی رۆژانە یان فێرکردو سازیانکرد، بە و شێوە یە بۆ بە رژەوەندی ئیسرائیل لەناو میسر کاربکات . برگمان ە ە ستی کردبوو ئە و پیاوە زۆری لەبارەو دە کرێ نە بەردی زۆر گەورەو گرانی پێراسپێرن . برگمان لە کۆبوونەوەیەکی گشتگیری هە موو سە رۆک بە شە کان و سەرکردەکانی مۆسادا جانتاکە ی دە کاتەوەو چە ند دۆسیە یەک دە ردەهێنێت، هە ر یە کەو دۆسیەکیان لە پێش دادەنێت، لە و دیمانە یەدا بیرۆکە کەی بە و جۆرە دەردەبڕێت و بە ئامادەبووان دەڵێت:

(دکتۆر علي العطفي پسپۆرە لە چارەسەری سروشتی، ئە و پیشە یەش لە وڵاتی میسر تازەیە، بۆیەش ئەگەری ئەوە زۆرە ئەو پیاوە ناوبانگی باش دەربکات و زۆر بناسرێت، ئێمە ش کەمێ زانیاری نوێی فێربکە ین زۆر باشترە بێت، دە کرێ جۆرەها دە رمان و کرێمی باشی بۆ دابین بکە ین، وا بکرێت ئە و پیاوە لەکۆنگرە زانستیە گەورەکان بە شداربێت، لە ناو میسریش هەڵمەتێکی زۆری پروپاگە ندەی بۆ دە کەین، بە وەش گە ورە دەسەڵاتدارانی ناو میسر دە یناسن، کاریان بە پسپۆری ئەو پیاوە دەبێت، بەوەش ئەو هەموویان دەناسێت و بەئاسانی دەگاتە دەرگاو نووسینگەی زۆریان، بە تایبەتی پیاوە بڕیار بەدەستەکانی ناو حکومە ت، من بیرم لە وە کردیتەوە کەوا سە رۆک السادات پێویستی بە کەسێکی تایبە تی دە بێت تا جە ستەی بشێلێت و ماسولکەکانی بگرێت، بۆ کار نە کەین ئە و پیاوە ببێتە ئەندامێکی دە ستەی تە ندروستی و چاودێری سەرۆک کۆمار، بە ڵام ئەوەیان کاتی دە وێت، ئەوەش کارێکی قوورسی گە ورەیە، کە بەوە ژیانی سەرۆک ئەنوەر سادات دەکەوێتە بن دەستی ئێمە).

سەرۆکی مۆسادو گەورە بەرپرسەکان بە جوانی گوێیان لە قسەکانی برگمان راگرتبوو، داوای لە ئامادەبووان کردبوو، دەنگ بۆ بیرۆکەکەی براگمان بدەن، سەرۆکی مۆساد لەهەمووانی

پرسیبوو، رازین ئە و کارە بکەین، یان نا ... ئامادەبووانی بە وردی و بە چاکی بیرۆکە کەیان شرۆڤەکردبوو، لە کۆتاییدا زۆرینە کە دەنگیان بۆ بە رنامەکەی برگمان دابوو، بۆیە ش یە کسەر بڕیاری سە فەری هۆلە ندای دابوو تا بە زووترین کات بگاتە وە لای علي العطفي، ئە رکی نەبەردییە موستەحیلەکەی پێرابگەیێنێت، کە خۆی ناوی نابوو، نەبەردییە موستەحیلەکە.

****

جاسووسە نەناسراوەکە

العطفي بە کەرەستەی جاسووسیە وە گەیشتووە میسر، حبری نهێنی و شوفرە و ئامێرەکانی گەیاندن و وەرگرتن و کامیرایەکی زۆر هەستیاری پێبوو، بەڵام نەیدەزانی برگمان چ بەرنامەو پلانی بۆ داڕشتووە ، هە ر جارێک بە سەردان دە گەڕایەوە هۆلەندا لە گەورەترن نەخۆشخانەکانی هۆلە ندا کۆرسی چارە سەری سروشتی دە بینی، بە و شێوە یە بووە باشترین پسپۆری شێلان، لە چەندین زانکۆوە داوەتی بۆ دە هات، هە موولایەک داوایان دە کرد لە زانکۆکەیان کۆرسیان بۆ بکاتە وەو دە رس بە فێرخوازەکانیان بڵێتە وەو ڕێنمایی مامۆستاکانیان بکات، رۆژنامە میسرییەکان و بێگانە کانیش هە ڵپەی ئە وەیان بوو دیمانە ی لە گەڵدا بکە ن، ئەوەش هەموو بە شێکی سیناریۆیە کەبوو کە برگمان بۆی دانابوو، تا رۆژێکیان ببێتە کارمەندی تایبەتی شێلانی سەرۆک السادات.

لەودەمانەدا لە میسر یەکەمین ئامۆژگەی چارەسەری سروشتی کرایەوە، العطفي کراوە بە یەکەم راگری ئە و ئامۆژگایە ، رۆژێکیان لە ئامۆژگە خەریکی کاری رۆژانە ی خۆی بوو، پێیانووبتوو، لە دیوانی سە رۆکایەتی کۆمار تۆیان دە وێت. ئەویش بەپەلە گەیشتووە کۆشکی کۆماری و لە وێ دیمانە یەکی تایبە تیان بۆ کرد بوو، کە دیمانەکە تەواو دەکات، سە رۆکایەتی بڕیاریدا ئەو ببێتە دکتۆری چارەسەری سروشتی سەرۆک کۆمار، بەو ئەنجامە زۆر سەرسام بوو، ئەو بچێتە ناو کۆشکی کۆماری، لە وێ ئوتومبێلێکی تایبە تییان بۆ تە رخانکردو بە یانیان لە ماڵەکەی خۆی لە گەڕەکی الزمالک دە یانگەیاندە ئەو کۆشکەی سە رۆکی تێدابوو، لە بەرئەوەی کۆشکەکانی سە رۆک زۆربوون، بۆیە ئەو دە چووە هەموو کۆشکە کان، پاش ئە وەی توانی ڕەزامەندی سە رۆک وە رگرێت، بووە پسپۆری تایبە تی هە موو ئە ندامانی خێزانە کەی، تا بووە کەسێکی زۆر نزیک لە سەرۆک، ئە و بە رووتی سە رۆکی دە بینی، بە رووتی سە رۆکی دە شێلاو سەرۆکیش خۆی رادەستی ئەو دەکرد، کە ئەو زۆر ناسرا لە هەموو سالۆنە دیارییەکان پێشوازی گەرمی لێدە کرا لە فرۆکەخانەکان جانتاکانی ئە ویان نە دەپشکنی، یە کسەر دە رگاکانی بە روودا دەرکرانەوە.

لەودەمانە ئەوەی مۆساد دەیویست ئەو بەئاسانی دەستی دەکەوت، هەموو ڕووداوەکانی ناو کۆشکی بەئاسانی دەگەیاندە سەرۆکایەتی، دەیزانی کەی سەرۆک دیالۆگی هەیە، لەگەڵ کێ دیمانەی هە یە، کە ی تە واو دە بێت، ئە و زۆریش دڵنیابوو هە رگیز ئە و وە ک جاسووس

نادۆزرێتەوەو کارە کانی ئاشکرا نابێت، بۆیە وەک رۆژانی یە کەمی کارکردنە کانی زۆر وریا نەمابوو، ئازادانە لەکۆڵانەکانی قاهیرە دەسووڕایەوە، بەئوتومبێلە تایبەتیەکەی خۆی لە شارەکانی ناو میسر دە سووڕایەوە، نامە کانی خۆی لە جۆرەها بۆکسی پۆست بە رەو دە زگاکانی مۆساد بەڕێدەکرد، وای لێهات نامە کانی لە بۆکسەکەی تە نیشت ئامۆژگە کەیان دە نارد، بۆ نارد نی پۆستەکانی دوور نە دەکەوتەوە. بەچەندین بیانوی سە فەری دە رەوەی میسری دە کرد، کە دەگەڕایەوە مۆری چوونە ناو وڵاتانی ساختە ی لێدە دا، زۆریش بە جانتا جاسووسیە کانییەوە دەگەڕایەوە، لە خۆشاردنەوەکانی خەمساردبوو، بۆیە کێسەکەی ئاشکرابوو، وەک جاسووس ناسرا. لە دوا سەفەرەکانیدا زۆر بێمە نتانەو بەپێی خۆی لە ئەمستردام سەردانی سەفارەتی ئیسرائیلی کردبوو، لە بەرئەوەی ئە و کە سێکی ناسراو و دیاربوو، بۆیە جارێکیان کە وتووە بەرچاوی موخابەراتی میسری، لە وێ پیاوانی موخابە راتی ها وشانی کە سانی مۆساد وێنە یان گرتبوو، وێنەکانیان خێرا گە یاندبووە قاهیرە، ماوەیەکی زۆریش بوو موخابە راتی گومانی لە جاسووسێکی نزیک و وریاو ئاگادار هە بوو، بەڵام بۆی نە دەکرا کە سەکە بدۆزێتەوە، دڵنیابوو جاسووسێک هەیەو زۆریش لە بڕیارەکان نزیکە، بەڵام بۆیان ئاشکرا نە دەبوو، نە دەزانرا ئە و کەسە کێیە زانیاری وردی سە رۆکایەتی کۆمارو رۆژانەی سەرۆک کۆمار دە گەێنێتە ناو ئیسرائیل، سە ریان لەو کە سە سووڕمابوو، بۆیە موخابەراتی میسری دۆسیە یەکی بە ناوی جاسووسێکی نهێنی سازکردبوو، کاریان لەو دۆسیەیە دەکرد، دۆسیەیەکە درابوو بە عەمید (محمد نسیم)، بە نسیمی دڵشێر دەناسرا، ئەو یەکێک بوو لەئەفسەرە بەتواناکانی ناو دەزگاکە، بۆیە نسیم بەوردی و زۆر وریایانە کەوتە کارکردن بۆ دۆزینە وەی ئە و جاسووسە ترسناکەی هە موو نهێنییە کانی سەرۆکایەتی رادەستی مۆساد دەکات.

****

موخابەرات لە جاسووسێک دە گەڕا دۆسیە کەی بە تاڵ بوو، هیچ بە ڵگەیان لە سەری نەبوو، زانیارییان دە ست نە کەوتبوو، موخابە رات هە موو کە سە نزیکەکانی کۆشکی کۆماریان خستبووە ژێر چاودێرییەوە، تا رۆژێکیان زانیارییەک لەسەر العطفي گە یشتە موخابەرات کەوا ئەو لەگەڵ پیاوانی مۆساد لە ئەمستردام بینراوە، بۆیە یەکسەر موخابەرات ئەفسەرێکیان ناردە ئەو وڵاتە تا سۆراخی کەسە نزیکەکەی ناو کۆشکی کۆماری ماڵباتی سەرۆک بکات، ئەفسەرەکە چەند زمانی دەزانی و شیاوی ئە و کارەبوو، بەوردی ژیاننامەی علي العطفي بە سەرکردەوەو لە دۆسیەی تایبەتی ئەوو خێزانەکەی کۆڵیەوە.

کە محمد نسیم دۆسیەکەی ئەوی گەیشتە دەست، چەند رۆژێک خەو نەچووە چاوانی بەردەوام کاری لەسەر دۆسیەیەکەکرد، زۆر خە ریکی بوو، دەیویست باش و خێرا بگاتە ئەنجام، لەکۆتایی گە یشتە قەناعەت کە وا ئە و پیاوە ی نزیک سە رۆکایەتیەو لە کۆشکدا سە ربەستانە هەڵسوکەوت دە کات پیاوی مۆسادە ، بۆیە دۆسیەکەیان رە وانە پێش سە رۆک کۆمار کرد،

سەرەتا ئەو گومانی هە بوو بڕوای نەدەکرد، بەدۆسیەکەی سەرۆکی دەزگای موخابەراتی میسر تووشی شۆک هاتبوو، بۆیە یەکسەر لە ناوی ئە فسەرە پەیوەندارەکەی دۆسیە کەی پرسیبوو، ئەوانیش وەڵامیان داوە تەوە کەوا دۆسیە یەکە لەلای عە مید (محمد نسیم) بووە، لە بەرئەوی بڕوای زۆری بەو پیاوە هەبووە، بۆیە یەکسەر دڵنیابووە لەراستی دۆسیەکەو جاسووسیەتی کەسە نزیکەکەی خۆی و کۆشک و بنە ماڵەکەی، کە دۆسیەکەی چاک خوێندووتەوە فەرمانیداوە ئەو کێسە دەبێ زۆر بە نهێنی راگیرێت، واتە زۆر بە نهێنی کاری لە سەربکرێت، ئە و پلەیەش لە پلەکانی موخابەرات دوا پلە ی نهێنییە، لە دواییدا بڕیاردرابوو کێشە کە دابخەن و علي العطفي جاسووسیش بگیرێت. لەودەمانەوە فەرماندرابوو بە ئەفسەرەکە هۆلەندا چاودێری ورد بخاتە سەر علي، بە ڵام جووڵە و چالاکییە کەت ئە و هە ستی پێ نە کات، نە وەک خۆی باوێتە ناو سەفارەتی ئیسرائیل، لە هۆلەندا لە دەستمان دەربازی دەبێت، پاشان ناکرێ بگیرێت و حکومەتی هۆلەندیش لەو حاڵەتەدا ناتوانی رادەستی میسری بکاتەوە.

ئەو چەند رۆژەی ئەو لە هۆلەندا ماوەتەوە، ئەفسەرەکە بەوردی چاودێری کردووە، تا رۆژێکیان بە موخابەراتی راگە یاندووە، کە وا ئە و پلیتی گە ڕانەوەوی بۆ میسری بڕیوە و دەگەڕێتەوە، بۆیە ئەوانیش فەرمان بە ئەفسەرەکە دەدەن بەهەمان فڕۆکە بگەڕێتەوە، یەکسەر کە ئەو لە فڕۆکە دابەزی بگیرێت . لە رۆژی 22ی مارسی ساڵی 1979 فڕۆکەکە لە فڕۆکەخانەی ئەمستردام بەرەو قاهیرە دەفڕێت، پاش ئەوەی ئەفسەرەکە دڵنیادەبێت علي لەناو نەفەرەکانەو ناوەکەی تۆمارە، ئەویش سواردەبێت. ئەو لە فڕۆکەکە دادەبەزێت، چەند کەسێک لەپێش پەیژەکە چاوەڕوانی دەکەن، بەڵام کە هەموو سەرنشینەکان دادەبەزن، کابرای جاسووسی تێدانەبوو، ئە فسەرەکەو هاوڕێیە کانی ناو فڕۆکە خانەکە چاو دە گێڕن جاسووسە کە دانەبەزیووە، بۆیان روون دە بێتەوە ئەو لە گەڵ فڕۆکە کەدا نەبووە، بە ڵام لە بەرئەوەی موخا بەرات باش چاودێریان کردبوو، بۆیە عەمید محمد نسیم ئاگاداریان دەکاتەوە، کەوا علي العطفي دوو رۆژە لە ماڵەکەی خۆیەتی، دوو رۆژە گەیشتووتەوە وڵات و بەفڕۆکەیەکی زووتر هاتووتەوە، دیارە ئەو لە گەڕانەوەکانیدا ئەو جۆرە فێڵانەی بەکارهێناوە، بۆیە بەرنامەی تریان دارشت بۆ گرتنەکەی.

بەیانی زوو جاسووسە کە لەگۆڤاری (آخر الساعة) تەلەفۆنێکی بۆ کرا، بۆ سازکردنی دیمانەیەکی دووردرێژ لەسەر دوابەرنامەو دەرمان و کرێمە کانی چارەسەری سروشتی لەگەڵدا دەکەن، ئەو وتبووی دەکرێ سەعات نۆی ئێوارە پێشوازییان بکەم، لەکۆتاییدا ژوورنالیستەکە لێ دەپاڕێتەوە کە ئەوان هاتن، تکا دە کەین سەگەکە لە شوێنێکی لاچەپ ببەستێتەوەو با لە ئێمە دووربێت، ئە ویش بە پێکەنین وە ڵامی دە داتەوەو دڵنیای دە کاتەوە کەوا ناهێڵێ سە گەکەی کەستان هەراسان بکات، بەدڵنیاییەوە پێیان دەڵێت ترستان نەبێت، بەڵام ئەو نازانێت بەرنامەکە هەمووی لەلایەن موخابەراتەوە دارێژراوە. لە سەعات هەشت و نیوی رۆژی 23ی مارسی ساڵی 1979 گەڕەکی الزمالک، ئەو گەڕەکەی زۆربەی سەفارەتەکانی دەرەوەی تێدایە، گەورە پیاوانی دەوڵەت و دبلۆماسییە کان لە و دە ڤەرە نیشتەجێن، گە ڕەکێکی هێمنە و ئاژاوە و قە ڕەباڵغی تێدا نەبینراوە، لە بەر ترسناکی پێشهاتە کەو گە ورەی رووداوەکە هەموو شتە کان بە هێمنی بە زیرەکی

بەڕێوەدەچوو، بەتایبەتی لەپێش باڵەخانەی ژمارە 4 لە شەقامی بهجت علي، ڕەوشەکە زۆر ئارام بوو، بەڵام کۆڵانەکانی ئەو گەڕەکە، باڵەخانەکان بەپیاوانی موخابەرات گەمارۆدرابوو. لەوکاتەدا ئوتومبێلێکی ڕەشی ژمارە تایبەت لەپێش باڵەخانەکە راوەستا، چەند پیاوێکی مەدەنی پۆشی لێ دادەبەزێت، بەڵام هێشتا رە وشەکە ئاساییە، کەس گومان لە هیچ ناکات، لە ودەمانەش لە ژوورەوەش علي العطفي چاوەڕوانی ژوورنالیستەکانە.

پیاوانی موخابەرات گەیشتنە پێش دەرگای باڵەخانەکە کە نهۆمێکی تایبەت بە العطفي بوو، ژنە کارەکەرەکە دەرگا لەمیوانەکان دەکاتەوە، دەیەوێت میوانەکان بباتە سالۆنەکە، بەڵام عەمید محمد نسیم لەوێ ناوەستێت، یەکسەر پەلاماری نووسینگەی خاوەن ماڵەکە دەدات، کە تێدا ئەو بەشۆخییەوە چاوەڕوانی ژوورنالیستەکەی دەکرد، ئەگەرچی پەلامارەکە زۆر لەناکاوبوو، بەڵام ئەو خۆی شپرزە نەکردبوو، لەودەمانەش عەمید نسیم فەرمانی بەپیاوەکانی دابوو لە ناو شوقەکە بڵاوببنەوە. نسیم فەرمانی نیابەی بۆ گرتن و پشکنینی شوقەکەی نیشانی ئەو دابوو، ئەو کە فەرمانەکە دەبینێت، گوایە بە بەکرێگیراوی بۆ بێگانە تاوانبارکراوە، علي بە فەرمانەکە سەرسام دەبێت، ئەو بەشێوەیەکی هەڕەشەئامێز وەڵامی عەمیدەکە دەداتەوە، بەڵام پیاوەکان لە کارەکانی خۆی سڵ ناکەنەوە، شریفی کوڕی کە خوێندکاری کۆلێژی ئەندازیاری بوو، لەگەڵ باوکی بەدیتنی ئەو دیمەنە بەزمانی ئەڵمانی قسەدەکات و سەرسام دەبێت، بە باوکی دەڵێت، من ئێستا پەیوەندی بە (جەمال)ی کوڕی السادات دەکەم، با زوو ئەو بە مامە ئەنوەر بڵێت، با ئاگاداری بکاتەوە لەوەی لە ماڵەکەیان روو دەدات، لەناو ئەفسەرەکان یەکێکیان ئەڵمانی زان بوو، بۆیە قسەکانی کوڕەکە بۆ گەورەکەی دەکاتەوە عەرەبی، تا هیچ روو نە دات و کارەکەیان نەشێوێنن.

****

تۆبەکردن

عەمید نسیم وتبووی:

(دکتۆر العطفي، تۆ بە وە تاوانبارکراویت کە لایەن وڵاتێکی بێگانە بەکرێگیراویت، ئێمەش فەرمانی سەرشانمان جێبەجێ دەکەین).

لەوەڵامدا دکتۆر وتبووی:

(تۆ دەزانی لەگەڵ کێ قسە دەکەیت.!).

ئەو دەستی دابووە سەماعەی تەلەفۆنەکە، بەڵام عەمیدەکە توند دەستی گرتبوو، پێیوتبوو:

(باش بزانە کەس ناتوانێ فەرمان و ئەرکی موخابەرات راگرێت، ئەوە دەسەڵاتی سەرۆک کۆماریش نییە ، ئەوەیان یەکەم، دووەمیان: سەرۆک کۆمار ئاگادارە و دەزانی ئێمە خەریکی چیین، ئەو دانیشتووەو چاوەروانی گرتنی تۆ دەکات).

عەمیدەکە وێنەیەکی ئەو لەگەڵ ئەفسەرێکی مۆساد دەردەهێنیت و نیشانی دەدات، کە لەپێش سەفارەتی ئیسرائیلی لە ئەمستردام گیرابوو، کە العطفي وێنەکەی دیبوو، یەکسەر خۆی پێرانەگیرابوو لەسەر نزیکترین کورسی تەنیشتی لاردەبێتەوە.
لەوکاتەدا العطفي وتبووی:

(من هەموو راستییەکان دەڵێم، بەڵام پێش ئەوەی قسەکانم بکەم، من بەنیازبووم ئەو هەفتەیە بەیەکجاری تۆبە بکەم، من بۆیە ش ئەو سەفەرەی هۆلەندام کردبوو تا دوابڕیاری خۆمیان پێبڵێم، من بەنیازبووم ئیمساڵ تۆبەبکەم و بچمە ماڵی خوداو حەجیش بکەم. ئەفسەرە ئیسرائیلییەکە پێیووتم، دەتوانی خۆت و منداڵە کانت سەفەری ئیسرائیل بکە یت، دەکرێ لە تەلئەبیب بژیت، بەلام من پێم ووتن، هیچ نییە شتەکان ئاساییە و دەگەڕێمەوە ماڵەوە، من دەمەوێ خزمەتی میسر بکەمەوە، تۆبە دەکەم).

عەمیدەکە لەسەرخۆ وەڵامی داوەتەوەو وتوویەتی:

(پێشنیارێکی جوانە، چاکت کردووە، ئەوەشت کرد تا ئێمە بتوانین کارەکەمان جێبەجێ بکەین، قسەکەت جوانە.!).

العطفي دەستیپێکرد لەسەرەتاوە چیرۆکەکەی خۆی بۆ عەمیدەکە گێڕاوەتەوە، بەلام لەگەڵ قسانەکانیدا چەند درۆیەکیشی ریزدەکرد، پیاوەکانی موخابەراتی دەیانزانی درۆدەکات، بەڵام بواریاندا بەئارەزووی خۆی قسەبکات.

لەوەڵامی پرسیاری ئەوەی چۆن نامەکانت دەگەیاندە موخابەراتی ئیسرائیل، ئەو لە وەڵامدا وتبووی:

(نامەکان شفرە داربوون، لەسەر کاغەزی کاربۆن دەمنووسین، بەپۆست رەوانەم دەکردن).

بەوەیان یەکەمین بەڵگەی لەسەرخۆی کردەماڵ کەوا کاری جاسووسی کردووە. لەناو (بۆک نۆنە)ەکەی کە باجی ئامۆژگەکەی لەسەربوو، چەند کاغەزی کاربۆنی دەرهێناو نیشانی مەفزەزەکەی دابوو، کە لەسەرەوەی نووسرابوو (بسم الله الرحمن الرحيم)، پێیووتن، من ئە و کاغەزم وەک حبری سپی بەکاردەهێنا، دەستی بۆ کتێبخانەکە درێژکردو کتێبێکی دەرهێنابوو و وتبووی:

(ئەوە کتێبی شوفرەکەمە).

عەمید نسیم بانگی یە کێک لە پیاوەکانی کردبوو، کە کتێبی شوفرەکەو کاربۆنەکەی لێوەرگرن، ئەفسەرەکە بەبێدەنگی شتەکانی وەرگرت، بەڵام عەمیدەکە دەیزانی العطفي کاتیان پێدەکوژێت، ئەو دەیزانی کتێبەکە کتێبی شوفرەکانی نەبوو، بۆیە بە تووڕەییەوە هاواری کردبوو سەری و وتبووی:

(کتێبی شوفرەکانمان نیشان بدە! کتێبە راستییەکە.!؟).

العطفي لە شوێنێکی تری کتێبخانە کەی کتێبە کەی دە رهێناوەو لە ناو دە ستی نسیمی دانابوو، ئەمجارە پێیانوتبوو، ئەوەیان تەواوە. لەودەمانە ژنەکەی و عمری کوڕی دووە میشی ئامادەببوون، پیاوە کانی موخابە رات بە ژنەکەو بە کوڕەکەشیان وتبوو، باش بزانن، ئە و پیاوە بەکرێگیراوی مۆسادی ئیسرائیل بووە و ئێمەش هاتووین بیگرین، کە قسەکەی بیستبوو، ژنەکە لەجێگەی خۆی رووخابوو، ئە وەشیان بە ڵگەبوون کە وا ژنە کە ئاگاداری پلان و کارە کانی مێردەکەی نەبووە، بۆیە ژنەکە زۆر بەتووڕەییەوە ەاوار دەکاتە سەر مێردەکەو قسەی ناشیرینی پێدەڵێت، هە روەها کوڕە کەشی بە شێوەی دایکی هاوار دە کاتە سەر باوکی، لە ودەمانەدا پیاوە گیراوەکە دەست بەگریان دەکات. دانیشتنەکەیان بەو شێوەیە درێژی کێشابوو تا حەوتی بەیانی بەردەوام بووە. نسیم بە پیاوەکانی وتبوو، ژنەکەو مناڵەکان بگوازنەوە شوێنێکی تر چونکە ماڵەکە هەموو حیجزدەبێت و بۆ کاری پشکنین و لێکۆڵینەوە کارمان بەهەموو کەرەستەکانی ناو ماڵەکە دەبێت، بەو شێوەیە پیاوەکان بەکرێگیراوە زەلیلەکە دەبەنە دەرەوەو کەسە نزیکەکەی کۆشکی کۆماری میسری بە ناشیرینترین تاوان دەگیرێت و نێچیرە گرانبەهاکەش لەگەڵ خۆیاندا دەبەن.

****

## السادات خۆی چاودێری لێکۆڵینەوەکان دەکرد

سەعات نۆی بەیانی پیاوەکان لەماڵەکە دەرچوون و دەستەیەکیش بۆ کاری پشکنین و چاودێری لەوێ مانەوە، لەولاشەوە دەستەیەکی تر لە پیاوانی موخابەرات گەیشتبوونە نووسینگە تایبەتییەکەی خۆی لە ئامۆژگەی چارە سەری سروشتی، پاش ماوە یەکیش العطفي لە گەڵ مەفرەزەکە گەیشتبوونە ناو حەوشەی ئامۆژگاکە، خوێندکاران دەستەدەستە وەستابوون و سەیری راگرەکە زەلیلەکەی خۆیان دەکرد، لەوێ موخابەرات بێتەڵەکەیان دۆزیەوە، کە لەشوێنێکی زۆر هەستیارو سە یری دە شاردەوە، پاش ئە وەی دە رگاکەیان بە مۆم کلیلدابوو، شوێنە کەیان چۆڵکردبوو. سەرۆکی دەزگای موخابەراتیش لەو کاتەی مەفرەزەکە لە دەزگاکە بۆ گرتنی ئە و دەرچووبوون، ئە و لە نووسینگەکەی خۆی بە گەرمی چاوە روانی دە کردن، هە موو ساتە کانی پشکنینەکان و لێکۆڵینە وەکانی سۆراخ دە کرد، بەگەڕانەوەی نسیمی شێردڵ سڵاوێکی سە ربازی بۆ لێدابوو، کۆتایی هاتنی ئە رکەکەی بە باشی پێراگە یاندبوو، یە کسەر ئە ویش دە ست دە داتە تەلەفۆنەکەی و قسە لەگەڵ سە رۆک ئە نوەر السادات دە کات، دیارە ئەویش زۆر بە گەرمی چاوەروانی دوا هە واڵی گرتن و پشکنینە کەی دە کرد، بە ڵام السادات حە زی کردبوو هە موو وردەکارییەکان لە خودی عەمید نسیم ببیستێت، ئە ویش وردەکارییەکانی دکتۆرە تایبەتیەکەی خۆی بەجوانی بۆ گێڕاوە تەوە، لەودەمانە سەرۆک فە رمان دەدات، کەوا رۆژانەی لێکۆڵینە وەکە زۆر بەنهێنی ئەنجام بدرێت، رۆژانەی لێکۆڵینەوەکان بەهەزار لاپەرەی فلوسکاپ نووسراوەتەوەو 20 رۆژی خایاندووە، ئە گەرچی ئە و سووربوو لە سەرئەوەی ئە و لە ساڵی 1976ەوە کاری بۆ مۆسادکردووە، بەڵام لێکۆڵینەوەکان دەرئەنجامەکەی وابوو کەوا ئەو لەساڵی 1972ەوە کاری بۆ بەرژەوەندی ئیسرائیل کردووە ، چونکە موخابەرات لە رێرەوەی بێتە لی ساڵی 1972 یان هەڵگرتبوو، کە هەمان لەرینەوەی بێتەڵەکەی ئەو بووە، بۆیە دڵنیابوون، ئەو بێتەڵە لەو ساڵەوە کارکردووەو نامەی شفرەداری رەوانەکردووە.

لە گیرفانێکی زۆر نهینی ئە ودا کارتی ئامێری نیشاندانی میکرۆفیلمە کەیان دۆزیەوەو ئەوەش بە ڵگەیەکی ترسناکی تری جاسووسیە تی ئە وەی دە سەلماند. لەماوەی تە حقیقەکاندا داواکاری گشتی ئیشتراکی میسری بە بڕیارێک لە رۆژی 3ی ئەریلی ساڵی 1979 فەرمانی دابوو، ئەو خێزانە بۆیان نییە دەست لە موڵکەکانیان بدەن، بۆیە هەموویان پاسەوانی تایبەتیان بۆ دانرابوو. دادگاش لە 1ی مارسی ساڵی 1981 هەموو موڵکە کانی ئە وانیان بۆ بە رژەوەندی میللەت حیجزکردبوو، کە بە دوو ملیۆن و 200 هەزار پاوندی میسری دەخەملێندرا.

العطفي بە دۆزی ژمارە 4ی ساڵی 1979 رەوانەی دادگای باڵای دەوڵەتکراوو لەوێش دادگا بڕیاری لە سێدارەدانی بۆ بڕیووە تەوە، بە ڵام سە رۆک السادات سزاکە ی بۆ 15 ساڵ بەکاری قوورسەوە بۆ سووککردبوو، هەرچەندی زۆرلایەن داواکاربوون ئازادبکرێت یان سزاکەی سووک بکرێت، بە ڵام ئەو فشارانە کار لە بڕیارەکە ناکەن، هەتا چەندجار سە رۆک وەزیرانی ئیسرائیلی (مناحیم بیگن) لەرۆژانەی دانوستانە کانی ئاشتی نێوان میسرو ئیسرائیلیش داوای

**سووککردنی سزاکەی العطفي کردبوو. کە بڕیارەکە لەسەر دکتۆرە جاسووسەکە دەرچوو، کوڕە گەورەکەی لەسەر ئەرکی خۆی و بە پارەو لەسەر روویەکی گەورەی لاپەرەی چەندین رۆژنامە میسرییەکان بە میللەتی میسری راگەیاند کەوا باوکی ئە و خیانەت و ناپاکی لە میللەتەکەو وڵاتەکەی کردووە، بۆیە بێبەری خۆی لە باوکی رادەگەیێنێت. کە السادات مردو حسنی مبارک هاتووتە سەرحکوم چەندجار ئەو داوایکردووە، بڕیارەکەی دادگای لە سەر سووک بکات، یان لەبەر نەخۆشی ئازادی بکات، بە لام مبارک داواکەی رەفزدەکاتەوە، کە دوا داواشی لە ساڵی 1987 بووە، بۆیە بەزەلیلی لە 1ی ئەپریلی ساڵی 1990 دەمرێت و مناڵەکەشی رازی نابن، تەرمەکەی بۆ شا ردنەوەش وەرگرنەوە، بۆیە جاسووسە مردووەکە بەبێکەسی لە گۆڕستانی سەدەقەکان دەنێژرێت.**

---

**لەرۆژانی 24و 25ی سپتەمبەری ساڵی 2008 لە رۆژنامەی (الجريدة)ی کوێتی بڵاوکراوەتەوە.**

# خمیس بیومی ئەوەی لە بەیروت سەفارەتی عێراقی تەقاندەوە

لەساڵی 1965 وڵاتانی عە رەبی لە کۆبوونەوەی کۆمکاری عە رەبی بڕیاریاندابوو جۆگەکانی ئاوی رووباری ئوردن بگۆڕن، بۆ ئە گەری بە رپەرچدانەوەی هێرشی ئیسرائیل بۆ راگرتنی ئەو پرۆژەیە، دەبووایە هەموو وڵاتە عەرەبیەکان چەک و سوپایان تە یارو ئامادەبێت، بەتایبەتی ئەگەر ئیسرائیل لە تۆڵەی ئەو کارە هێرشی کردە سەر وڵاتە عەرەبیە هاوسێیەکانی، وڵاتی لوبنان بە سرِبە فرۆکەو رادارێک بە شداردەبێت، لە بەرئەوەی پێگەی ئە و وڵاتە لەبەر شاخە بەرزەکان زۆر ستراتیژییە، بۆیە بۆ خۆپاراستن بڕیاردرا چەند مووشەکێکی ئەرز ئاسمانیان بدەنێ، کە نەخشەو پلانەکە دانرا، باس لە پارەو مەسروفەکانی شەڕە چاوەروانکراوەکەش کرا، لەوێ باس لە وەش کرا کام لایە ن پارەکە دابینبکات، دە بێ ئە و وڵاتە ش نە وەک ئیسرائیل لەتۆڵەی پارەبەخشینەکە هێرشی بکاتە سەر، دەبێ مووشەکی پاراستنی ئاسمانی هەبێت. ئەمریکا ئەو پلان و سیاسە تەی وڵاتەکە عەرەبیەکانی پە سندنەبوو، بە ڵام وڵاتە عەرەبییەکان بڕیاری جێبەجێکردنیان لەسەردابوو. ساڵانی 1971و 1972 لوبنان لەناو گێژاوی ناکۆکییەکانی نێوان فەڵەستینیەکان دەخولایەوەو رووداوەکەی مانگی ئە یاری ساڵی 1973 قەوماو پە یوەندییەکانی بە وڵاتانی عەرەبی ئاڵۆزبوو، بەڵام سیاسەتەکە گۆڕاو پاش شەڕەکەی ئوکتۆبەر لوبنان بە رووی وڵاتە عەرەبیەکان کرایەوەو هەموو بەرەی بەرگری فەڵەستینیش بە باشە کرایەوە، ئەو سیاسەتە نوێیەش لە وەوە زۆرتر هە ستی پێکرا کە سەرۆکی لوبنانی ئە وکات (سلێمان فرنجیه) گوتاری عەرەبی لە نەتەوە یەکگرتووەکان لە سەر دۆزی فە ڵەستین خوێندە وە، زووتر لوبنانییە کان دەیانووت دەبێ چەکە قورسەکانی ناو ئوردوگاکانی فە ڵەستینییەکان لە دەست فەڵەستینییەکان نەمێنێت و لە ئوردوگاکان دووربخرێنە وە، بە وانە رەوشەکەی نێوان لوبنانیە کان و فەڵەستینییەکان ئارامتربوو، هە ستدەکرا هاوسۆزییەکەی گە رم و دڵسۆزانە ترە، وڵاتی لوبنان لە وڵاتێکی هاوبە ش و بە شدار بووە وڵاتێکی بە شدار لە بەرەکەو لە جەنگە بەردەوامەی دژ بە ئیسرائیلییەکان.

****

## گۆڕانی لوبنان

ئیسرائیل ئەو گۆڕانەی لوبنانییەکانی زۆر بە جدی وەرگرتبوو، گەیشتە ئەو قەناعەتی لوبنان دووبارە بەشداری ریزی عەرەبەکان دەکاتەوەو لە گەڵ خۆرهەلاتی تێکەڵدەبێتەوە، بەرەکەی ئەوانیش دەبێتە بەرەی شەڕی ژمارە 5، بۆیە ئیسرائیل بەناچاری بڕیاریدا سیاسەت و ستراتیژییەکانی ناوچەکە بگۆڕێت، بەوەش تووڕەیی ئیسرائیل و ئەمریکا دەروازەکەی کرایەوە. ئەمریکا چرای کەسکی بو ئیسرائیلییەکان داگیرساند کە راست و چەپ لە لوبنان بدات، بەوەش وڵاتەکە شپرزەبکات، بۆیە ئیسرائیل بەردەوام بە تۆپە قورسەکانی لە (النبطیة)ی دەدا، ئوردوگا فەلەستینییەکانی ناو لوبنانی هەراسانکردبوو، تۆپبارانە کە دەگەیشتە ناو بەیروتی پایتەختیش.

موخابەراتی ئیسرائیلی لەناو لوبنان کەوتەخۆو دەستیان بە چالاکی کردبوو، توانیان بە چالاکییەکانیان رەوشی ناو لوبنان بشێوێنن، بە تۆڕە جاسووسیەکانیان توانیان هاوسۆزی و هاوکاری لوبنانی و عەرەبی شێلوو بکەن، موخابەراتی ئیسرائیلی زووتر لە چالاکییە شەرمەزارییەکەی لافۆن لە میسرو لە هەڕەشەی کوشتنی زانا ئەڵمانیەکانی مووشەکەکانی ناو میسر کاریکردبوو، بۆیەش لە لوبنان کەوتە بەرنامە دانان و پلانگێران، کە سێکیان بە ناوی (خمیس ئەحمەد بیومی)ی تەمەن 34 ساڵە پەیداکرد، مەشقیان پیکرد، ئەو جاسووسە بێدڵە، ئەو پیاوە بێویژدانە بەشێوەیەکی زۆر هۆڤیانە لەناو لوبنان دەستی بە کاری تێکدەرانەکرد، بێرەحمانە لە لوبنانی دەدا، لە ناخەوە ئەو وڵاتەی دەهەژاند.

****

## پێناسەیەک

لەیەکێک لە و باڵەخانانەی سەردەریا لەسەر رێگای بولیفار، خیمس لە خێزانێکی دەوڵەمەندو ژمارە زۆر لە دایکبووە، باوکی پیاوێکی بە ڵێندەری گەورەبوو، لە نووسینگەکەی ژمارەیەکی زۆر کارمەند کاریاندەکرد، ئەو لە خۆشی و بە ناز ژیاوە، شەوانە لە گازینۆو دیسکۆکانی بەیروت و صیدا کاتەکانی بەسەربردووە، تەمەنێکی درێژی لە مێبازی و کەیفوسەفا بەڕێکردبوو، لەگەڵ هاوڕێیە دەوڵەمەندەکانی تری خەریکی کات بەفیڕۆدان و بەزمی رابواردن بووە، هەرچەندی باوکی ئامۆژگاریکردووە، ئەو کاری نەکردووەو لەسەر کارە زۆرەکانی باوکی نەگیرساوەتەوە، بۆیە باوکی دەستی لێدەشووات و بەرەڵای دەکات، بەتووڕەبوون دەریدەکات تا ئەودەمانەی بەهۆش خۆی دێتەوەو بە سالحی دەگەڕێتەوە ماڵەوە.

بەڵام ئە و هیوایە ی باوکی نە هاتەدی، رۆژێکیان باوکە کە بە رووداوی ئۆتومبێل دەمرێت، کە خێزانەکەی سەیری پارەو سامانەکەی دەکەن، دەردەکەوێت ئەو پارەیەکی زۆری لە بانکەکان قە رزکردووە، بە و روود اوە خمیسی کوڕ هە ستدەکات گورزێکی کوشندە ی بەرکەوتووە، کە هاوڕێیەکانی تێگە یشتن باوکی پارە و سامانێکی زۆری بۆ جێنە هێشتووە لەو دووردەکەونەوەو تەنها دەمینێتەوە، ئەو دەبێتە براگەورەی شەش خوشک و دایکێکی داماو.

بەناچاری ملی لە کاسبی نا وەو کۆششی کردووە تاڵی ژیان و ناخۆشییە کان چارەسەربکات، لە بنکەیەکی کە مئەندامان لە شاری صیدا وە ک شارە زایەک لە کاری چارەسەری سروشتی کاردە کات، هە رچەند کۆششدە کات و خۆی ماندووده کات هە ستدەکات ناگاتە هیچ، رە نجەکەی بە رهەمی نییە ، وە ک گـایەک وایە بەردێکی گە ورە سەردەخاتە هەورازێک و پاش ماندووبوون و کۆششی زۆر بە ردەکەی بۆ خوارەوە گلدەبێتەوە، بۆیە هەست بە هەرەس و شکان و نائومێدی دە کات، دەست لەو کارە زەحمەتە بێ بە رهەمە بەردەدات، بیردەکاتەوە سەفەری کەندا بکات، لەوێ ژیانێکی نوێ دەست پێ بکاتەوە، بەڵام پاش چەندین هەول و کۆشش سەفەرەکەی سەرناگرێت، بۆیە بەتووڕەیی رقی لە خۆی و لە دەوروبەرەکەشی دەبێتەوە، بە تووڕەییەوە سەیری کۆمە ڵگاو ژیانی تایبە تی خۆی دە کات، لە گەڵ رووخان و شکانەکەی دەتلێتەوە.

****

لەناو تۆڕی جاسووسیەدا

رۆژێکیان خمیس رووبە رووی پیرەژنێکی ئە رمەنی دەبیتەوەو پرسی ئە وەی لێدەکات شوێنێک یان کەسێکی بۆ چارەسەری سروشتی بۆ کوڕە کەمئەندامەکەی بۆ بدۆزێتەوە، ئەویش کە سەیری راپۆرتی نەخۆشەکە دەکات، بڕیاردەدات لە ماڵەکەیان سەردانی بکات، کە دەچێتە ماڵەکە دەبینی وەزعیان باشەو دەوڵەمەندییان پێوەدیارە، لەوێ (غریس)ی کەمئەندامی تەمەن 9 ساڵان دەبینێت بێجوولە کەوتووە، لەچاوانی ئەو کیژە بەرائەت و بێتاوانی دەبینێت.

خمیس رۆژێکیان (کۆبلیان)ی زێرینگر لە بەیروت، خاڵی کیژەکە دەبینێت، بەیەکەوەو بەگەرمی دەمەتەقێ دەکەن. خمیس رۆژانەی هەبوونی ماڵەکەی خۆیانی بۆ دەگێڕێتەوە، شەوانی دیسکۆکانی بەیروتی بۆ باسدەکات، کە چۆن ئەو ماوەیەکی زۆر کەیفی کردووە، ئێستاش لەگەڵ کارێکی نارەحەت و برسیە تی رۆژانە بەڕێدەکات، کۆشش زۆر دە کات تا خێزانە زۆرەکەی نان بدات، بە پیاوەکەش دە ڵێ، من بۆ پارە ی زۆر ئامادە م هە موو کارێک بکە م، ئیشی گرانم پێدەکرێت، پێویستم بە هەڵسانەوەیە، دەبێ سەرچاوەیەکی باش بۆ پارەپەیداکردن بدۆزمەوە.

کە کۆبلیان سەفەری بە یروت دە کاتەوە، هە ستدە کات نێچیرێکی ئاسانی دۆزیوە تەوە، کەسێکی لاوازی کە وتووتە بەردەستان. تا رۆژێکیان خمیس لە بەیروت سە ردانی پیاوە زێرینگرەکە دە کات، دڵسۆزی و کارامە یی خۆی نیشاندە دات، ئە ویش هەستدەکات ئە و پیاوە

زۆر برینداره‌و زۆریشی خۆشی دیوه و ده کرێ باش کار له سەر ئەو بکات و باش ده ستەمۆی بکات، بەبیری دەهێنێتەوە کە ژیان چەند خۆشەو سامان چۆن ئینسان دڵشادو سه رفرازدەکات، پیاوه بەکرێگیراوەکەی مۆساد زیره کانه مامەڵەی له گەڵ ده کات، تا ده گاته ئەو ساتانه ی پێیبڵێت، تۆ پارەت دەوێ و دژایەتی لوبنان بکەیت، تۆ ئامادەی لەگەڵ ئیسرائیل و ئەمریکا بیت و دژی عه رەب بیت، ئه ویش له ناو تاڵی ژیان وکۆششی زۆری بۆ پاره پەیداکردن، ئامادە یی سازش دەبێت و دەڵێ من به پاره لوبنان و عەرەب دەفرۆشم.

****

تەقینەوەو وێرانکردن

خمیس له بەیروت به پارەی مۆساد شوقەیەک بەکرێدەگرێت، پارەیەکی زۆر شەوانه له خۆشییەکانی خۆی سه رفدەکات، بەپێی ڕێنماییەکانی مۆسادو بەسەرپەرشتی کەسێکی بەناو پورتگالی بەناوی (روبرتو)، بەڵام زمانی عەرەبی باش دەزانی کەوتە تۆڕەکە، لەوێ فێری دەکەن چۆن مین و ته قینەوەکان بچێنێت، چۆن کاتیان بۆ دابنێته وه، زۆر لایه نی خۆشاردنەوەو گومان دوورخستنەوەی فێردەکەن. سازکردنی تەقینەوەی (تی. ئێن. تی)ییەکانی زۆر کوشنده مەشق و زانینی باشی دەویست، دەبووایه ئەو لەسەر ئەو مادانه ڕاهێنانی زۆر چڕبکات، لەبەرئەوەی ئەو خزمەتی سەربازیشی نەکردبوو، بۆیه ڕاهێنانەکەی ئەو کات و بەرنامەی زۆری دەویست.

یەکەم فه رمان که بۆیان ده رکردبوو، سه فارەتی عێراقی له بەیروت بته قێنێتەوە، خمیس که فەرمانەکه دەبیسێت ماوه یەک بێده نگ ده بێت، هه ست راده گرێت، له ودەمانه گیرفانه تەژی پاره کەی به بیردێتەوە، بۆیه دەست ده داته جانتا مشت ته قینەوەکان و به ڕەو سەفارەتەکه دەڕوات، بەهێمنی دەڕوات و بڕواشی پتەوه به جێبەجێکردنی فەرمانەکەی، دەست بەجانتاوه دەچێتە ناو سەفارەتەکەو دەستبەتاڵ دەگەڕێتەوە، واته جانتا تەژییه تی ئێن تییه کەی له ساڵۆنه سەرەکییەکەو له پشت جەستەیەکی گەوره دادەنێت و دەێتە دەرەوە، بەڵام ئەو دوور ناکەوێتەوە، لەدوورەوە چاوەڕوانی دیمەنی تەقینەوەکەی ده کرد، وەک چۆن ماوە ی نیو سه عاتی بۆ تەقینەوەکە داناوەتەوە، پاش نیو سەعات گەڕەکەکه دەبێته یەک پارچه ئاگرو دووکەڵ.

لەو ته قینەوەیەدا نۆ کە س ده کوژرێن، له وانه 5 کەسیان لوبنانی بوو ن، ئه و به هەناسەی سوارو بەترسەوه گەڕاوەتەوه شوقەکەی خۆی، پاش گاڤێکی کورت پیاوه بەرپرسەکەی که به (روبرتو) دەناسرا، له شوقەکەی ده گاته سەرسەری، که بینی خمیس شێواوه و ترساوه، خۆی لێ تووڕه دەکات، ئاگاداری ده کاتەوه ئەگەر بە و جۆره خۆی شپرزەو ترساو نیشانبدات، تاوانەکەی لێ ئاشکراده بێت، بۆیه هانیدەدات وره ی به رزبێت و زۆر ئاسایی بێت، ئه گەرنا دەگیرێت و ژیانت ده کەوێته مەترسی و فه وتان. خمیسی گه مارۆدراو به جنێوو هه ڕەشه له گۆشەیەکدا خۆی ماتکردبوو، دیاره بەرپرسانی موخابه راتی به و شێوه یه مامەله لەگەڵ ئەندامەکانیان ده کەن، به شلی و به نەرمی، به ترس و به دڵدانەوە، به ترسدان و سۆزبه خشین،

ئەوان لەهەموو کەس باشتر دەزانن چۆن خائینەکان و جاسووسەکان بدوێنن، دیارە راهێنانی ئەو کەسانە شارەزایی و لێهاتوویی دەوێت، بەرنامەی پوختی دەوێت. هەواڵی تەقینەوەکەی سەفارەتی عێراقی لە بەیروت لە میدیاکان بڵاوکرایەوەو، لە ودەمانەش روبرتو بە وردی و بە چاوێکی وردبینیەوە نیگای لە ئاکاری خمیس دەکرد، دەویست لە نیەتی تێبگات، دەیویست بزانێت پاش بڵاوبوونەوەی هەواڵەکە ئەو چ ئاکارێکی دەبێت، چۆن هەواڵەکە وەردەگرێت، هەمووش بۆ ئەوە بوو ئەو پیاوە لە رەوشەکانی کووشتن و نارەزایی و یاخیبوون و شەرمەزاری ببینێت.

مەبەستی ئیسرائیل لە تەقاندنەوەی سەفارەتەکە، نانەوەی تۆی ناکۆکی و دووبەرەکی لەنێوان ئەو دوو وڵاتە و وڵاتانی عەرەبی هاوسنوور و هاوسۆزەکان بوو، عێراق کۆششی دەکرد پەیوەندی لوبنان بە یەکێتی سۆڤیەت باش و خۆش بکات، داواکاربوو لوبنان بە رەو فراکسیۆنی خۆرهەڵاتی راکێشێت. ئیسرائیل مەبەستی بوو بە رەکانی بەرگری فەڵەستینی بەو رووداوە لە لوبنان تاوانباربکات، تا فەڵەستینییەکان بەرەی لوبنانیش بدۆڕێنن. پاش ئەو رووداوە خمیس بووە کەسێکی خوێنمژو جەلاد، ئەو توانی لوبنانییەکی تری وەک خۆی بە ناوی (جمیل القرح) بدۆزێتەوە، ئەو مامۆستابوو لەسەر رەوشتی منالبازی لە وەزیفەکەی دەرکرابوو، بە هاتنی ئەویش بۆ ناو تۆڕەکە روبرتو دەستخۆشی لە خمیس دەکات و شادومانی بەو ئەندامە نوێیە دەربڕیبوو، لەبەرئەوەی ئەو خزمەتی سەربازی کردبوو، بۆیە ماوەی راهێنانەکەی ئەو کورتتردەبێت، بۆیە لەکاری تەقینەوەو دانانەوەکانیش لێهاتوو و بەئەزموون بوو، کە پارەی زۆریان بۆ هەڵرشت، ئەو تا بن گوێچکەکانی مەستی کاری کووشتن و تەقینەوەبوو، بەیەکەوە بە تەقینەوەکانیان هەموو شاری بەیروتیان هەژاندبوو.

****

مووشەکی ناو ئوتومبێلەکان

لە سەعات نۆی بەیانی رۆژی 10ی سپتەمبەری ساڵی 1974 لە کاتێکدا فەرمانبەرانی ناو نووسینگەی رێکخراوی رزگاریخوازی فەڵەستینی لەدەڤەری کورنیش (المزرعة) خەریکی کاری رۆژانەی خۆیان بوون، بارەگەکەیان بەچەند مووشەکێک دەلەرزێت، دیاربوو لە هەردوو پێشانگاکەی نهۆمی خوارەوە کە ناویان (ذبیان)و (ئەیوب)ی فەرشکاری بوو، مووشەکەکان تەقێندرابوون. پیاوانی ئاسایش ئوتومبێلێکی جۆری فیاتی سپی 132 یان لەبەرامبەرەکەیان دۆزیەوە، کە لەسەرەکەی بنکەی چوار مووشکی ئار پی جی بە لژێکی عیار 3.5 بۆرسەی لەسەر بەسترابوو، هەر چوار پێگە کە لەسەر تەختەدارێک بەسترابوون بە وایەرێکی درێژی کارەبایی گرێدرابوون، لەوێیەوە مووشەکەکان هاتبوون.

پاش پشکنینی ناوچە کە بەدووری 65 مەتر دوور لە ئوتومبێلی یەکەمەوە، ئوتومبێلێکی تری مارکە فیاتیان دۆزیەوە، کە لەسەرەوەی تەختەدارێک دانرابوو، وایەرێکی کارەباییش بە پاترییەکەوە بەسترابوو، پاش مووشە کەبارانەکەی نووسینگەی رێکخراوەکەو

خێزانەکانی ناو باڵەخانەکە بەخێرایی چۆڵیانکرد، پێش هاتنی شارەزایانی تەقینەوەکان، لە دوورەوە بینرا تە ختە دارەکانی سە ر ئوتومبێلە کەی دووە میش سە رەکەی بە رزدەبێتەوەو بە شێوەیەکی ئوتوماتیکی سە رەکەی دە کرێتەوەو چە ند مووشە کێکی ئار .پی.چی دە رچوون و بە رووی باڵەخانەکە تەقینەوەو رووی پێشە وەو جامخانە کانی راستە وخۆ دە پێکێت، هاودە م مە ڵپەندی توێژینەوەی سەر بە رێکخراوی رزگاریخوازی فەلەستینییەکان هەڵکەوتوو لە باڵەخانەی دکتۆر محمد راجي نصر درابوو بە ر مووشە کی دوورهاوێژ کە لەسەر ئوتومبێلێکی ئاودی 180ەوە دانرابوونەوە، لە تەنیشتیەوە گاڵۆنێکی داریش دە دۆزنەوە، کە راستەوخۆ بینایە کەی پێکابوو، کە نزیکەی 15 هەزار کتێبی تێدابوو، لە وێ چە ند هاوولاتیە ک بە رکەوتن، پاش دە دەقە لەو تەقینەوانەدا نووسینگەی کاروباری خاکی داگیرکراویش لە نهۆمی یە کەمی باڵە خانی (الایمان) کە خاوەنەکەی (جعفیل البنا)ی شەقامی کرم الزیتون، بەر چوار مووشەک کەوتبوو. ئەو کارانە هەموویان بە دەستی خمیس و القرحی هاوڕێی کرابوو، ئە ویش توانیبووی سێ کە سی تریش بهێنێتە ناو تۆڕە کە، ئە و شێوە تەقاندنەوانە بە ئوتومبێل و بە وایەری کارە بایی بە ستراو بە سەندووقە دارو بە پاتری ئۆتومبێلەکان لەناو بەیروت چالاکی نوێ بوون، نە ک لە بەیروت لە هیچ شارو ولاتێکی عە رەبیش رووی نە دابوو. پاش ئە و رووداوانە تەقینەوەکان بێجگە لە سەفارەتی عێراقی و بارەگەکانی فەلەستینییەکان گەیشتە کەنیسەکان و مزگەوتەکانیش، بەوەش رێگای ئاژاوە و دە مارگیری و تۆڵە کردنەوەی لە ناو لوبنانییە کان والاکرد، لە بەر چە ند هۆکار دەزگاکانی ئەمن و ئیستخبارات بۆیان نەکرا دەستدرێژکەرەکان و تاوانبارەکان بدۆزنەوە.

یەکەم هۆکار ئە وەبوو، کەوا دەزگا ئەمنیە لوبنانییەکان لایان شە رم و کەماسی بوو، ئەگەر هاوکاری دە زگا فە لەستینییەکان قبوول بکە ن. دووەمیان تا ئە ودەمانەش لوبنان زۆرتر بایەخی بە کەرتی گە شتوگوزاردەدا، نە ک کاربکات بۆ پتە وکردنی دە زگا ئە منیەکانی خۆی . سێیەم هۆکاریش کە وا لوبنانییە کان بۆیان نە دەکرا دە ستە بێکدەرەکان بدۆزنە وە، ئە وان واتە لوبنانییەکان هێشتا خۆیان لەنێوان لایەنە هاوسۆزەکان و ولاتانی بەرگری ساخ نەدەکردەوە، بۆیە دەستەکەی بە کرێگیراو خمیس بیومی و چە ند دە ستەی تری جاسووسی سە ربەستانە لەناو لوبنان کاریان دە کردو ترسی کە سیان نە بوو، پیاوە کانی ئە و دە ستانەش وە ک قوومی نە رم دەخزینە ناو پیاوانی ئاسایشی لوبنانی، ئەو تۆڕە جاسووسیانە ولاتەکەیان خستبووە ناو زەڵکاوێکی قووڵی کوشندەو ترسناک.

کە لوبنانییەکان جاسووسە کانیان راو نە دەکردو ئە وانیش ئازادانە لەناو ولات کاریان دەکردو نە دەگیرا، فە لەستینییەکان بە وە هەراسان ببوون، بۆیە نێوانیان ئاڵۆزیی و خراپی دەکەوتێ، لەودەمانە دەزگا ئەمنییە فەلەستینییەکان جاسووسێکی رە گەز بەلژیکیان گرت، پاش لێکۆڵینەوەکان دەرکەوت ئەو بۆ بەرژەوەندی ئیسرائیل کاریکردووە، لەجیاتی ئەوەی لوبنانییەکان لە لێکۆڵینەوەکان هاوکارو کۆمەکیان بکەن، دونیایان لەسەر وەرگێڕان، داوایان دەکرد بەزووترین کات ئە و پیاوە بێگانەیە ئازادبکەن، بە ناچاری بە دۆسیە تەژی تاوان و دانپێدانە کانی

جاسووسەکەیان رادەستی لوبنانیەکانیان کردەوە، ئەوانیش پاش 24 سەعات کابرای جاسووسیان ئازادکرد.

****

**ئاگربەس و ئارامی**

ئەوانەی فە ڵەستینییە کان لێکۆڵینە وەیان لە گەڵ دە کردن، دانیان بە وە دەنا کە وا بۆ بەرژەوندی ئیسرائیل کاریان کردووە ، بە ڵام لوبنانییە کان سووربوون لەسەرئەوەی ناکرێ فەڵەستینییەکان کەس بگرن و لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکەن، ئەوە کاری دەوڵەتە، بۆیە وەزیری ناوخۆی لوبنانی (شيخ تقي الدين) بەرەسمی نارەزایی بەرووی فەڵەستینییەکان راگەیاندو نێوانیان ئاڵۆزی دە کەوتێ، لە ودەمانەش تە قەنەوەکانی ناو لوبنان رە وشەکەی زۆرتر ئاڵۆزکردبوو، حکومەت بەناچاری لە رۆژنامەکانی رۆژی 27ی دیسمبەری ساڵی 1974 بەیانێکی راگەیاند، بەروونی بە دەستەو کە سەکانی پشتە وەی تە قینەوەکانی راگە یاند، بۆ ماوە ی دوو رۆژ، لە بەر پیرۆزی جەژنەکانی سەری ساڵ تەقینەوەکان راگرن، لەو ماوەیەدا تەقینەوە مەچێنن. حکومەت وەک حکومەتی بریتانیای کرد کە جارێکیان داوای لە شۆرشگێرانی ئێرلەندا کردبوو، ئاگربەس بکەن. لە رۆژنامەکاندا بڵاوکرایەوە کەوا حکومەت بەرووی ئەودەستە تێکدەرانە دەستەوەستانەو دەرەقەتیان نایێت، هیچی پێناکرێت، بۆیە بەرووێکی ئینسانی و گە ورەیی ئادە میزاد ئە و کارە راگرن، دوو رۆژیش باشە بۆ ئاشتی و ئارامی، حکومە ت وتبووی ئە و دوو رۆژە شارەکە دەکەینەوەو ئارامی شارەکە بۆ مێژوو دەخەینە ئەستۆو ویژدانی ئەو بکوژانە.

لە کاتێکدا کە خمیس خە ریکی وێنە و نە خشەکێشانی بینایە کانی رێکخراوە فەڵەستینییەکان بوو، لە 97 ینایری ساڵی 1975 پیاوانی ئاسایشی فە ڵەستینی علي خميس بیومییان لە شەقامی کورنیش المزرعة دە گرت، هە موو زیرە کی و فێڵە کانی خۆی کە فێریان کیدبوو، لە رۆژانی لێکۆڵینە وەکان بە کاردەهێنا، بۆیە نەیانتوانی بە ربەستەکان بشکێنن و لە نهێنینەکانی ئەو بچنە ژوورەوە، ئەوانیش بەناچاری ئازارو ئەشکەنجەیان بەرامبەر ئەو بەکارهێنا، بۆیە ئەو زوو دانی بە هەموو کارەکانی هێناو زوو جمیل القرح گیرا، بەڵام پێش ئە وەی ناوی هاورێیەکانی بدرکێنێت بە وەستانی دڵ مرد، روبرتوش نە گیراو لە بەرچاوان ون دە بێت، کە لێکۆڵینەوەکانی فە ڵەستینییەکان تە واو بوو، درایە وە دەست حکومە تی لوبنانی، ئە وانیش پاش دادگاییکردنی بە دە ساڵ زیندانی سزای دەدەن.!

---

لەرۆژنامەی (الجريدة)ی کویتی رۆژی 18 09 2008 بڵاوکراوەتەوە.

# ئەو جاسووسەی بەرنامە مووشەکانی میسری شکاند.

لە 6ی یولیۆی ساڵی 1961 ئیسرائیلییەکان بە بۆنەی هە ڵدانی یە کەم مووشە کی دوورهاوێژیان ئاهەنگیان دە گێرا، ناویان لە مووشەکە نابوو، (شافیت 2)، واتە (شافیت 1)یش دروست دەبێت. ساڵێکی نەبرد میسرییەکان لە ساڵرۆژی دەیەمینی شۆرشی یولیۆو لە 21ی یولیۆی ساڵی 1962 دوو مووشەکی دوورهاوێژیان لە جۆری (الظافر) کە مەوداکەی 175 میل دەبوو بە رەو ئاسمان هە ڵدا، هە ر هە مان رۆژیش دوو مووشە کیان لە جۆری (القاهرة) کە مەوداکەی 175 میل دە بوو هە ڵدا، سە رۆک جە مال عبدالناسر لە ئاهەنگەکەدا ئە وەی نەشاردووتەوە کەوا مووشە کەکانیان دوور دە ڕوات و دە گاتە سەر بە یروت، نیازی ئە وە بوو ئیسرائیلییەکان بزانن مووشە کەکانیان دە گاتە سەر هەموو بستێکی خاکی ئێوە ش. ئەو هە واڵە هاووڵاتیانی ئیسرائیلی خستە رەوشێکی پڕ مە ترسی و دڵە ڕاوکێ، گلە یی لە حکومەتەکەیان دەکرد، بۆچی بە و بەرنامەی میسریان نە زانیووە، ئە گەر ئاگاداربووینە بۆ خە ڵکەکەیان ئاگادار نەکردووتەوە، لە هەموویان زۆرتر موخابە راتی ئیسرائیلی زۆر نیگە ران بوو، چۆن بەکرێگیراوەکانیان هەستیان بەوە نەکردووە، دەبووایە ئەوان کاریان بەو ئاراستەیەش کردبووایە.

سەرۆک وە زیرانی ئیسرائیل بانگی سە رۆکی مۆساد دە کات، بە گازاندەو گلە ییەوە بە (ئایسر هاریل) دەڵیت:

(هەموومان چاک دەزانن حکومەت ساڵانە پارەیەکی زۆر لەو دەزگایە سەرف دەکات، ئینجا لەناکاو لە وتارێکی سەرۆکی میسرییەوە دەزانین کەوا مووشەکیان دروستکردووە، کەواتە لەمەودوا ئە و دە زگایە گەورەیەمان بۆ چییە ، دیارە تەنها پێویستمان بە رادیۆیەکی ترانزستۆر دەبێت و بەس).

بن گوریون لەرووی سەرۆکی مۆسادەوە دەتەقێتەوەو دەڵێت:

(من بە زووترین کات راپۆرتێکم لە سەر ئە و مووشە کانی میسر دە وێت، دەمەوێ زۆر بەخێرایی زانیاری تەواوم بۆ ئامادەبکەن، چۆن دروستکراوە، کێ کۆمە کی کردووە، لەئیمرۆەو تا سێ مانگی تر ئە و راپۆرتەم دەوێت، راپۆرتە کە نەگاتە سێ مانگی تر.! من لەو رۆژەی هەواڵی مووشەکەکەی جەمالم بیستووە، خەو نەچوویتە چاوانم، تا راپۆرتە کەم نە گاتە دەست ناخەوم، دەبێ بە هەر شێوەو رێگایەک بێت، ئەو مووشەکە میسرییانە راگیرێت).

لەو رۆژەوە دەزگای مۆساد بە شێوەیەکی زۆر ئە کتیف کەوتووتە کارکردن، زانیارییان کۆکردەوە، سە ربردەی ئە و مە سەلەیەش دە گەرێتەوە سەردەمی شە ڕی دووە می جیهان، کە ئەفسەرە ئەڵمانیەکانی سوپای نازی پاش شکانی سوپاکە یان بە دوای نە وایەک دە گەڕان، کە خۆیانی تێدا بشارنە وە، دوور لە چاوان بن، بە شێک لە و ئە فسەرە نازیانە کەوتنە ناوچەکانی خۆرهەڵات و بەشێکیان گەیشتنەوە خۆرئاواش.

ئەفسەرانی فە یلەقی ئە فریقی بە سەرۆکایەتی (رۆمیل) وەک راوێژکارو پسپۆر لە ناو سوپای میسری جێگایان کراوە تەوە، لە ساڵی 1951 ژەنرالی پێشووی ئە ڵمانی، (ویلهلم فارم) لەگەڵ دەستەیەکی گچکە لەئەفسەرەکانی گەیشتە ناو میسر، شارەزایی و پسپۆرییەکانی خۆیان نیشانی حکومە تی میسری دابوو، بە دڵسۆزی لە و رۆژە وە لەوێ کە وتوونەتە کارکردن، پاش شۆرشەکەی یولیۆش سە رکردایەتی شۆرشە کە مانەوەی ئە و دڵسۆزانە یان لە ناو دە زگاکانی سوپای میسریان بە پێویست زانیبوو، بۆیە بواردرا هە موویان لە شوێنەکانیان کاربکە ن، وە ک خۆیان بمینێنەوە.

یەکێک لە ئەفسەرەکانی دە ستەکە دکتۆر (ویلهام فۆس )بوو، کە یەکێک لە دامەزرێنەرانی مووشەکی ئەڵمانی، لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو، ئەویش (رۆلف ئەنجل)بوو، کە پاشان بووە سەرپەرشتکاری کۆمپانیای میسری (کیرفا)، کە لەلایەن حکومەتەوە بۆ سازکردنی تاکتیکی و دروستکردنی مووشە ک دامە زرابوو، ئە ویش توانی ئە ندازیاری ئەلکترۆنی ئەڵمان ئە وەی لە کارگەی توێژینە وەکانی نهێنی ئە ڵمانی مووشە کی ئاراستە کراو (بۆل جورک ) کە لەوێ کارکەربوو رازی بکات بێتە قاهیرەو لە وێ هاوشانی ئە وان کاربکات. کە ئەڵمانەکان بینییان مووچەکانیان وەک پێویست نییەو هەستیانکرد میسرییەکان بایەخ بەبەرنامەو کارنامەیان وەک پێویست نادەن، سەرەتا لە ساڵی 1958 (فارم باشر) لە قاهیرە دەرچێت و کارەکە جێدەهێڵێت و پاش ئە و، ئەوانەی تریش دەستیان لە کارەکەکانیان هەڵگرتووەو لە میسر دەرچوون، بۆیەش حکومەت کۆمپانیای کیرفایان هەڵوەشاندیتەوە.

****

بەهرە ئەڵمانییەکان

لەساڵی 1959 سەرۆک جە مال عبدالناسر داوایکرد بە رنامەی سازکردن و دروستکردنی مووشەکەکان دووبارە نۆژەن بکەنەوە، بۆ ئە و مەبەستەش لیوا (محمود خلیل) کە یەکێک بووە لە بەرێوەبەرانی موخابە راتی سە ربازی بۆ سە رپەرشتی ئە و بە رنامەیان راسپارد، بەڵام بڕیاریشدرابوو کارە کەو بە رنامەکە زۆر بە نهێنی بێت، نووسینگەی بە رنامە سەربازییە تایبەتییەکان بەو ئەرکە هەڵبستێت، ئەوانەش سەرپشک دەبن لەپەیداکردنی فرۆکەی نەفاسەو مووشەک بۆ سوپای میسری، بە پێی راسپاردەکان دەبووایە ئەو چەکانە لەناو وڵاتیش دروست بکریت، بەوەش چیتر میسر پێویستی بەداوای چەک و چەکسازی دەرەوەی وڵات نابێت، بەپێی

راپۆرتە ئیستخباراتیەکانی میسر دە یزانی فە رەنساو ئیسرائیل بۆ سازکردن و دامە زراندنی مووشەک کاردەکەن و بە نهێنی کارەکانیان بە رەو تەواو دەچێت، بۆیە هەردوو وڵات کە وتنە پێشبڕکێ بۆ تە واوکردنی پرۆژەکە. ئەگەرچی ماوە یەکی زۆر شە ڕی دووە می جیهان کۆتایی هاتبوو، رۆلی سە ربازی ئەڵمانیا وەک جاران نە مابوو، بەڵام هێستا بە هرەو زانیارییە زانستییە چەکسازییەکانیان مابوو، کە لیوا خەلیل بەو ئاراستە کاری دەکرد. بەپێی رێکەوتنامەی هە ر چوار وڵاتی براوەی شە ڕەکە (ئەمریکاو یە کێتی سۆڤیە ت و ئینگلتراو فە رەنسا) مەرجی قەدەغەکردنی چەکسازییان لەسەر ئەڵمانیا چەسپاندبوو، نەدەکرا فڕۆکەو مووشە ک سازبکەن، بۆیە چەکسازو پسپۆرانی ئەڵمانیا ناچاربوون بۆ کارو خۆژیاندن لە دەرەوە کارو بوار بدۆزنەوەو بەهرەو کارامە ییەکانی خۆیان بخە نەکار. لەرۆژنامە ئەڵمانییەکان ریکلامی پێویستی کە سانی شارەزا لە بواری چەکسازی لە باکوور ئەفریقیا لەلایەن ئەڵمانەکان خوێندرایە وە، بۆیە ش زوو زاناو پسۆرانی ئەو بوارە بەپیر بانگەوازەکە رۆیشتن.

لەودەمانە لیوا خەلیل لەگەڵ (ویلی میسر سمیث ) بۆندێکی بۆ دروستکردنی فڕۆکە ئیمزاکردبوو، لەدوای ئەو بۆندە کەسێکی میساڵی شیاوی ئە و بوارە یان لە نەمسا دۆزیە وە بۆ بەڕێوەبردنی کارگە کە، ئە ویش (فریناند براندو )ی ئە ندازیاربوو، کە رووسەکان لە رۆژانی شەڕەکە گرتبوویان، ئەوو تیمێکی تایبە ت بەمەرجی دروستکردنی موتۆرێکی رووسی هە مەکار ئازادیان کردبوو، براندوو هاوڕێیە کانی توانیان موتۆرێکی 12 هەزار ئە سپی دروست بکە ن، رووسەکان ئە و موتۆریان بۆ فڕۆکە زەبلاحە گەورە بارهەڵگرە (توبولیف 114)کەیان بەکارهێنابوو، بە وەش رووسە کان ئازادیان کردبوو، ئە و کە ئازاکراوەو دووبارە گەڕاوەتەوە ئەڵمانیا. لەساڵی 1960 فڕۆکە میسرییەکان لە کارگەکانیان لە قۆناخی تەواوبوون دابوون، کە لەکارگەی ژمارە 136 لەنزیک قاهیرە سازدەکران، لە تەنیشت ئەو کارگە یەش کارگە یەکی داڕشتن و دیزاینی فڕۆکە کەش بە ناوی کارگەی ژمارە 135 دامەزرابوو، هاوشانی ئە وانەش دروستکردنی مووشە کیش بە رەو تە واوبوون دە چوو، کە زانراوە پیشەسازی نهێنی ئیسرائیلی فەرەنسی هە نگاوی باشی بڕیوە ، میسرییە کانیش بە بەرنامە یەکی زۆر نهێنی قۆناخی باشیان دەبڕی، کارگەی ژمارە 333 تایبەت بوو بە دروستکردنی مووشە ک، کارگە کە لەناوچەیەکی نیشتەجێی نوێی شارۆچکە ی نصربوو، میسرییە کان بە هەموو شێوە یەک کاریان دە کرد، بە هیچ شێوەیەک زانیاری لە سەر ئە و کارگە و ئە و بە رنامەیە نەچێتە دەرەوە، بە وەش پرۆژە کە سەرکەوتنی باشی بەدەست هێنا.

لەشاری شتوتگاردی ئە ڵمانی ئامۆژگایە کی حکومی پسپۆر لە توێژینەوەی ئە ستێرە دەستکردەکانی ئاسمان کارکەربوو، زاناکانی ئەو ئامۆژگایە شەرمیان دەکرد کە هەستیان دەکرد، لەسەردەمی پاش شە ڕەکە حکومەتەکەیان لە بواری زانستی و چە کسازی ئاسمانی بوویتە پاشکۆی ئە مریکاو یە کێتی سۆڤیە ت، نائومێدبوون و هیوایان بە بەرنامەکانی خۆیان سست و لاوازببوو، بۆیە زۆر چاویان لەکارکردن و ئەفراندن بوون، بەڵام حکومەت بەهیچ جۆرێ بواری نەدەدان زاناکانیان لە دەرەوەو بەرامبەر بەپارە توێژینەوەو کاربکەن، بەڵام کە لیوا خەلیل لەسەر

راسپاردەی حکومە تی میسری دانوستانی لە گەڵ سە رۆکی ئامۆژگاکە کردبوو، پێشنیاری پارەیەکی باشی بۆ کردبوون، سە رۆکی ئامۆژگاکە (ئایوجین سانجر) بڕیاری دابوو، ژمارە یەکی زۆری زاناکانی بۆ وە رگرتنی پارە زۆرەکە کار لە میسر بکەن، لێرە مۆساد توانی زوو زانیاری باش لەسەر ئەو زانایانە وەرگرێت، پێش گەیشتنیان بەو وڵاتە، مۆساد زۆری لەسەر ئەو زانایانە کۆدەکردەوە، بەڵام مۆساد وایدەزانی ئەوانە لە بواری فڕۆکەسازی میسری کاریان بۆ دەکەن.

میسر وای بڵاودە کردەوە کەوا هە ردوو کارگەی 135و 136 فڕۆکەسازی مە شق و ڕاهێنان دروستدە کەن، بە ڵام موخابە راتی ئیسرائیلی گە یشتبووە ئەو راستیە یەی کە وا میسرییەکان بە شێوازێکی نوێی و بە داهاتێکی هاوچەرخانە فڕۆکەی نە فاسەی سە رکەوتووی شەڕکەری زۆر کاریگەر بەرهەم دەهێنن.

لەساڵی 1961 مۆساد زانیاری زۆری لە سەر پرۆژە کانی میسر کۆدە کاتەوە، دە یزانی ئامۆژگای شتوتگارد لە میسر چە ندو چۆن زاناکانی رە وانەکردووەو ئە وانە خەریکی چیین، بۆیە حکومەتی ئیسرائیل بە شێوەیەکی رە سمی و لە سەرئاستی دبلۆماسی نامە ی ناڕە زایی ئاراستە ی حکومەتی ئەڵمانی کردبوو، پاش ئە و نامە یە رەسمییە حکومەتی ئەڵمانی فشاری کردبووە سەر سەرۆکی ئامۆژگاکە بۆ کۆتایی هێنانی بۆندی کارە کەیان لە میسر، کە حکومە تی ئە ڵمانی فشارەکەی لە سەر زاناکانی خۆی توندکردووە ، زۆر لە زانا ئە ڵمانە کارکەرە کانی ناو میسر دەستیان لە دەستەی ئامۆژگە کە کێشاوەتەوەو وە ک زانای تاکە کەسی لە و کارگە میسریانە ماوەنەتەوەو لەسەر داهێنان و بەرهەمەکانیان بۆ حکومە تی میسر ماونەتەوە.

مۆساد زانیارییە کی ترسناکی دە سکەوتبوو، کە وا زانا ئە ڵمانەکانی ئامۆژگە کەی شتوتگارد بە دوو ملیۆن مارکی ئە ڵمانی، لە دروستکردنی مووشە کی دوورهاوێژ سە رکەوتنیان بەدەسهێناوە، ئەو پارەیەش چارەکێکی دەدرێتە خودی سەرۆکی ئامۆژگاکە، پارەکەشیان بۆ ئە و لەسەر حیسابە کە دانابوو، مۆسادیش دە یزانی کەوا بۆ پارە رەوانەکردن و ئاڵوگۆڕە داراییەکان لەسویسرا چەند کۆمپانیای وەهمی بانکیان دانابوو، مەبەستیش لەو بانکەش ئاسانکردنی پارەدان و گە یاندنی پارەبوو، هە ر ئە و کۆمپانیایە وەهمیانەش جۆرەها کە رەستەی پێویستیان دە گەیاندە میسر. بەڵام لەناو بەڕێوەبەرانی مۆساد زۆریش بڕوایان نەدەکرد، کەوا بەراستی میسر نیازیەتی مووشەکی بە و جۆرە دوورهاوێژانە بەرهەمبهێنێت، بە ڵام کە زانرا دکتۆر سانجری سە رۆکی ئامۆژگەکە بەراستی بە رنامەی وایە ئامێری سوتە مەنی شلی تایبە ت بە مووشەکی نوێیان بۆ تاقیدەکاتەوە، کە کێشییان لە چوار تۆنە وە تا بیست تۆن دە بێت، ئە وەش شێوە ی ناوە ندەی مووشەکە کۆنە ئەڵمانیەکانی ناسراو بە ڤی 2، یان مووشە کە نوێیە فەرەنسییە کانی جۆری (ڤیروتیک)ە. مۆساد بۆ وە رگرتنی هە موو زانیارییە گرنگەکان شکستی هێنابوو، موخابە راتی میسری توانیبووی کارە کان بە نهێنی بهێڵێتە وەو هیچ جۆرە زانیاری و بە رنامەیەکیان ئاشکرا نەبێت، کەراستەوخۆ لەلایەن سەرۆک جەمال عبدالناسر سەرپەرشتی دەکرا. بۆیە بەو شکستە ئیسرائیلییەکان چۆکیان شکابوو، کە بەرنامەکەش کۆتایی هاتبوو زۆرتر تووشی شۆک هاتبوون، کە بینیان سە رۆک جە مال ئاهە نگی سازکردنی 20 مووشەکی داپۆشراو بە ئاڵا میسری لە

نمانشێکی سەربازی لە ساڵی 1962 نیشاندا سەرسام دەبن، ترسیان لێ دە نیشێت، بۆیە بن گۆربون هاوار دەکاتە سەر سەرپەرشتکارەکانی موخابەرات.!

****

## زانیاری ترسناک

لەماوەیەکی کورتدا دە زگای موخابەراتی ئیسرائیلی هە موو لقە کانی خۆی بە گەرمی خستووتەکار، لەبەر رۆشنایی بەڵگەکانی دەستیان، ئەوان کەوتە کارو پشکنین، بەڵگەنامەکەش نامەیەکی پرۆفیسۆر (بیلز)بوو، ئە وەی پاش دکتۆر (سانجر) ئەرکی پرۆژە میسرییەکان وەرگرتبوو، نامەکە بۆ (کامل عزب)ی بەرێوەبەری کارگەی ژمارە 333 نوسرابوو، کە مێژووی رۆژی 24ی مارسی ساڵی 1962ی لە سەربوو، تێدا پرۆفیس ۆرەکە داوا لە بەرێوەبەرە میسرییەکە دەکات سێ ملیۆن و 700 هەزار فرنگی سویسرییان بۆ دابین بکات بۆ کرینی کەرەستەی 500 مووشەکی جۆری 2و کەرەستەی 400 مووشەکی جۆری 5.

سەرۆکی مۆساد زوو زانیاری ناو نامە کە دەگەێنێتە سەرۆکی حکومەت بن گۆریون، لێرەدا ناکۆکی دە کەوێتە نێوان (ئایسر هاریل)ی سەرۆکی مۆسادو (مائیر ئامیت)ی سەرۆکی موخابەراتی سە ربازی، کە ئەو راپۆرتێک بۆ جێگری وە زیری بە رگری شیمون بیریز بەرزدەکاتەوە، ئەویش هەڵمەتێک بەرووی سەرۆک حکومەت بن گۆریون رادە گەێنێت، بەڵام ناکۆکییەکە وەک هەواڵ و زانیارە کە گەرم نەبوو، یان ئە وان پاش ئە و زانیارییە ترسناکە چ بکەن، چۆن بە گەرمی کاربکەن تا میسرییە کان کارە کانیان تەواو نە کەن، بە تەواوکردنی ئە و پرۆژەیە مووشەکەکانی ئیسرائیلی کە ساڵی پار نمایشیان کردبوو، شکست دەهێنێت، کە بە هاوکاری فە رەنسییەکان سازیان کردبوو، مۆسادو موخابە رات ناکۆکبوون لە سەرئەوەی میسرییەکان هێشتا زۆریان ماوە بەرنامەکە باش سازبێت، مۆساد وایدەزانی مەترسییەکە نزیک بوویتەوە، لەولاشەوە موخابەراتی سەربازیی وایدەزانی میسرییەکان ماوەی چەند ساڵیان ماوە تا ئەو بەرنامەیە سازدەبێت، بۆیە ئیسرائیل کات و بە رنامەی زۆری چارەسەری ئەو دۆسیەیەی لەپێشە، بۆ بنبڕکردنی پرۆژە میسرییەکەو بواری میسری بۆ دە ستکەوتنی ئە و چە کەیان لەباردەچێت. لەبەر رۆشنایی مۆساد سە رۆکی حکومەت بن گۆردیون داوای لێکرابوو خۆی و راستەوخۆو زۆریش بە پەلە داوا لە راوێژکاری ئە ڵمانی خۆرئاوا (کۆنراد ئادیناور ) بکات، بەزووترین کات فە رمان بە کارمەندە ئەڵمانەکانی ناو میسر بدات، لە وڵاتەکە دەربچن، واز لە پرۆژەی مووشە کەکان بهێنن، ئە گەرنا پە یوەندییە دبلۆماسییەکانیان لە گەڵ ئە ڵمانیا هەڵدەوەشێتەوە.

پرسیارەکەش لە وەدابوو، ئە گەر ئە ڵمانەکان بە و نامە یە لە میسر دە رنەچوون، ئە گەر وازیان لە بەرنامە مووشەکییەکەی میسرییەکانیان نەهێنا، چارە چییە...؟

ئیسرائیلییەکان بیریان لەوە دەکردەوە پەیوەندییەکانیان لەگەڵ ئەڵمانیا تێکنەچێت و بەرنامەکەشیان پێراگرن، بۆیە بیریان لەوەکردەوە جۆرێکی تری فشار لە گەڵ ئەڵمانەکان بەکاربهێنن، شیمون پیریز نامە یەکی بۆ (فرانک جوزیف شتراوس ) وەزیری بەرگری ئەڵمانی نووسیبوو، تێدا باس لە مەترسییەکانی بوونی زانا ئەڵمانییەکان لە میسری بۆ کردبوو، دەبێ ئەڵمانەکان بزانن کەوا ئیسرائیلییەکان ئاگادارن حکومەتی ئەڵمانی بە کارکردنی زاناکانیان لە میسرو سازکردنی کارگە مووشەکەکان دەزانن، دەزانن کەوا زاناکان یارمەتی یەکێتی سۆڤیەت و میسر دەدەن بۆ رووخانی ئیسرائیل.

****

مۆساد تەنگاودەبێت

مۆساد ترسی گەورەی لە مەسەلەکە هەبوو، کێشەی نێوان سەرۆکی حکومەت و ئەفسەرە گچکەکانی پەروەردەی بندەستی ئەو، وەک (شیمون پیریز)و (موشی دیان)و سەرۆکی موخابەراتی سەربازی هەر گەرم بوو، ئەوان دەیانویست ئیسرائیل بە زووترین کات یارمەتی ئەوروپاییەکان بۆ بەدەستهێنان و پەیداکردنی چەکی ناوەکی دەستەبەربکەن، دەبێ ئیسرائیل لەسەر قەیرانەکەی یارمەتی ئەڵمانەکان بۆ میسر، پەیوەندییەکانیان لەگەڵ ئەڵمانیا تێکنەدەن و کۆشش بکەن دۆستایەتییەکەیان بەردەوام و گەرم بێت، چونکە دەوڵەتی ئەڵمانیا زۆری لەبارە یارمەتی باش و زۆری ئیسرائیل بدات، لە ودەمانەش مۆساد سازو ئامادە بوو بۆ پەیداکردنی زانیاری زۆرتر لە سەر بەرنامە مووشەکەکانی میسری. سەرۆکی مۆساد دەیویست بەهەموو شێوەیەک موخابەراتی سەربازی خۆیان تێبگەیەنێت کەوا بەرنامەکەی میسری راستەو دوارۆژی ترسناکە، بۆیە دەبێ ئەو بەرنامەیە راگیرێت، تا مانگی سپتەمبەری ساڵی 1962 سەرۆکی مۆساد گەیشتە ئەو قەناعەتەی کە یەکێک لە بەکرێگیراوانی مۆساد سازبکات کە بتوانێت زانیارییەکەیان لەسەر بەرنامە میسرییەکەیان بۆ پەیدا بکات، بەوەش دەزگاکانی پەیوەندار بەو هەواڵە تووشی هیستیریابوون، بۆیە موخابەراتی ئەمریکی هاتنە ناو بازنەکەو دەستی یارمەتیان بۆ مۆساد درێژکرد بۆ پەیداکردنی زانیاری زۆرتر لەسەر بەرنامە میسرییەکە، ئەوەو لەلایەکی تر بەکرێگیراوانی مۆساد لە ناو میسر کەوتبوونە خۆسازکردن بۆ کۆکردنەوەی زۆرترین زانیاری لەسەر بەرنامەکە، ئەمریکاش لەلایەن خۆیەوە فشاری خستبووە سەر دەوڵەتی میسر بۆ ئەوەی پیشەسازییە سەربازییە پێشکەوتووەکانی چاودێری لەسەربێت و پشکنینیان بۆ بکرێت.

کە ئیسرائیلییەکان تێگەیشتن نامەکەیان بۆ راوێژکاری ئەڵمانی بۆ رۆیشتنی زاناکانیان لە میسر سوودی نەبوو، سەرۆکی مۆساد ئایسر هاربل بیری لە چارەسەرییەکی تر کردەوە، بەرنامەیان دانا، هەڕەشە لە زانا ئەڵمانەکان بکرێت و بیانترسێنن، یان هەر رێگایەکی تر هەبێت بیگرنەبەر، بۆیە ئەو وتبووی:

(هاتنی ئه و زانا ئه ڵمانیایانه ماناى هاتنیانه بۆ به رەی پێشه وەی به رەکانی جه نگ بەرووی ئێمە، هاتنیانه بۆ سەرهێڵی ئاگر).

قسەکانی مۆساد ئه وەی ده گەیاند،کەوا سه رۆکی مۆساد ئامادە یە پلانی کوشنیان دابنێت، بۆیه ش موخابه راتی سه ربازییان ئامادەبوو پلانی وردو به رنامەی چاک بۆ ئه و پلانه دابنێت، ناویان له چالاکییه‌که نا (نەبەردییەکەی دامۆکلیس)، مەبەستیش شەڕکردنی بەرنامەی مووشەکی میسری بوو بۆ شکان و سەرنەکەوتنی پرۆگرامەکەیان. هەموو زانیارییەکانی ناو میسر لەلایەن کەسێکی ئەڵمان بوو، ئەویش (وولف گانگ لۆتز)بوو، ئەو لەساڵی 1960ەوە موخابەرات ئەو پیاوەی بەبیانوی بازرگانی ئه سپی عەرەبی رەوانەی ناو میسری کردبوو، ئه و جۆره کارەش دەبووایه کەسەکە کێڵگەی تایبەتی بۆ ئەسپە عەرەبییەکانی هەبێت، ئەویان لەناو ئەڵمانیاوە بەو کاره راهێنابوو، ماوەیەکی زۆریش له تەلئەبیب مەشق و راهێنانیان پێکردبوو، ئەو وەک پیاوێکی دەوڵەمەند هەڵسوکەوتی دەکردو پارەی زۆری سەرف دەکرد.

لۆتز پیاوێکی ئه ڵمانی جووله‌کەبوو له ساڵی 1921 لەدایک بووەو له گەڵ دایکی له ساڵی 1933 سەفەری ئیسرائیلی کردبوو، له گەڵ هەڵگیرسانی شه ڕی دووەمی جیهان چوویته ناو ریزه کانی سوپای بریتانی، ماوه یەکی زۆری خزمه تیه سەربازییەکەی له میسرو له باکووری میسرکردبوو، بێجگه له زمانی عبرییەکەی عەرەبی و ئینگلیزیشی باش زانیبوو، پاشان چوویته ریزی سوپای ئیسرائیلی، له شەڕەکانی ساڵی 1956 شەڕی میسری کردووەو پلەی میجوری له سوپای ئیسرائیل وه رگرتووه، له ساڵی 1960 به پاسپۆرتێکی ئۆرجناڵی ئه ڵمانی سه ردانی قاهیرەی کردووەو بوویته یەکێک له ئەندامانی تۆڕی مۆساد لەمیسر.

لەناودڵی قاهیره و له الجزیرة خه ڵکی زۆر له ئەسپسواری راهێناوه، ئه ودەمانه لیوا (یوسف علي غراب ) سەرۆکی شانازی یانه ی ئه سپسوارییەکەبووە، ئه و ئه فسەره بەرپرسی یەکەمی هێزی پۆلیسی میسری بووە ، بۆیه ش ده سەڵاتێکی به هێزی بێسنووری هه بوو. پاش شەش مانگ مانه وەی له میسر موخابه راتی ئیسرائیلی بانگی ده کاتەوەو ناوی (ئەسپ)یش دەبێته ناوی نهێنی ئه و له و دەزگایەدا، له و سه فەرەدا ده گاته ئەوروپا له وێ راپۆرتێکی ته واو دەداته سەرۆکی مۆساد، که ئەو به تایبەتی بۆ دیمانه ی ئه و هاتبووه ئەوروپا. مۆساد پارەیەکی زۆری له لۆتز سەرەفدەکرد، ئەویش هیوای گەورەی ئیسرائیلییەکان بوو بۆ وەرگرتنی زۆرترین زانیاری لەسەر بەرنامەی مووشەکانی میسری.

چالاکییەکەی ئه ویان ناونابوو نه بەردییەکەی (داموکلیس)، که مۆساد بۆ راونانی زانا ئەڵمانییەکان دایڕشتبوو، تا ئه وان به زووترین کات وڵاته که جێبهێڵن، ئەوەشیان تاکه بەرنامەو چارەسەری بوو بۆ پووچه ڵکردنی به رنامه سەربازییەکەیان، بڕیاریش بوو ئه گەر به کووشتنیش

بێت، بەرنامەکە جێبەجێ دەکەن، دەبووایە لۆتز یان ئەسپەکە راپۆرتی دروست بداتە مۆساد، وەک زاناکان کێن؟ لە کێ نیشتەجێن؟ لەگەڵ کێ تێکەڵ دەبن؟ بەدروستی کارو بەرنامەی رۆژانەیان چییە؟ بەو بەرنامەیە میسرییەکان دەگەنە کێندەرێ؟

****

سەرۆک وەزیرانی ئیسرائیلی (دیڤید بن گۆریون) راستەوخۆ سۆراخی هەواڵ و چالاکییەکانی (وولف گانگ لۆتز)ی دەکرد، لەبەر ئەوەرکەی پێیراسپێردرابوو، دەکرێ بووترێت ئەو ترسناکترین جاسووسی مۆسادبوو، نەک لەبەرئەوەی سۆراخی بەرنامە مووشەکییەکانی میسری دەکردو بەس، چونکە پارەیەکی زۆریشی لێ سەرفدەکرا، لەبەرئەوەی لەجەرگەی قاهیرەش بوو، بۆیە مەسروفاتی زۆربوو، چونکە کارو بەرنامەکەی وا بوو، دەبووایە پارەیەکی زۆریشی تێدا سەرف بکات.

ئەو لەگەڵ ژنەکەی بە ناوی بازرگانی ئەسپ هاتبووە قاهیرە، زوو چەندین کەسی لەیانەی ئەسپسواری میسری لە قاهیرە ناسیبوو، لەمۆسادەوە داواکرابوو ئەو دۆستایەتی لەیانەی (الجزيرة)ی وەرزشی پەیدابکات، لەبەرئەوەی شەوان و لە داوەتەکانیدا پارەی زۆری سەرف دەکرد، بۆیە دەکرا زۆر کەسایەتی ناودار بناسێت، بەوەش هەواڵ و زانیاری زۆریش دەبیسێت، بەوەش سەرەداوی گەڕان بەدوای زانا ئەڵمانەکانی ناو میسری دەستدەکەوێت، کە گەیشتە ئەڵمانەکان دەتوانی نامە هەڕەشەکانیان بگەیێنێت، دەبووایە بە نامەی تایبەتی لەناو میسرەوەو بە پوولی پۆستەی میسرییش نامەکانیان بۆ رەوانە بکات، لەنامەکاندا حاڵییان بکات مانەوەیان لە میسر هەڕەشە لەسەر ژیانتان دروستدەکەن. لەبەرئەوەی لۆتزی ئەڵمانی رۆژانە لەیانە وەرزشییەکە هەر خەریکی کاری بازرگانی و مامەڵەی ئەسپ بوو، بۆیە کەس گومانی ئەوەی لێ نەدەکرد، ئەو پیاوە ئارەزوو و کاری سیاسی لە خەیاڵدا بێت، یان بایەخ بەهیچ مەسەلەیەکی سیاسی بدات.

پاش ئەوەی دەستی بەکارەکانی کرد، توانی 50 نامەی هەڕەشەئامێز ئاراستەی زانا ئەڵمانەکان بکات، وەک چۆن مۆساد بۆی دادەنا، ئەو بەو شێوەیە کاریکردووە. مۆساد نامەکانی هەموو بەیەک شێوازو بەیەک شێوە دارشتن دەنارد، نامەکان دەگەیشتە هەموو ئەڵمانەکان، بۆیە ژیانیان مەترسی گەیشتێ و بەناچاری پاسەوانیان بۆ دانرا، حکومەتی میسری ئەرکی وردی پاسەوانی هەموویانی بەباشی دەکرد، خۆشیان لە ترسان و بۆ خۆپاراستنیان دەمانچەی تاکەکەسیان دەبەستا.

پیاوێکی پارەداری میسری بە ناوی (حسان كامل) لە ئەڵمانیاوە کەرەستەکانی دروستکردنی مووشەکەکانی لە سویسراوە دەگەیاندە میسر، رۆژێکیان بەنیازبوو سەفەری ئەڵمانیا بکات، بەنیازبوو بەفڕۆکەی تشارتر سەفەر بکات، کە لەدوورگەی (سیلیت) لە دانیمارک بفرێت بەرەو دۆسلدۆفی ئەڵمانی، بەڵام لەدوا ساتی سەفەرەکەی بیرە سەفەرەکەی گۆڕیبوو، لەجیاتی خۆی ژنە ئەڵمانەکەی ناردبووو، ئە و سواری فڕۆکە کەبوو، لە ئاسماناو لە ناکاوا فڕۆکە کە

دەتەقێتەوە، فڕۆکە وانەکەو ژنە کە دەکوژرێن، بە وەش یە کەمین کووشتنی ئە ڵمانەکان دەستپێکردو سەرەتا کۆششی مۆساد بۆ پووچکردنەوەی بەرنامە میسرییە ئەڵمانیاییەکە دەستی پێکرد.

****

بەرنامەی کووشتنی کەسە ناودارەکان

لەمانگی سپتە مبەری ساڵی 1962 حکومەتی ئیسرائیلی فە رمانی بە سەرۆکی موخابەرات (ئایسر هاریل)دا بە دەستپێکردن بەکووشتنی ئەڵمانەکان و جێبەجێکردنی دواقۆناخی بەرنامە نهێنیەکەیان، کە بەناوی (داموکلیس) دەناسرا. لەسەعات دەو نیوی بەیانی رۆژی 11ی سپتەمبەری ساڵی 1962 پیاوێکی رە ش لە نووسینگەی (ئەنترا)،کە نووسینگەی سە رەکی بەرنامەی مووشەکە میسرییەکان بوو لە شاری میونشن لە بەرێوەبەرەکە دکتۆر (هێنز کرۆگ) دەچێتە ژوورەوە، پاش ئە وەی پیاوە کە ماوەیەک لە گەڵ بەرێوەبەرەکە دەمینێتەوە، پاش 24 سەعات ژنی بە ڕێوەبەرەکە پەیوەندی بە پۆلیس دە کات کە وا پیاوە کە نەگەڕاوەتەوەو هیچ شوێنەواریشی دیارنییە، پاش دوو رۆژ ئوتومبێلە کەی دۆزیوتەوەو پۆلیس لە کەسێکی نەناسەوە تەلەفۆنێکی بۆ دەکرێت، کەوا پیاوەکەیان کووشتوە.

لەبەیانی رۆژی 27ی نۆڤمبەری ساڵی 1962 ژنە سکرتێرەکەی دکتۆر (بیلز) گەورە زانای ئە ڵمانەکان لە کارگەی 333ی جە نگی میسری، نامە یەکی رە وانەکراو لە لایەن پارێزەرێکی گەورەو ناسراوی شاری هامبۆرگی ئە ڵمانی دە کاتەوە، بە کردنەوەی نامە گەورەکە یەکسەر بە رووی ژنە سکرتێرەکە دەتەقێتەوە، لە بەر برینە سەختەکانی رەوانەی نە خۆشخانە دەکرێت. بۆ بە یانی نامە یەکی گەورەی تر لە هامبۆرگەوە ئاراستەی ئیدارەی گشتی کارگە ی جەنگی 333 دەکرێت، کە لەسەر بەرگەکەی نووسرابوو (کەرەستەی تایبەت)، کە فەرمانبەرە میسرییەکە ئیدارەکە نامەکە دەکاتەوە یەکسەر بەرووی دەتەقێتەوە، لە تەقینەوەکەدا 5 کەس دەکوژرێن، کە پۆلیس لە ئەدرێسەکە دەکۆڵنەوە بۆیان دەردەکەوێت ناوی شوێنەکەو کەسەکە ساختەن. لە رۆژی سێیەم دوونامەی گەورە لە شاری شتوتگارتی ئە ڵمانیاوە دەگاتە کارگەی 333، بەڵام دەسەڵاتدارانی ئاسایش لە مەسەلەکە گەیشتبوون، بۆیە نامەکان دەکەنەوەو مادە تەقینەوەکە دەردەهێنن و لە کاری دەخەن. لە 23ی مانگی فبرایری ساڵی 1963 ئوتومبێلێک لەبەردەم ماڵی دکتۆر (هانز کلینواتشر)ی پسپۆری ئە لکترۆنیاتی ئەڵمانی دەوەستێت، کە ئەو زانایە لە ئامێرەکانی ئاراستەکردنی تایبەتی مووشەکە میسرییەکان کاری دە کرد، کە ماڵەکەی لە دەڤەری لۆراشی ئەڵمانیای خۆرئاوابوو، سێ کەس لەناو ئوتومبێلەکە دابوون، وەک چۆن هانز لەپێش پۆلیس وتبووی:

(یەکێک لە نەفەرەکانی ناو ئوتومبێلە کە لەلای من دابە زی و لە کەسێکی ناو (شینکر)ی پرسی، هێشتا من وەڵامی ئەوەم نەدایەوە، کەوا لەو دەڤەرەی ئێمە کەسێک بەو ناوە نییە، پیاوە نەناسراوەکە دەمانچەیەکی بێدە نگی دە رهێناو بە رووی سینگی منی تە قاندەوە، خۆشبەختانە گوللەکان تەنیشتی پەنجەرەکەی گرت و کەمێ برینداری کردم).

شەڕە موخابەراتیەکانی نێوان ئیسرائیل و میسر گە یشتە قۆناخێکی خوێناوی، ڕۆژانە سەرۆک وەزیران بەبۆنەی کووشتنی یەکێکی تر پیرۆزبایی و دەستخۆشی گەرمی دەناردو لەگەڵ پیرۆزباییەکان زۆرتر پیاوە کانی هاندەدان، تا بکارن جە مال عبدالناسر پیشە سازییە مووشەکانی ڕاگرێت، ئە گەرنا میسرییە کان قوربانی زۆردە دەن. بەرنامەی کووشتنی ئە ڵمانەکان پیشەسازییەکەی نە وەستاند، ئەڵمانەکان میسریان جێنە هێشت، زۆریش کوژران، زیانی گیانی زۆر کوشندەیان پێکەوت، بەڵام بەرنامەکە نەوەستا، بۆیە سەرۆکی ئیسرائیلی هانی دە زگاکانی خۆی دەدا لەو بەرنامەیە بەردەوام بن، ڕانەوەستن، چونکە ئەگەر مووشەکەکان تەواو سازبوون کەس ناتوانی لە بەکارهێنان و هاویشتنیان ڕایانگرن، سەرۆک بە سەرۆکی مۆسادی وتبووی:

هێشتا کارەکانیان سازنەبوو، دەستیان لێ بە وەشێنن. بۆیە وا باشە ئیسرائیل بڕیاری ترو پەیرەوی بەرنامەیەکی تر بکات.

ئایسر هاریل سە رۆکی مۆساد پە یوەندی بە هاوڕێیەکی خۆی لە نەمساکردبوو، هەروەها پە یوەندی بە بەکرێگیراوێکی موساد بە ناوی (ئۆتوگو کلیک )کردبوو بۆ سازکردنی چالاکییەکی تر، کار بکات فشار لە سەر زانا ئە ڵمانەکان زۆرتر بکە ن، لە وانە پروفیسۆر (بۆل گۆرگ)ی گە ورە زاناکانی ئەڵمان لە کارگەی 333ی جە نگی لە قاهیرە. بەپێ زانیارییە کانی مۆساد ئەو زانا ئە ڵمانە کیژێکی بەناوی (هایدی) هەیە، کیژەکە پارێزەرەو لە شاری فریبیرگی سەرسنووری سویسر ی کاردە کات، ڕۆژێکیان هایدی لە ڕێگای گە ڕانەوەی ماڵە وەی بوو، کە کلیکی بەکریگیراوی مۆساد لەو نزیک دەبێتەوە، چەند وشەیەکی هەڕەشەئامێزی بە گوێیەکانی دەچرپێنێت و دەڕوات، قسەکانی خۆی بەخێرایی دەکات، ئەو بەنەرمی بە کیژەکەی وتبوو:

(باوکی تۆ لە بەرنامەی مووشە کسازی میسری کاردە کات، موخابە راتی ئیسرائیلی ئەوانە زۆر چاک دە زانێت و سووریشە لەسەر لە باربردنی ئەو بە رنامەیە، ئامادە شە بەهەموو نرخێک ئە وە بکات، ناوە ستێت تا هە ڕەشەکانی جێبە جێ نە کات، ئامادە شە کارمەندان بە کووشتنیش بێت لە کارەکان ڕاگرێت).

کە کیژەکە ئەو قسە توندە دەبیستێت، زۆر دە ترسێت و شۆک دە یگرێت، بۆ سەڵامەتی باوکی گریانی دێت، بەڵام پیاوەکەی مۆساد بە کیژەکەی وتبوو، باوکت دەتوانی ژیانی

خۆی بکرێتەوەو بژیت، ئەگەر ئەو فشاری دەست لەکارهەڵگرتن لەگەڵ باوکی بە کاربهێنێت، ئەگەرنا باوکت لە بەرنامەکەی ڕەشکردنەوەی ئیسرائیل کە سەرۆکی میسری پەیرەوی دەکات بەشداری دەکات، ئەوە خۆی دەبێتە هۆکاری لەناوچوونی و کۆتاییەکەی ماتەمیندار دەبێت. بۆ جاری دووەم پیاوە کە پەیوەندی بە کیژەکە دەکاتەوەو پاش چەند ڕۆژێکی تر بە کیژەکە دەڵێتەوە:

(ئەگەر تۆ بە ڕاستی باوکی خۆت خۆشدەوێت، وەرە هوتێلی (سێ پاشاکە) لە بازل لە سویسرا، من لەڕۆژی شەممەی داهاتوو لە دووی مانگی مارس و لە سەعات چوار چاوەڕوانت دەبم، لەوێ ئەو کەسانەت نیشاندەدەم، کە کار بۆ ڕاگرتنی باوکت لەو کارەدەکەن).

باوکی هایدی ژمارەی تەلەفۆنی برادەرێکی خۆی دابووە کیژەکەی، برادەرەکەی کۆنە ئەفسەری سوپای ئەڵمانی بوو، ماوەیەکیش لە بەرژەوەندی سوپای میسری کاریکردووە، ئەویش کە هەواڵی کیژی برادەرەکەی زانیبوو پەیوەندی بە پۆلیس کردبوو، هەردوو تۆڕی پۆلیسی ئەڵمانی و سویسری کە وتنەخۆ بۆ گرتنی ئەو تۆڕە کارکەرەی مۆساد کە بۆ بەرژەوەندی ئیسرائیل کارکەرن. پۆلیس کۆششی زۆری کردبوو، کە بکوژانی کووشتارەکانی ناو ئەڵمانیا بدۆزێتەوە، بەلام هیچی دەستنەدەکەوت، بەلام پاش ئەوەی لە مەسەلەی کیژەکە پۆلیس ئاگاداردەکرێتەوە، پۆلیسی سەرسنوور توانی ئیتوگو کلیک بناسێت، هاوکاتیش پۆلیس بەوردی لە سنوورەکان چاودێری هەر کەسێکی دەرکرد کە بێنە ناو وڵات، لەیەکی مارسی ساڵی 1963 لەناو ئیتالیاوە کەسێکی ئیسرائیل بەناوی نوێنەرە وەزارەتی خوێندنی باڵای ئیسرائیل گەیشتە ناو ئەڵمانیا، ئەوانیش بەوردی چاودێریان خستبووە سەر، تا میوانەکە کە ناوی (جوزیف بن گال)بوو، گەیشتە هوتێلی ناوبراو.

بۆ بەیانی هایدی لەکاتی دیارکراودا لەگەڵ برایەکی گچکەی و پیاوێکی ترکە بەناوی برادەر گەیشتە هوتێلەکە، لەولاشەوە پۆلیسی سویسریش هەموو کارێکی بۆ وەرگرتنی زانیاری لەو دانیشتنە چاوەڕوانکراوە کردبوو، لە ژێرمێزی دانیشتنەکەیان ئامێری تۆمارکردنیان چەسپاندبوو، چەندین کەسی نەناسراوی پۆلیسیش لەسەر مێزەکانی نزیک ئەوان دانیشتبوون و چاودێری قسەکانیان دەکرد، لەدەرەوە پیاوانی پۆلیس خۆیان سازکردبوو، پیاوەکەی مۆساد کە بەناوی کارمەندی وەزارەتی خوێندنی باڵا گەیشتبووە شوێنەکە، ئەو دەست بە جانتاکەی سەفەری دەگاتە شوێنەکەو هەست و گومان بە هیچ ناکات، یەک سەعاتی تەواو لەگەڵ هایدی قسە دەکات، بەڕوونی بە کیژەکەی وتبوو:

(ئێمە وەک مۆساد بە دڕەندەترین شێوە مامەڵە لەگەڵ زانا ئەڵمانەکانی ناو کارگەی 333ی ناو قاهیرە دەکەین، ڕەحم بەکەسیان ناکەین).

سەبارەت بە ڕەوشەکەی ئەو، ئەوان ئامادەن پلیتی بەخۆرایی بۆ ئامادەدەکەن، ئەگەر سەفەری میسر بکات و باوکی رازی بکات بگەڕێتەوەو واز لەو کارە بهێنێت، بەوەش ئەوە خۆی لە زەبرەکەی ئیسرائیل دەپارێزێت.

پیاوەکە ڕەزامەندی لە کیژەکە وەردەگرێت و وەعد دەدات بەباشی بیر لە مەسەلەکە بکاتەوە، پیاوە کە لەگەڵ یاوە رەکەی شوێنە کە جێدەهێلن، بە لام پۆلیسی سویسری بە وردی سۆراخیان دەکات، ئەوان سواری ترێن دەبن و بەرەو زیورخ بەرێدەکەون.

پۆلیسی سویسری بڕیاری گرتنی لە سەر ئەو دەرکردبوو، لەنزیک ویستگەی ترێنەکە ئۆتۆگو کلیک گیرا، لە نزیک قونسلیەی ئیسرائیلیش جوزیفیان گرت، دوو هەفتە هەواڵی گرتنی ئەو دوو کەسەیان بەنهێنی دەهێلنەوە، بەلام زوو هەواڵەکەیان بە پۆلیسی ئەڵمانی ڕاگەیاندبوو، ئەوانیش یەکسەر داوای کە سی دووەمیان کردبوو، چونکە ئەو هەڕەشەکەی لەسەر خاکی ئەڵمانیا لە هایدی کردبوو، ئە و دوو کە سەش بە تومەتی کۆشش بۆ کووشتنی کلاینواتشر داواکراوبوون. گرتنی ئەو دوو کە سە ئیسرائیلییە لە دەرەوەی وڵات بۆ مۆساد زە برێکی زۆر کوشندەبوو، حکومە تی ئیسرائیلی بڕیاری کۆبوونە وەیەکی نائاسایی بە ستبوو، لە وێ وە زیری دەرەوەیان گۆلدا مائیر داوای کردبوو، ئیسرائیل هە ڵمەتێکی نارەزایی لەسەر حکومەتی ئەڵمانی سازبکات، داواکاربوو ئە ڵمانیا تە نگاوبکەن، چونکە ڕێگرە لەوەی ئیسرائیل دە یەوێت زانا ئەڵمانەکان ناچاربکە ن واز لە بەرنامەسازییەکەی میسر بهێنن، کە مووشەکی نوێی بۆ میسرییەکلن و دژ بە ئیسرائیل سازدەکەن.

داواکاربوون ئەڵمانیا پشتیوانی نازییەکان نەکات، کە بەردەوام بۆ بنبڕکردنی جوولەکە کاردەکەن، ئەوەش بۆ ئەوە بوو ئەڵمانیا لەجیاتی داوای دوو گیراوە بەکرێگیراوەکەی مۆساد لە سویسرا بکاتەوەو دادگایان بکات، خەریکی بەرگری دەبێت لەو تومەتەی دووچاری دەکرێتەوە. ئیسرائیل پێشنیاری کردبوو نوێنە ڕێکیان ڕەوانەی لای ڕاوێژکاری ئە ڵمانی (کۆنراد ئادیناور) بکەن، تا ئەو ڕازی بکەن، چیتر ئەڵمانەکان داوای دوو گیراوەکە نەکەنەوە، لەودەمانە سەرۆک بن گۆریون لەکاتی پشوودانی ئاسایی خۆی بوو، بۆیە سەرۆکی مۆساد بۆ گە یاندنی ئەو پەیامە سەردانی سە رۆکی کردبوو، تا نوێنە ڕێکیان ڕە وانەی ئەڵمانیا بکات و لە گەڵ ڕاوێژکارەکە دانوستان بکەن، بەڵام سەرۆک ڕازی نە بوو، ئەو دەیویست مەسەلەکە لەگەڵ ئەڵمانیا نەگاتە قەیران و ناخۆشیی، ئەگەر وابکەین دەست لەکاری یاسا وەردەدین، ئاشکراشە لەودەمانە ئەڵمانیا یارمەتیمان دەدات و جۆرەها چەکی نوێمان دەداتێ و پارەیەکی زۆر کەمیشمان لێ وەردەگرن، ڕەنگە ئەڵمانیاش نایە وێ سە رۆکی میسر لە خۆیان بتۆرێنن، بە وەش بە شێکی زۆر وڵاتانی عەرەبی لەگەڵ ئەڵمانیا تەنگژەیان بۆ پەیدادەکەن.

بەو وەڵام و بۆچوونانە سەرۆکی ئیسرائیلی وەلامی مۆساد داوە تەوەو نە یویست لەو کێشەو لەبارەی گرتنی ئەو دوو پیاوە پەیوەندییەکانیان لەگەڵ ئەڵمانیا بشێوێنن. بن گۆریون لە مۆڵەتەکەی گەڕاوەتەوەو گلەیی لە مۆسادکردبوو، کە ویستبووی لەسەر گرتنی دوو پیاوە کەو بڵاوبوونەوەی هەواڵی مووشە کەکان تە نگژەیە لەگەڵ ئە ڵمانیا دروست بکات، بۆیە سەرۆکی

**مۆساد کە لەلای سەرۆک دەرچووە، یەکسەر دەست لەکارکێشانەوەی خۆی پێشکەشی سەرۆک کردبوو، بە لام سە رۆک قبوولی نە کردبوو، چونکە ئەگەری ئە وە هەبوو، ئە وەیان کێشە کە ئاڵۆزتردەکات و ئە گەری رووخانی حکومە تەکەی لێ دە کەوتەوە، بەڵام سە رۆکی مۆساد راستی مەسەلەکەی بە میدیای ئیسرائیل راگەیاندبوو.**

**بن گۆریون بڕیاریدابوو مائیر ئامیت پۆستی هە ردوو موخابە راتەکە وەرگرێت، موخابەراتی سەربازی و مۆساد، لەودەمانەش کاری سەرەکی مۆساد تەنها چاودێریکردنی پرۆژەو بەرنامە مووشەکە میسرییەکان بوو، دەبووایە لەناو میسر جاسووسێک بدۆزنەوە، زانیاریان لەسەر هەموو گۆشە یەکی میسریان بۆ کۆبکاتەوە، وەک بوونی پروپاگەندەو رەوشی ئابووری خەڵکەکەو کێشەکانی حو کمرانی سە رۆک جە مال. لۆتز یان ئە سپەکە بەردەوام بە بێتەڵەکەی راپۆرتی رەوانەدەکرد، ئامێرەکەی لە شوێنێکی لاچەپی شاراوەی گەرماوەکەی دانابوو، کە هەڵەی تەمەنی کرد هە موو بە رنامەو کارە کانی تێچوو، پاش 4 ساڵ لە کارە شاراوەکانی، رۆژێکیان لە 22ی مانگی فبرایری ساڵی 1965 لەگەڵ ژنە کەی لە مرسی مطرح دە گەڕایەوە، بینی پیاوانی موخابەرات لە پێش دە روازەی ماڵە کەی چاوە روانی دە کەن، لە ناو شوقە کەی خۆی قۆڵبە ستیان کرد، پاش ئە وەی بە وردی پرۆژە کەی جە مال عبدالناسری گە یاندبووە ئیسرائیل، کە لەبەر رۆشناییەکانی راپۆرتە کانی ئە و، ئیسرائیل لە 5ی یونێوی ساڵی 1967 هەموو پرۆژە کەی خاپوور کرد.**

**لۆتز لە 27ی یولیۆی ساڵی 1965 درایە دادگاو بەزیندانی هە تاهەتایی حکومدراو ژنەکەشی بە زیندانی سێ ساڵ حکومدرابوو، کە دیلەکانیش لە نێوان ئە و دوو وڵاتە دەگۆڕدرانەوە، یە کەم کە س ئیسرائیل داوای ئە سپەکەی دە کرد. پاش لێدانە کوشندەکە، ئیسرائیلیەکان گەیشتنە ئەو رایەی کە سەرۆکی حکومەت راستی دەکرد، بەگورزێکی سەربازی پرۆژەکەی میسر لەباردەچیت، پاش لێدانەکە میسر لەزۆر لایەن نیو سەدە گەڕایەوە پاشەوە.**

---

**لەرۆژنامەی (الجریدة)ی کویتی رۆژی 04092008 بڵاوکراوەتەوە.**

# نبیل النحاس.. نێچیرە ئاسانەکە

ئەو جاسووسە بەوە دەناسرا کەوا ئەو ماوەیەکی زۆر کاریکردووە و چاوانی ئاسایش هەستیان پێنەکردووە، گیرانەکەی ئەو مۆسادی بەتوندی هەژاند، بەگیرانی ئەو چەند تۆڕی تری بەکرێگیراوانی مۆساد لەناو میسر دۆزرانەوەو گیران، ئەو لەوماوەیەی کاریکردووە زانیارییەکانی بە لێشاو دەناردو زۆر نهێنی ئاسایشی نە تەوەیی عەرەبی دەگەیاندە ئیسرائیل، نبیل النحاس توانیبووی بەهرەو داهێنانێکی زۆر پەیدابکات، لە کارو بەرنامەکانی جاسووسیەت و کۆکردنەوەی زانیاری و پەیداکردنی کەسانی نوێی لێهاتوو و پسپۆر، کارو پیشەکە لەلای ئەو ببووە وەستایەتی و مامۆستایەتی، لەئەزموونەکەی ئەو کەسانێکی زۆر فێری هونەری خۆشاردنەوەو سەرلێشێواندن بوون، لە و پیاوە هونەری دۆزینە وەو پە یداکردنی زانیاری گە شەیکرد، بۆیە لەدەزگاکانی بڕواپێکردنەوە بڕوای زۆری بەدەستهێنابوو.

ئەوەی زانراوە هەموو کە سێک خاڵێکی لاواز لە ناو کە سایەتی و وجودیدا هە یە، دەتوانرێت لەو خاڵە لاوازەو لەو بۆشاییەوە بەئاسانی بۆی بچیتە ژوورەوەو کەسەکە کۆنترۆل بکەیت، پیاوانی مۆساد زۆر کاریان لە سەر ئە و بنچینەیە کردووە، بە شێوازێکی بەرفراوانیش پراکتیزەیان کردووە بۆ پە یداکردنی کە سانی بە کرێگیراو، ئە وەی شە یدای پارە وسامان بووە، پارەی زۆریان بۆ لە بەردەست داناوە، ئە وەی خە ریکی مێبازی و سێکس بووە ، ژنی نازداریان ناردووتە لای، ئەوەی لە وڵاتەکەی هەراسان و بێزاربووە، دەربازیانکردووە، تا بردوویانەتەوە بەر پەتی سێدارەو بە کووشتنیانداوە. هەندێ جاریش کەسە بەکرێگیراوەکە شارەزانەبووەو نەیزانیوە کەوا کاروانەکە سەختەو سە ری تێدا دە چێت، کە کەوتووتە ناو تۆڕەکە دەرچوونی زەحمەت بووە، بۆیە ملی شۆڕکردووە و بە ناچاری تاکۆتایی لە گەڵیدا ماوە تەوە، لە چیرۆکی پە یداکردنی جاسووسەکان زۆریان بە یەک دەچن، بەرنامەی پەیداکردنیان هاوشێوەیە، ئەگەر ناوو شوێن و جێگەشیان جیاوازبێت، ئەگەرنا شتەکان لەیەک زۆر نزیکن.

لەو بە شەدا باس لە جاسووسێک دە کەین کە ناوی (نبیل النحاس)بوو، ئە و شە یداو عەبدی ئارەزووەکانی خۆی بوو، تا لە ناویاندا خنکا، ئەو بەئاسانی کرا بە جاسووس، ماڵبەتەکەی لە شارۆچکەی حاصبیای خوارووی لوبنانی سە ر رووباری حاصبیانی هاتبوونە کفر شیمای ناوچەی الشویفاتی خوارووی بە یروت، لەوێشەوە بەرەو وڵاتی میسر کۆچیان کردووە ، باوکی لە السویس گیرساوەتەوەو لە میسر ژنی هێناوەو لە ساڵی 1936 ئەو کوڕیان بووە.

****

## گەشتێک بەرەو وڵاتی مەغریب

نبیل شێوەو ئاکاری دایکە میسرییەکەو باوکە شامییەکەی پێوەبوو، لەمناڵییەوە دیاربوو کەوا کەسێکی زیرەکەو لەناو هاوتەمەنەکانییدا بەوە دەناسرا، هەموولایەک دوارۆژی پرشنگدارو سەرکەوتنی زۆریان بۆ ئە و دانابوو، لە زانکۆی قاهیرە کۆلیژی بازرگانی تە واوەکات، بۆ سەرکەوتن و پێگە یشتنەکانی ئە و زۆر چاوە روان ناکات، زوو دە گاتە مەبەستەکانی، دە گاتە پۆستی سکرتێری رێکخراوی میللە تانی ئە فرۆئەسیویی، کە نووسەر (یوسف السباعي ) سەرۆکایەتی دە کرد، ئە و لە سەر تایپە کەی ناواخنی دانیشتن و کۆبوونە وەکانی دە نووسیەوە، لەوشوێنەو بە پێی پێگە کەی خە ڵکی زۆری ناسیووە و پە یوەندییەکانی فراوان بووە ، بە و شێوە یە کەسایەتیەکی مە عقولی بۆ بە رجەستە دەبێت، پاش ماوە یەک مووچە ی مانگانە ی دە گاتە نزیکەی سەد جنیە، کە ئەو مووچەیە لەودەمانە، واتە لەساڵی 1959 پارەیەکی زۆربوو، بۆیەش لەبەر شوێنەکەو پێگەکەشی زۆر پۆشتەبووە، جلی چاک و دەگمەنی لەبەرکردووە.

ئەو لە پەیوەندییەکانی بە رەگەزی مێینە ش دۆستایە تی زۆری هە بووە، تا دە گاتە دۆستایەتیەکی دڵسۆزانە لەگەڵ کیژێکی ئە فریقی بە ناوی (جونایدا رۆنی) لە کوناکری وڵاتی غینیا، ئەو کیژە پەیامنێری زۆر لە رۆژنامە ئەفریقیەکان و جیهانیە کان بوو. ئەوەندەی دیاری زۆری بۆ کیژەکە دەکڕی کەوتە بن قەرزو تووشی قەیرانی ئابووری هات، بۆیە لەبەر قەرزەکانی دەبووایە مۆڵەت لەو رێکخراوە وەرگرێت و لە شوێنێکیترو بەپارەیەکی باشتر کارێک بدۆزێتە وە، بەمووچەیەکی زۆر وەک پەیامنێر لە ئاژانسێکی جیهانی گەورە دادەمەزرێت. یەکەم فەرمان کە پێیرادەسپێرن سەردانی بیابانی مەغریب بکات، داوای لێدەکەن، بەربەرەکانیە نهێنییەکانی نێوان مەملەکەتی مە غریبی و مۆریتانیایان بۆ بگوازێتە وە، کە ناکۆکیان لە سەر ناوچە کانی نێوانیاندا هەیە. ئەو بەو ئەرکە زۆر دڵشادبوو، ئەو کارە نوێیەی زۆر پێ خۆش بوو، لە وێ دەکرێ کیژە دۆستەکەشی جونایدا بدۆزێتەوە، کە ئەو زووترو پێش ئەوەی گەڕاوەتەوە کوناکری، نبیل بەپەلە بەرەو کازابلانکا (دار البیضاء) دەفڕێت، هیوای زۆر بوو لەو گیانبازییەدا خەونی جوان بۆ دوارۆژ ببینێت.

****

نبیل لە یەکێک لە هوتێلەکانی ئە و شارە ، پیاوێکی جوولە کەی مە غریبی دە ناسێت، داوای لێدە کات ئاسانکاری بۆ بکات تا بگ اتە ناو جە رگەی بە ربەرەکانیەکانی ناو بیابانە کەی خوارووی مە غریب، لێیدە پرسێت چۆن دۆڵی (درعة) ببڕێت و بگاتە سەرسنوور، ئە ویش یارمەتی دە دات و پێناسە یەکی باشی دە کات، بە و رێکە وتە جوانە نبیل زۆر سە رفرازدەبێت، زۆرتریش دڵشاددەبێت کە پیاوەکە لە ماڵەوەش خوانێکی باشی بۆ دە رازێنێتەوەو دەعوەتێکی مەردانەی باشی دە کات. لەناو گوڵ و گوڵزاری ماڵە جوولەکەکە، گوڵێکی جوان دە بینێت، کیژە

جوولەکەیەک دەبینێت شێت و شە یدای دەکات، هەستدەکات ئەو هەرگیز نازداری وای لە ژیانیدا نە دیوە، لە بەر شۆخی ئە و کیژە کارو فە رمانەکەی خۆشی لە بیردەچێت، بە راستی دەکەوێتە ناو تۆڕی ئەو نازدارە، دەبێتە خزمەتکارێکی گوێڕایەل، ئەو لەبن دەست و پێی ئە و کیژەی کە دۆستە ئەفریقییەکەی جونایدا لە قاهیرەوە بۆی چاندبوو دەبێتە خاکوخۆڵ، ئەو کە پارەی گیرفانی تە واودەبێت، بە دڵی خە مگینەوە لەو وڵاتە بێگانەیەدا دە سووڕێتەوە، هیوای دەخواست پارە یەکی زۆری هە بووایەو هە مووی لە دۆستەکەی سە رفکردبووایە، نە دەویست (ملیکە)ی دۆستە جوولەکەی جێبهێڵێت، بۆیە ش دۆستە کەی دڵی دەداتەوەو داوای لێدە کات پشووی درێژبێت، هێشتا بواریان لە پێشدا ماوە، رۆژو ساتە خۆشەکان زۆرترن لە دەمە ناخۆش و تەنگەکان.

دۆستە جوولەکەکە داوا لە النحاس دەکات بەیەکەوە سەفەری پاریس بکە ن، لەوێ دەتوانن کاربکەن و دەوڵەمەندیش بن، بواری کارو پارەپەیداکردن زۆرە، ئەویش بێبیرکردنەوەو بێ دوودڵی رازی دە بێت بچێتە پایتەختی رووناکی و جوانی، بچێتە نەواو هەواری جاسووس و خیانەتەکان، لەوێ توندو بە هێزەوە دەکەوێتە ناو تۆڕەکەو بواری دە ربازبوونی نامینێت، ناکرێ دەستی لەو کیژە بەربیت، کە باش تەسلیمی کیژەکە دەبێت، کە کیژەکەش دەزانی پیاوەکە بێ ئەو ناژیت و بە توندی ئەو بەو گرێدراوە، بەئاشکراو بەرروونی بە نبیل دەڵێت، من جوولە کەم، من پابە ندو دڵسۆزی ئیسرائیلم، نبیل لە وەوە تێگەیشت ئەو کیژە جوولەکەیەکی مەغریبییەو زمانەکەی عە رەبی فە رەنسییە، بەڵام وێنەو دیمە نەکە بەشێواویی دە بینی، سە رەرای ئە وانەش ئەو لەگەڵ ئەودا مایەوە، بڕیاریدا بەیەکەوە لە پاریس بژین. ئەو لەوێ خەڵکێکی زۆر دەناسێت، رەنگە کاریش بدۆزێتەوە. کە پێکەوە مانەوە زۆریان قسەکرد، کیژەکە پرسیاری زۆری لەسەر رێکخراوی ئە فرۆئەسیوییەکە هەبوو، لە کەسەکایەتیو ناوە دیارییەکانی ناو رێکخراوە کەی دەپرسی، بەتایبەتی ئەوانەی لەناو کۆمەڵگەی نێونەتەوەییدا سەنگیان هەبوو، پرسیاری دەکرد، تۆ پەیوەندییەکانت لەگەڵ گەورە بەرپرسە میسرییەکان چۆنە، چەندیان دەناسی، چۆنیان دەناسی، ئەو قسانە و هە موو دیمانە کان تۆمارده کران، وێنە یان دە گیرا، وە ک چۆن پاشان لە گەڵ مۆسادیش هەموو هەڵسوکەوتەکانی وێنەی دەگیرا.

ئەفسەرێک بەناوی ( باسکینر) لەلایەن مۆسادەوە بۆ دەراسەتی رەوش و کەسایەتی و هەڵسوکەوتی نبیل تە رخانکرابوو، هە موولایەنەکانی ئە وی سۆراخکرد تا ئە ودەمانەی کە کیژەکەی ناسیووە. کیژەکە نبیلی بە پیاوێکی خاوەنکاری دەوڵەمەندی ئوسترالی دەناسێنێت، کە کۆمپانیایەکی گەورەی باری ئاسمانی بۆ هە موو کیشوەرەکان هەبوو، موژدەی کارکردن لەگەڵ ئەو پیاوە زۆر بە خۆشحالییەوە وەردەگرێت، چونکە ئەو دەبێ کارێک بکات و پارە ی زۆریشی دەوێت، ئە و دە یەوێ کاربکات لە گەڵ کێ بێت گرینگ نییە لەگەڵ جوولەکەیەک بێت، یان لەگەڵ هندۆسێکیش بێت، لای ئەو گرینگ نەبوو. ئەفسەرەکە لەوە تێگەیشت کەوا ئەو گەنجە میسرییە پارەو ملیکەی دۆستی مە بەستە، بۆیە بڕیاریدا دۆسیەی ئەو بخاتە ئەستۆی خۆی، تا دەیکاتە بەکرێگیراوێکی شیاوی مۆسادو هە موو مە رجەکانی جاسووسیە ی تێدا بە رجەستە

دەکات. ئەفسەرەکە لە ناسنامەکەی دەکۆڵێتەوە، لە هەڵوێستی ئەو بەرامبەر ئیسرائیل تێدەگات، باسی لەگەڵ دەکات ستراتیژی عەرەب بەرامبەر ئیسرائیل چییە، مۆساد چۆن کاردەکات و ئەو چۆن پێناسەی کارەکانیان دەکات، ئەوان چەند پارە دەدەنە کەسە بەکرێگیراوەکانیان، چۆن دەیانپارێزن، ئەگەر لە وڵاتانی عەرەبی کارەکانیان ئاشکرابوو، مۆساد چییان بۆ دەکات، بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ تێیدەگەیێنێت کەوا ئەوان فیلم و دەنگی تۆماری ئەویان لەلایە، رەنگە ئەوانەش بۆ کەسانی عەرەب لە وڵاتەکانیان ببێتە جێگەی هەڕەشەی کوشتن و گیران، دیارە کەوا مەترسی موخابەراتی وڵاتە عەرەبییەکان لەسەر هاووڵاتیەکانیان چەندە. !

نبیل زوو لە مەرام و قسەکانی باسکینری ئەفسەری مۆساد تێگەیشتبوو، ئەوەندە دەبەنگ نەبوو، تا نەزانێت، ئەو چی دەوێت و مەبەستی چییە. بەکورتی ئەو وتبووی:

(من کەسێکم هاوسۆزییم لەگەڵ ئیسرائیل هەیە، من مێژووی جوولەکە دەزانم، بۆیە هاوسۆزیان دەکەم).

بە دانیشتن و بەقسەکانی نبیل رێگا دوورەکەی بۆ ئەفسەرەکە کورتکردەوە، یەکەمین هەنگاوی بەرەو خیانەت دەستپیکرد. ئەفسەرەکە کوڕەکە لەگەڵ کیژە جوولەکە دەهێڵێتەوە، دەبووایە لە قۆناخی یەکەمی مەشق و راهێنانەکە ئەو وا بژیت، کیژەکەو پارە زۆرەکەی گیرفانی مەستیکردو عروبە و نەتەوەکەی لە بیر بردەوە، شەوانە کیژەکە خۆشی و مەستی دەدایێ و رۆژانەش باسکینرو هاوڕێیەکانی مەشق و وانەکانی جاسووسیان پێشکەشدەکرد.

یەکەم دەرسیان فێرکرد چۆن بتوانێت بچێتە ناو بابەتە هەستیارەکان، باسکردنی لایەنە قەدەغەکان، نهێنییەکانی دەوڵەت و سوود وەرگرتن لە کۆبوونەوە گشتیەکان، لەئاهەنگەکان چۆن سوودوەرگرێت، کەی و چۆن ئیستغلالی شوێنە رەسمیەکان بکات، دەکرێ کۆپی کۆنووسەکانی رێکخراوی ئەفروئەسیوییەکان پەیدابکات. فێری ئەوەیانکرد کەوا چۆن نووسراوێکی بەرەواژ بخوێنێتەوە، نووسراوێکی بە ردەستی بە رپرسێک بخوێنێتەوە، چەند وێنەو ئەدرێس و زانیارییەکان زوو وەرگرێت و زووش بەبیری بێتەوەو پاشان بیانووسێتەوەو تۆماریان بکات، لەسەرە رێگاکان هەست بە دامەزراوە سەربازییەکان و پێگەکانی پشکنین بکات، بۆ نمونە لە نێوان رێگاکانی نێوان قاهیرەو السویس و سازکردنی راپۆرتێک لە سەر ئەو دیمەنانە، فێریانکرد ئەو راپۆرتانە چۆن بە حبری نهێنی بنووسێتە وەو رەوانەی ئەدرێسێکی تایبەتی ناو پاریسیان بکات، راپۆرتەکانی پێشهات لە رۆماو قوبرس و بروکسل و ئەسیناو رۆما بگەیێنێتە تەلئەبیب.

****

**تەخریب**

**ئەو لەناوەندی ساڵی 1960 دەستی بەکاری جاسووسی کردبوو، ئەو گەڕاوەتەوە سەر کارەکەی خۆی لە رێکخراوەکە، لە پەنای رێکخراوەکەی خۆی چاک دە شاریتەوە، لەوێ کەس گومانی لێ نەدەکرد، لەو شوێنە دەیتوانی راپۆرتی زۆر بگەیێنێتە تەلئەبیب، پارەکەشی بەچەندین شێوەو پێناو لە قاهیرە وەردەگرت. پاش دوو ساڵ بۆ کارێکی زۆر بە پەلەو پێویست بانگی پاریسی دە کەن، لە وێ باسکینر چاوە روانی دە کرد، ئە فسەرێکی تایبە ت کۆرسی راهێنان و مەشقێکی چڕی لەسەر دروستکردنی پروپاگەندەو هەڵبەستنی درۆو گەیاندنی هەواڵی نادروست و ئاژاوەنانەوە لەناو میسر بۆ سازکرد، دەرسی ئەوەیان فێرکرد چۆن شەڕی نەفسی و سایکلۆژی دروست بکات، فێریان کرد، چۆن خە ڵک فێر بکات هە موو لە ئیسرائیل بترسێن، بزانن کە وا سوپاکەی بەهێزەو شکاندنی زەحمەتە.!**

**بە تێپەڕبوونی چەند ساڵێک نبیل بووە یەکێک لە جاسووسە زیندوو و چالاکەکانی ناو میسر، دۆستە مەغریبیەکەی هە ر لە بیرنەما، بە پارە زۆرەکەی کە ئەو رێگای بۆ دانا دۆستی زۆری گرت، ژنی زۆری ناسی . لەدرێژەی بە رنامەکانی مە شق و راهێنانە کانییدا فێربوو چۆن کاری تە قینەوەکان بکات، چۆن دە ستی بچێتە کووشتنی کە سانی بێتاوان و چۆن نامە ی تەقینەوەکان دابنێتە وە، دە ستی پە یداکرد لە ترساندنی زانا ئە ڵمانەکانی ناو میسر تا وڵاتە کە جێبهێڵن و لە میسر دوورکە ونەوە، هاوشانی ئە سپەکە وولف گانگ لوتز هاوکاری ترساندنی ئەڵمانەکان کاریکردووە، بەگیرانی ئەویش نبیل لەکارەکانی نەوەستا، بووە کەسی یەکەمی پیاوانی مۆساد لەهەموو ناوچە کە، ئە و پێش نسکۆکە ی ساڵی 1967 نهێنی زۆری سە ربازی گە یاندە ئیسرائیل، رۆڵی هەبوو لە شکانی عەرەب لە شەڕەکانی ناوچەکە.**

**لە ساڵی 1968 میسر لە بەرامبەر ئازادکردنی چە ند دیلی شە رەکان لوتزی ئازاد دەکەن، بەوەش نبیل هە ست بەشکۆو گەورەیی دەکات، کەوا پشتیوانی هە یەو لەکاتی پێویست بەهانای دەگەن.**

**نبیل بڕوای بەوەکرد ئەگەر بشگیرێت دوارۆژی دابینکراوە، بێگومان ئیسرائیل زوو بە یەکێکی ناو زیندانە کان دەگۆڕنەوەو هە تا لە ژیاندا ماوە لەناو ڤیلایە کی خۆش دە ژیت، پارەی زۆری دەبێت، شاهانە ژین بەڕێدەکات، بۆیەش لە هیچ نەدەگەڕاوەو دەستی دەبردە ناو شوێنە ترسناکەکانیش، ئەو زۆر خەونی بەسەردانی ئیسرائیل دەبینی، ئازادانە لە شارەکانی بسووڕێتەوە هەناسەی پاک هەڵمژێت، بۆیەش بەرنامەیەکی باشی سەردانی ئیسرائیلیان بۆ چەند هەفتەیەک بۆ دانا، ئە و ماوە یەی کە ئەو لە ئەسینا مایە وە، هە موو کارە کانی سە فەرەکەیان بۆ سازکرد، لەناکاو لە ناو هوتێلی بوزایدون دە رچوو، لە فڕۆکەخانە پیاوێکی چاویلکە رەش لە چاو بە پێشی کەوت و بەپاسپۆرتێکی ئیسرائیلییەوە بەناوی (شاوول باریف) سواری کردو بێدەنگ سەرکەوت، بەفڕۆکەیەکی کۆمپانیای العال گە یشتە فڕۆکەخانەی بن گۆریون، لە وێش ئوتومبێلێکی جۆری لیموزینی رە شی بە پەردە چاوەڕوانی دە کرد، لە هەوارێکی نازدار چە ند ئە فسەری ئیسرائیل**

بەگەرمی پێشوازییانکرد . لەنووسینگەی سەرۆکی مۆساد (زیفی زامیر ) کە تازە کارەکەی وەرگرتبوو، لەبەرامبەر خۆی دابنا، لەوێ ئەو پێیووت داوا بکە چیت دەوێت، ئەو داوای دیمانەی گۆلدا مئیری کردبوو، ئەویش بەپێشوازی 25 ئەفسەرەوە پێشوازی لە نبیل کردبوو، گۆلدا ئامیر بەگەرمی لە باوەشی دەگرێت و بەخۆشی و بەشانازییەوە پێیووتبوو:

زۆر بەخێر بێت بۆ وڵاتەکەت ئیسرائیل.!

پاش پێشوازییە گەرمەکە، مائیر فەرمان دەدات، هەرچی نبیل دەخوازێت بۆی دابین بکەن، ئەگەر موستحلیشی ویست بۆی ئاسان بکەن، لەوێ پێیدەڵێن زۆر سوپاس بۆ ئەو دیارییەی پێشکەشی ئیسرائیلت کردووە، ئەویش وەڵامی دەداتەوە:

(من هەرگیز خەونم بەوە نەدەبینی، لەوەی کە ئێستامن تێدام، من هەستدەکەم لەناو کەسوکاری خۆمم، ئەو هەست و شعورمە خاتوونەکەم.!).

بۆیەش سەرۆک وەزیران فەرماندەدات لە نووسینگەکەی خۆیدا 25 هەزار دۆلاری پێببەخشن، بێجگە لەو پارەی مۆساد بۆی داناوە.

کە دەچێتە ڤیلا تایبەتییەکەی کە بۆیان دانابوو، لەوێ ملیکەی کۆنە دۆستی دەدۆزێتەوە، ئەوەی جاری یەکەم دەستەمۆی کردبوو، لەوێ بەنازەوە پێیدەڵێت زۆر سوپاس بۆ ئەو خزمەتەی بە ئیسرائیلت گەیاند، دەستت خۆش، تەنها بۆ ئەوەش هاتبووم تا سوپاسگوزارت بکەم. کە لە فڕۆکەخانەی ئەسیناش بەڕێکرابوو، کۆنە ئەفسەرەکەی پاریسیش بۆ هەمان مەبەست ئامادەببوو. نبیل لەو سەفەرەدا 16 رۆژ لە ناو ئیسرائیل و لە جوانیەکانی ئەو وڵاتە ژیا، وەک میوانێکی قەدرگران راگیرا، بە هەزارەها دۆلارەوە گەیشتەوە ئەسینا، بەوەش زۆرتر لەسەر کارە جاسووسیەکەی گەرمتربوو، بۆ کۆکردنەوەی زانیارییش بەجۆشترو لێهاتووتربوو.

****

کۆتایی

نبیل لەهەموو کەناڵەکان کەوتە کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر پرۆژە چەکسازییەکانی میسر، لیستی ئەو چەکانەی دۆزیەوە، کە میسر لە یەکێتی سۆڤیەتی وەرگرتووە، وڵاتانی ئەورووپای خۆرهەڵات چەندیان چەکیان داوەتەوە میسر، هەموو ئەوانەی دەکردە راپۆرت و رەوانەی ئیسرائیلی دەکرد، زۆربەی ئەو زانیارییانەی بە کیژە سۆزانیەکان پەیدا دەکرد، کە رەوانەی لای گەورە ئەفسەرانی سوپای میسری دەکردن، ئەوانیش لە حاڵەتە وەنەوەشییەکان و مەستبوونیان بەهەرزانی ئەو زانیاریانە ترسناکانەیان بۆیان هەڵدەڕشت.

پەیوەندی ئەو بەمۆسادەوە بەهۆی بۆکسی پۆستێک بوو لە جنێف، لەوێش دەگەیشتە نووسینگەی مۆساد لەو شارە. ئەو رۆژێکیان نامەیەکی شوفرەداری لە مۆساد پێگەیشت تێدا

داواکاربوون نبيل النحاس زانیاری زۆرو وردیان لە سەر جوولە و چالاکییە کانی بە نداوی ئەسکەندریە بۆ پەیدا بکەن، یەکسەر دەگاتە ئەو بەنداوەو پەیوەندی بە هاوڕێیەکی دەکات کە لە بواری دەریاوانی کارو چالاکی هەبوو، بۆ کۆکردنەوەی ئەو زانیاریانەی کە مۆساد بەپەلە داوایکردوون، بە وەرگرتنی زانیارییەکان پارەیەکی زۆری داوەتە بە هاوڕێیە ئەسکەندەرانییەکەی، ئەو زۆر پەرۆشی زۆرترین زانیاری بوو، بیانوی داواکەی ئەوەبوو، گوایە ئەو زانیاریانە تایبەتە بە دەزگایەکی راگەیاندن و وەکالەتێکی ئاژانسی هەواڵەکان، بەڵام هاوڕێیەکەی ناو بەنداوەکە کە پەرۆشییەکانی ئەو بۆ ئەو زانیاریانە دەبینێت گومانی خیانەت لە هاوڕێیەکەی دەکات، بۆیە زوو موخابەراتی میسری بە وە ئاگاداردەکاتەوە، ئەوانیش لەلایەن خۆیانەوە سۆراخی نبیل دەکەن، بەوردی لە مەسەلە ترسناکەکە دەکۆڵنەوە.

پاش سەرکەوتنی سوپای میسری لە مانگی ئۆکتۆبەر، ئیسرائیل نیگەران دەبێت، ئەفسەرێکی پلەداری مۆساد لە رۆما نبیل دەبینێت، بەتووڕەییەوە گلەیی ئەوەی لێدەکات کەوا ئەو بۆ پەیداکردنی زانیارییەکانی پێش شەڕەکە کەمتەرخەم بووە، ئەویش فاکتەرێکی شکانەکان بووە، بۆیە ئەگەر هەست بکەین تۆ لە چالاکییەکانت لاوازو ساردیت ناچارین دەستبەردارت بین، بەوەیان نبیل زۆر شپرزەدەبێت، بۆیە هەفتەنگاوی لە 14ی نۆڤمبەری ساڵی 1973 بەپەلە دەگەڕێتەوە میسرو بەرنامەشی ئەوەیە بەزۆرترین چالاکی و زانیاری زۆر ترسناک قەرەبووی رۆژانەی رابردووی بکاتەوە، بڕیاردەدات کۆششەکانی چڕترو زۆرتربکات، بۆیە شێتانە دەکەویتەخۆ و پرسیاری زۆرتر دەکرد، زۆرتر دەچێتە گۆشە ترسناکان، لەودەمانەش موخابەراتی میسری وەک سێبەرەکەی بەدواوەی بوون، دەیانویست بەبەڵگەوە بیگرن.

لە 24ی نۆڤمبەری ساڵی 1973 دە رۆژ بوو لە سەفەرەکەی گەڕابووە میسر، موخابەرات میسری هەڵیانکووتاوەتە سەر شوقەکەی لە قاهیرەو بە هەموو کەرەستەکانی جاسووسیەتەوە دەستگیریان کردبوو، بۆیە نەکرا ئەو هیچ ئینکارێک بکات زوو و یەکسەر تەسلیم دەبێت و دان بە خیانەتەکەی دادەنێت، لەبەردەم لێکۆڵینەوەکاندا دەست دەکات بە گریان، ژمارەی لاپەرەی دانپێدانەکانی زۆر گەورەدەبێت و سەدان لاپەرەی بۆ رەش دەکەنەوە، ئەو پاش 13 ساڵ لەکاری جاسووسی وا بەخێرایی و بەئاسانی دەگیرێت، تاوانبارەکە رادەستی دادگای سەربازی دەکرێت، ئەو لەو دەمانەوە چاوەروانی دەکرد لەناکاو مۆساد بە دیلێکی لای خۆیان بیگۆڕنەوە، بەڵام کاروانەکەی بەرەو پەتی سێدارەی بردو ئیسرائیل ئەو خائینەی بەکەس نەگۆڕییەوە.

---

لە رۆژنامەی (الجريدة)ی کوێتی رۆژی 11 09 2008 بڵاوکراوەتەوە.

وەرگێڕ لەچەند دێڕێکدا:

لە 1955 لە شاری دێینی (هەولێر) لەدایکبووم.
ئامۆژگای تەکنەلۆژیای بەغدام تەواوکردووە.
تا لە وڵات دەرچووم فەرمانبەری شارەوانی هەولێر بووم.
لە ساڵی 1998 ەوە لە وڵاتی سوید دەژیم.

چاپکراوەکانم ...

لە یادی سەد ساڵەی شارەوانیدا، 1985 کتێبی (هەولێر)م بەقەبارەی 365 لاپەڕە ئامادەو چاپکرد.
هەر لە شارەوانیدا لەساڵی 1994دا، 12 ژمارەی ڕۆژنامەی(هەولێر)م دەرکرد.
کەلاوە... 1991 ریپۆرتاژ، بۆ ئۆردوگاکانی دەشەری هەولێر.
دیوەخانی فلێن... ڕۆژانەو ریپۆرتاژە، لە 1999 لەرۆژنامەی (ئاڵای ئازادی)ی زەحمەتکێشان لە دە ئەڵقەی دریژ بڵاوکرایەوە.
هەولێر... تا دبلن...... 2000 ریپۆرتاژ، زانکۆی ئازادی بەرلین.
بەغدا... بۆ هەولێر!..... 2000 ریپۆرتاژ، سویدو سلێمانی.
مەملەکەتی فارگۆنەکان.....2001 ریپۆرتاژو بیرەوەری، سلێمانی.
کاکە، ئەبو ئیسماعیل... 2001 ، بیرەوەری سلێمانی.
بەسەرهاتی دەریاوانێکی خنکاو 2001 رۆمانی گابریل مارکیز، لە ژمارە 25ی گۆڤاری (ئایندە)ی دەزگای سەردەم بڵاوکرایەوە، دوایی وەک نامیلکەش بڵاوکرایەوە.
دە ڕۆژەکەی هەولێرم، (11) وتارو ریپۆرتاژبوو لە گۆڤاری (گوڵان)ی هەولێرو ڕۆژنامەی (کورد) لە ئوستراليا بڵاوکرایەوە.
ڕێگای دوورم بۆ ئازادی، نیلسۆن ماندیلا، وەرگێڕان. هەولێر لەدەزگای موکریانی بڵاوکرایەوە.
سارد یان گەرم، (12) ریپۆرتاژبوو، لە رۆژنامەی (هەواڵ)ی سلێمانی لە یولیو 200ی ینایری 2002 بڵاوکرایەوەو وەک نامیلکەش لە کەرکووک بڵاوکرایەوە.
فارگۆنەکان، ریپۆرتاژو بیرەوەرییە لەدەزگای بەدرخان لە هەولێر2005 بڵاوکرایەوە.
مەملەکەتی کەلاوە، وتارو پێناسە ی بیناسازی کوردییە وەک نامیلکە لە وەزارەتی رۆشنبیری لە هەولێر بڵاوکرایەوە.
کۆریا پێناسەو مێژووی کۆریای باشوور، لەخانەی وەرگێڕان لە هەولێر 2007 بڵاوکرایەوە.
هولۆکۆست... کتێبێکە لەسەر قڕکردنی جوولەکە لە ئەوروپا، وەرگێڕان، سەنتەری نما هەولێر 2007.
دوو پرێنسیسی نازداری بێناز، دیاناو ماساکۆ... ئامادەکردن، هەولێر دەزگای ئاراس 2008.
مارتن لۆسەر وەرگێڕان و ئامادە کردن، بەشێکە لەکتێبی ناتوندوتیژی 1 سەنتەری مەسەلە هەولێر 2008.
بەرەو کۆشکی ئالیزی ، شیراک، روایال، سارکۆزی..وەرگێڕان، خانەی وەرگێڕان سلێمانی 2008.
سێکس و پۆلیتیک، دیوێکە لە ژیانی دبلۆماتی فەرەنسای نوێ...وەرگێڕان، دەزگای سەردەم 2008
تەها حوسین، نابینایەکی بینا، وەرگێڕان و ئامادەکردن.. دۆسیەیەک لە گۆڤاری نما 2008
955 دەقە لەگەڵ شێرکۆ بێکەس دیمانە دەزگای نما 2008
دۆلار لە ئەمریکا، دوو بابەتی ئابوورییە....وەرگێڕان، دەزگای ئاراس 2008
مەجبوور، بیرەوەری... بەڕێوەبەرایەتی چاپ و بڵاوکراوەی سلێمانی2008

من ڕۆژنامەنووسم، جاسووس نیم! وەرگێڕان... خانەی وەرگێڕان سلێمانی 2009

ئامادەی چاپە :

هەتان... چەند وتارێکە لەسەر بیناسازی کوردەواری، لە ساڵی 1988 ەوە ئامادەیە.

دیدار، چەند دیمانەیەکە لەگەڵ نووسەرانی گەورەی جیهان، ئامادەکردنی سوید 2001_2007

تریێنە خێراکەی خۆرهەڵات، لە ڤییەناوە بۆ ئیستنبۆل ....وەرگێڕان، سوید 2007.

کاکە ئەبو خەلیل ... بیرەوەری .. سوید 2008

دوو شاری شاعیرێک، دوو باسە لەسەر محمود دەروێش وەرگێڕان 2008

بەهەشتی زیندان... وتارو ریپۆرتاژە لە 1996ەوەو بەبەردەوامی دەنووسم، ئێستاش گۆشەی (بریڤ) لە چەندین گۆڤارو ڕۆژنامەو ماڵپەڕەکانا لەوڵات و دەرەوەی وڵات بڵاودەکەمەوە.